وَاذكُر رَّبَّكَ فِي نَفسِكَ تَضَرُّعًا وَخِيفَةً وَدُونَ ٱلجَهرِ مِنَ ٱلقَولِ بِٱلغُدُوِّ وَٱلأٓصَالِ وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلغَٰفِلِينَ ﴿٢٠٥﴾





# لەخوا غافڵ مەبە






فاتیح مەلا ڕەسوڵ شارستێنی

بەرگی یەکەم







ناوی کتێب:     لە خوا غافڵ مەبە –بەرگی یەکەم–

نوسینی :   فاتیح مەلا رەسول شارستێنی

نەخشاندنی نوسین و سەرپەرشتی:   مەریوان ئەحمەد

نەخشاندنی بەرگ:  قەیدار

تایپ کردن:   ئیحسان ئەحمەد

نۆبەی چاپ:   یەکەم، ٢٠١٥

لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان

ژمارە (١٣٩٢) ساڵی (٢٠١٥)ی پێدراوە.



## پێشكەشە بە:

- پێغەمبەری سەرووەرم ﷺ، ئەو كەسەی كەخوا كردی بە ڕەحمەت، بۆ هەموو عالەم و لابەری هەموو زەحمەتێك.
- باوك و دایكی خۆشەویستم.
- هەموو مامۆستاكانم.
- هاوسەر و هاوژینم (سێوە خان) كەهەمیشە هاوكارم بوە.
- جگەر گۆشەكانم: (محمد و ئیبراهیم و ئاسودە و ئەڤین) خوای گەورە قبوڵیان بفەرموێت بە خزمەتكاری ڕێبازەكەی پێغەمبەری خواﷺ، و لە كێشە و گرفت لەگەڵ ڕۆڵەی مسوڵمانان بیان پارێزێت.. ئامین..

## پێڕستی بابەتەکان

# پێشەکی

سوپاس و ستایش بۆخوای پەروەردگار، درودو سڵاوەت لەسەر پێغەمبەری پێشەواو سەردار محمد ﷺ..

بەڕێزان: ئەم کتێبەی لەبەر دەست و دیدەتان دایە، بریتیبوو لەزنجیرە باسێکی شەوانی ڕەمەزان کە دوای نوێژی تەراویح پێشکەش دەکرا، هەرچەندە شەوگار کورت بوو کات کەم بوو، مسوڵمانان ماندو هیلاك بوون.. بەڵام ماوەیەك دەماینەوە و ئەم باسەمان پێشکەش دەکرد. سوپاس بۆ خوا تۆمار کرا و بە (cd) بڵاو کرایەوە و ناونیشانی (لە خوا غافڵ مەبە)ی بۆ دانرا..

پاش ماوەیەك لەشاری هەولێری خۆشەویستەوە دوو برای ئازیز: مامۆستا یوسف صابر و کاکە کاروان، هاتن و فەرمویان کەتەواوی وتارەکانمان لەسەر (cd)یەوە نەقڵ کردوە بۆسەر کاغەز و تایپمان کردوە و پێداچونەوەی خۆتی دەوێ ئەوساش ئێستاش زۆر دوعای خێرم بۆ کردن.. بەڵام کاتێك خوێندمەوە بینیم هەڵەی تایپی زۆرە و چاك کردنی زۆری دەوێ.. وە پاشان ئەم ووتارانە لەکاتێکی کەمدا پێشکەش کراون و گوشراون..بیرم کردەوە کە ئەگەر سەرلەنوێ خۆم بەزمانی نوسین بینوسمەوە و لەئاستی خۆیدا سەرچاوەکان دیاری بکەم و تەواوی ئەو بابەتەی کاتی خۆی ئامادەم کردوە، کات و دەرفەتی پێشکەش کردنی نەداوە..

بینوسمەوەرەنگە باشتر بێ و بەسودتر بێت، بۆیە ناوی خوام لێ هێنا و وەکو تەواو کردنی کارە بەنرخەکەی مامۆستا یوسف و مامۆستا کاروان، هەمویم نوسیەوە و ئەم بەرهەمەی لێدەرچو. (إنشاءالله) لە دووبەرگدا پێشکەشتان دەکرێت. سوپاس بۆ خوای گەورە لەسەرەتا و لەکۆتایی و لەهەمو کاتێك و زەمان و زەمینێکدا.. ئێوەش لەدوعای خێر بێبەشمان مەکەن..

فاتیح شارستێنی

٢٠١٥ پیرەمەگرون

## وانەی یەکەم:

## بابەت: هۆکارەکانی زیادبونی رزق و رۆزی

❁ قالَ اللهُ سُبحانَهُ وتَعالى: ﴿فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِي ٱلْأَرْضِ وَٱبْتَغُواْ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ.. ﴿١٠﴾﴾ الجمعة.

❁ وقالَ اللهُ تَعالى: ﴿هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ ذَلُولاً فَٱمْشُواْ فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُواْ مِن رِّزْقِهِۦ ۖ وَإِلَيْهِ ٱلنُّشُورُ ﴿١٥﴾﴾ الملك.

❁ قالَ اللهُ تَعالى: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَمْلِكُونَ لَكُمْ رِزْقًا فَٱبْتَغُواْ عِندَ ٱللَّهِ ٱلرِّزْقَ وَٱعْبُدُوهُ وَٱشْكُرُواْ لَهُۥٓ ۖ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿١٧﴾﴾ العنكبوت.

❁ وقالَ اللهُ تَعالى: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلْقُوَّةِ ٱلْمَتِينُ ﴿٥٨﴾﴾ الذاريات.

❁ قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (اليَدُ العُليا خَيْرٌ مِنَ اليَدِ السُّفلَى، وَابْدَأْ بِمَنْ تَحُولُ، وَ خَيْرُ الصَّدَقَةِ ماكانَ عَنْ ظَهْرِ غِنَيٍّ، وَمَنْ يَستَعِفَّ يُعِفُّهُ اللهُ، وَمَن يَستَغْنِ يُغْنِهِ اللهُ) رواهُ البخاري ومُسلِم.

❁ قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (هَلْ تُنْصَرُونَ وَتُرزَقُونَ إلّا بِضُعَفائِكُمْ) رواه البُخاريُّ.

۞ وقالَ رَسُول اللهِﷺ: (لَوْ تَوَكَّلْتُم عَلى اللهِ حَقَّ تَوكُّلِهِ، لَرَزَقَكُمْ كَما يَرزُقُ الطَّيرَ، تَغْدُوا خِماصاً وَتَروُحُ بِطاناً) حَديث صَحيح، رَواهُ احمد(١/٣٠) و الترمذي: (٢٤٤٧).

۞ قالَ رَسُولُ اللهِﷺ:( مَنْ سَرَّهُ أَنْ يُبسَطَ لَهُ فِي رِزْقِهِ، وَأَن يُنسأَ لَهُ فِي أَثَرِهِ فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ) رَواهُ البُخاريُّ:(٥٩٨٦).

۞ عَنْ أَنَس بنِ مالِك: (كانَ أَخَوانِ عَلى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺفَكانَ أَحَدُهُما يَأتي النَبِيَّﷺ وَالآخَرُ يَحْتَرِف، فَشَكا المُحْتَرِف أَخاهُ إِلى النَبِيِّﷺ، فَقالَ: لَعَلَّكَ تُرزَقُ بِهِ) صَحيح سُنَنْ الترمذي:٢/٢٧٤.



## سەرچاوەکان:

١- مَوسُوعَة الأخلاق الإِسلامِيَّة، سَعْد يوسف أبو عزيز،ج٢،ص٥٠.

٢- مِفتاحُ الرِّزق فِي ضَوءِ الكِتابِ و السُنَّة، د. فضل إلهي، ص٣١و٤٧و٢٣و٦٨.

٣- لە ڕوانگەی پەیامەکانی نورەوە، (رزق و رۆزی) حبیب محمد سعید، ل ٤٣و٦٥.

٤- زەردەخەنەی هیوا، ئەندازیار عوسمان، ل ٩٨و ٥٢ و ٢٨.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحَمدُ للهِ ربِّ العالَمين، والصَّلاةُ والسَّلام عَلى سَيِّدنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلِهِ وَ صَحبِهِ أجْمَعين..

ئیمانداران و خواناسانی زۆر بەڕێز: لە خزمەتتانداین بۆ پێشكەشكردنی زنجیرە باسێكی ئیمانی (بە ویستی خوا) بەئاگاهێنەرەوە و داچڵەكێنەر لە خەوی غەفڵەت، زنجیرە باسەكەشمان بەناو نیشانی (لەخوا غافڵ مەبە). كەهەر جارەی لە بابەتێكدا قسەو باس دەكەین سەرەنجام پەیوەندیمان لەگەڵ پەروەردگارمان بەهێزتر دەكەین و داوای كۆمەك و یارمەتی هەر لەو دەكەین هەروەكو لە نوێژەكانماندا بەڵێنمان داوە كە: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ۝﴾الفاتحه. لەیەكەم وانەی ئەم زنجیرەیەشماندا باسی (ڕزق و ڕۆزی) دەكەین (إنشاء الله).

بەڕێزان: هەریەك لەئێمە بێگومان پێداویستی ژیانی هەیە، بێگومان گەڕان بەدوای ئەوپێداویستیانەی ژیانی خۆمان وە ماڵ خێزان و منداڵمان، پێویستی بە گەڕان هەوڵ و تێكۆشان وكار وكەسابەت هەیە، كەلەئاینی پاكی ئیسلامدا ئەم كار وكەسابەت و گەڕانە بەدوای ڕزق و ڕۆزیدا نە هەر زەم كراو خراپ نیە بەڵكوزۆر ڕێز لێ گیراوەئەوەتا خوای گەورە لەگەڵ نوێژی گەورە و گرنگ و پڕ بەرەكەتی هەینی (الجمعه)دا باسی گەڕان بەدوای بژێوی ژیانی

کردوە و فەرمویەتی: گەڕان و سوڕان بەدوای رزقی حەڵاڵ و دابین کردنی پێداویستی ژیان، گەڕان بەدوای فەزڵ و کەرەمی خوای پەروەردگاردا. تەماشاکەن قورئان دەفەرموێت:﴿فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَٱبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ.. ﴿١٠﴾﴾ الجمعة.

بەڵێ گەڕان بەدوای رزق و رۆزیدا شتێکی زۆر پیرۆزە، بەڵام بابەتەکەی ئێمە لەسەر ئەوەیە کەلەکاتی گەڕان بەدوایرزق و رۆزیدا لەخوا غافڵ نەبی، وابزانی ئەم دەستکەوتنی پارەیە، ئەم هێنانەوەی رزق و رۆزیە بۆ ماڵ و منداڵت هی ئازایەتی و پاڵەوانیەتی خۆتە، هی زیرەکی و لێزانی و کەسابەتکاری عیلم و زانستی خۆتە، پەنا بەخوا ئەگەر ئەمەت لەدڵ و دەرون دا بۆدروست بوو، ئەوە بەڕاستی ئەمەیان هەڵەو خەتەرێکی گەورەیە بۆسەر دین و بیروباوەڕت، وەدواڕۆژی دنیا و قیامەتت..

بەڵکو دەبێ لەخوا غافڵ نەبی و هەموو بەفەزڵ و کەرەمی خوا بزانی، یاخود کەسانێك داوای نوشتەی رزق و رۆزی دەکەن، زانایان پێیان دەڵێن:رزق و رۆزی بەنوشتەنوسین و هەڵواسین لەماڵدا زیاد ناکات. بەڵکو بەپشت بەستن بەخوا و جێبەجێ کردنی ئەو خاڵانە زیاد دەکات کە خواو پێغەمبەرەکەیﷺ لە قورئان وسونەتدا، بۆ ئێمەی مسوڵمانیان دیاری کردوە،ئەوانە جێبەجێ بکەو دڵنیابەو بە یەقینەوە چاوەڕێ بکە، دەرگای رزق و رۆزیت بۆ دەکرێتەوە خوای

گەورە یارمەتیدەر و پشتیوانی هەموو لایەکمان بێ و رزق و ڕۆزیمان فراوان بکات و موحتاجی دەستی نامەردمان نەکات..



**ئەو هۆکارانەی دەبنە مایەی زیاد بونی ڕزق و ڕۆزی:**

## خاڵی یەکەم: لەغەیری خوا مەپاڕێوە:

مەکڕوزێوە لەلایی خەڵکی، شەکوای نەداری و نەبونی خۆت مەکە. مەڵێ وادەمرین لەبرسان هەرچی دەیکەین سودی لێ نابینین و بەشمان ناکات. شکوای حاڵی خۆت، گوزەرانی خۆت لای کەس مەکە چونکە خۆکەس هیچت ناداتێ، ئەگەر بیشتداتێ مانای وایە تۆ سواڵت کردوە، کەلەئیسلامدا نەهی لێکراوە، بەڵکو لەجیاتی ئەوە وەرە داوا لەخوابکە، لەنیوەی شەواندا لەدوای نوێژەکانت دەست بەرز بکەوە بۆلای خواو بڵێ: یا رزّاق، ئەی رۆزی دەری ڕاستەقینەی هەموان ئەی ئەو پەروەردگارەی رزق و ڕۆزی هەموو کەس هەربەدەستی تۆیە، بەژمارەی حیساب نەکراو مەخلوقات رزق و ڕۆزی تۆ دەخۆن.. یاألله دەرگای رزق و ڕۆزیم لێ بکەیتەوە، ئەوە دڵنیابە خوای گەورە بە هانەتەوە دێت و دەرگای ڕزق و ڕۆزیت لێدەکاتەوە.

ئەمەش وەعد و بەڵێنی خۆشەویستمان تاجی سەرمان (محمد المصطفی)یەﷺ، کەبەڵێنی داوە هەر مسوڵمانێك نەکڕوزێتەوە و شکوای حاڵی خۆی لای هەموو کەس نەکا، لەلای خەڵکێ کەڕەحمی پێ ناکات. بەڵکو تەنیا لەخوا بپاڕێتەوە، ئەوا ئەو خوایەی کەلەهەموو بەڕەحمێك بەڕەحم وبەزەیی ترە، بۆخۆی ڕحمی پێدەکات. ئەمەش دەقی فەرموودەکەی پێغەمبەرە ﷺ:

(الْيَدُ العُليا خَيْرٌ مِنَ اليَدِ السُّفلَى، وَابْدَأْ بِمَنْ تَحُولُ، وَ خَيْرُ الصَّدَقَةِ ماكانَ عَنْ ظَهْرِ غِنَيٍّ، وَمَنْ يَستَعِفَّ يُعِفُّهُ اللهُ، وَمَن يَستَغْنِ يُغْنِهِ اللهُ) رَواهُ البخاري ومُسلِم.

بەڵێ بەڵێنی خۆشەویستمانەﷺ: (وَمَن يَستَغْنِ يُغْنِهِ اللهُ).

## خاڵی دووەم: بجوڵێ بەسەر زەویدا:

بگەڕێ بەدوای رزق و ڕۆزیەکەتدا کە خوای گەورە بۆی دیاری کردوی لەشوێنی دیاری کراودا، چاوەڕێی تۆیە بچی وەری بگری. بەڵام تۆ ئەگەر هەرلەماڵەوە دانیشی رزقەکە نایەتە ژورەوە بۆت.. سوننەتی خوا وانیە لەکەوندا، کەرزق لەئاسمانەوە بباریتە ناو لەپی دەستی تۆو گیرفان و قاسە و کاسەی تۆوە بەبێ هەوڵ و تێکۆشان، خوای گەورە لە قورئاندا فەرموویەتی:

﴿هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ ذَلُولاً فَٱمۡشُواْ فِى مَنَاكِبِهَا وَكُلُواْ مِن رِّزۡقِهِۦۖ وَإِلَيۡهِ ٱلنُّشُورُ ﴿١٥﴾﴾الملك.

ئیمانداران: سەیری قورئان بکەن چەندە وردە لە دەربڕیندا. هەمووی ـ بێ لێکچواندن ـ وەکو هاوکێشەی کیمیایی وایە. ئەمیان هاتە جێ، ئەولاش دروست دەبێ. ئەوەتا دەفەرمووێ: ﴿فَٱمۡشُواْ فِى مَنَاكِبِهَا﴾ بگەڕێ بەسەرزەویدا. شیوەکان، دۆڵەکان، شاخەکان، ناوبازاڕەکان، ناو کێڵگە کشتوکاڵیەکان، ژێر زەوی بگەڕێن بەدوای ڕزق و ڕۆزیدا، هەر کەسەی خوای گەورە ڕزقەکەی بۆ لە شوێنێك دیاری کردووە. تۆی مرۆڤ بگەڕێ بە شوێنیدا و بۆی بچۆ.

ئەمجا ﴿وَكُلُواْ مِن رِّزۡقِهِۦ﴾ لە ڕزق و ڕۆزی بخۆ.. کەواتە: تاوەکو تۆ نەگەڕێی ڕزقیش ناخۆی. دەی نابێ خۆت بخەڵەتێنی و بڵێی: دەبێ ڕزقەکە بۆخۆی بێتە ناو گیرفانمەوە، نەخێر.. مادام خوای گەورە توانای جوڵە و ڕۆشتنی پێبەخشیوی، فەلەج و کەوتەی ناو جێگای نەکردووی. پێویستە فەرمانی خوا جێبەجێ بکەی و بگەڕێی بەشوێن ئەو جێگایەدا کە ڕزقەکەی تۆی لێ دیاری کراوە. ئەو کاتە دڵنیابە بە دەستی پڕ دەگەڕێیتەوە.

## خاڵی سێهەم: تەوەكول و پشت بەستنت لەسەر خوای پەروەدگار بێ:

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **(لَوْ تَوَكَّلْتُم عَلى اللهِ حَقَّ تَوَكُّلِه، لَرَزَقَكُمْ كَما يَرزُقُ الطَّيرَ، تَغْدُوا خِماصاً وَتَرُوحُ بِطاناً)** حَديث صَحيح، رَواهُ احمد (١/٣٠) والترمذي:(٢٤٤٧).

ئەگەر پشت و پەنای خۆتان ببەستن بە خوای پەروەردگارتانەوە، بە حەقی تەوەكول لەسەر خوا.

**ڕونكردنەوەیەكی پێویست:** دووشتمان هەیە: تەوەكول لەسەر خوا، لەگەڵ تەواكول لەسەر خوا. تەوەكول و پشت بەستی ڕاستەقینە لەسەر خوا ئەوەیە كە بە شوێن هۆكارەكان (أسباب)دا بگەڕێی، هەوڵی خۆت بدەیت، بەڵام: (تواكول) ئەوەیە: لە ماڵەوە دابنیشی چاوەڕێی ئەوە بكەی خەڵكی نانت بۆ بێنن.. بەڵێ تەوەكولی ڕاستەقینە لەسەر خوا ئەوەیە: تۆ تەواوی هەوڵی خۆت بخەیتە كار، هەموو ڕێگا زانیستیەكان بگریتە بەر، ئەمجا پشتیوانیش لەخوا داوابكەی چونكە دڵنیای كەبێ وویست و پشتیوانی خوا، هەوڵدانی تۆ بێ ئاكامە!

هەروەكو لە فەرموودەیەكی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە كە بە كەسێكی فەرموو: **(إعْقلها وَ تَوَكَّل)**. ولاّخی سوایەكەت ببەستەوە لە شوێنێكی ئەمیندا، ئەمجا پشت بەخوا ببەستە. چونكە ئەگەر

وانەکەی یان گورگ دەیخوات، یان دز دەیدزیّ، خوای گەورە عەقلّ و ژیری پێبەخشیوی، بەکای بهێنە، ئوتومبێلەکەت لە شوێنی گونجاودا ڕابگرە، برێك ڕاکێشە، بالە بۆش نەبیّ، شتیّ بخەرە ژێر تایەکەی ئەگەر شوێنەکەی زۆر سەرەولێژبوو، دەرگاکان دابخە. مەرجی توند و تۆڵی ئوتومبێلەکەت جێبەجیّ بکە. ئەمجا پشت بە خوا ببەستە دڵنیابە خوای گەورەش هاوکار و پارێزگارت دەبیّ! بەلاّم ئەگەر ئوتومبێلەکەت بیّ برێك و گێرێك بەرەلاّ بکەی و بڵێی: پشت بەخوا هیچ نابیّ، ئەوە خۆت دەخەڵەتێنی. ئەوە (تواکولە) نەك (تەوەکول لەسەر خوا).

بەڵیّ بەرێزان: پێغەمبەر ﷺ نمونەیەکی بەرچاوی بۆ باسکردین و فەرمووی: وورد ببنەوە. بەیانیان زوو، لەگەلّ تاریك و ڕووندا، ئەم هەموو باڵندەیە، هەمووی بە سکی خالّی لە هێلانەکەی دەڕواتە دەرەوە..

**(خِماصاً)** یانی: زۆر برسیە، لە ئێوارەوە هیچی نەخواردووە، چیکڵدانەی وشك بووە. لە شەقەی بالّ دەدا و پشت بە خوای خالیقی دەبەستیّ و دەفڕیّ بە ئاسماندا و، دەگەڕیّ تا ئەو شوێنە دەدۆزێتەوە کە خوای گەورە ڕزقەکەی بۆ داناوە. تێر دەخوات و ئێوارە بە سکی پڕ و تێرەوە دەگەڕێتەوە..

(بِطاناً) واتە: چیکڵدانەی شۆڕبۆتەوە و ورگی کردووە لە تێریدا. هەمووی بە تێری دەگەڕێتەوە. خوای گەورە ـ الرَّزاق ـ ە، ئەگەر دەرگایەکیشی لێگرت. دەرگایەکی تری لێدەکاتەوە.

**بەسەرهاتێك:**

مامۆستا مەلا محمدی جەلیزادە، ناسراو بە (مەلای گەورەی کۆیە) لە تەفسیرەکەیدا (تەفسیری کوردی کەلامی خوداوەندی) لە بەرگی نۆیەم، لاپەڕە: (٤١٢)دا، دەفەرمووێ:

لە پیروبەتەمەنەکانم بیستووە، ساڵێکیان باران نەباری، زێی کۆیە ووشك بوو، مەگەر هەندێ شوێنی زۆر قوڵ، لەناو گۆمدا هەندێ ئاوی کەمی تیا مابێ، ئەینا ئەو زێیەی کۆیە ووشك بوو، چۆڕێ ئاوی پێدا نەدەهات..

لە (حەماغای گەورە)م بیست، وتی: ئەو ساڵە قالۆچە ئەوەندە زۆر بوو، لە لای زێوە دەهات. بەو دەشتە وەردەبوو، مەڕ و بزن دەیان خوارد پێی قەڵەو و بەشیر دەبوون، بەڵام شیرەکەیان مەیلە و سور ڕەنگ بوو! !

بەڵێ تۆی مرۆڤیش بگەڕێ بە دوای ڕزق و ڕۆزیەکەتدا، هەروەکو باڵندەکە نائومێد مەبە، لە خوا غافڵ مەبە و پشت بە خوا ببەستە. خوای گەورە ڕزق و ڕۆزی تۆش ئاوا دەدات.

## لەلایەکی نادیارەوە.. پارەی دەستکەوت.. بەسەرهات

بانگخواز (عمرو خالد) دەڵێت: جارێك سواری تەکسی بووم، شۆفێرەکەی پیاوێکی بە تەمەن بوو، لێم پرسی لەکەیەکەوە شۆفێری دەکەیت؟!

وتی: لە ساڵی (١٩٤٨)ەوە. وتم: حەزئەکەم بەسەرهاتێکی خۆتم بۆ بگێڕیتەوە کە کاری تێکردبێت..

وتی: ڕۆژێکیان نەخۆش بووم، زۆر نەخۆش و ناساغ و ماندوو بووم لە ماڵەوە کەوتبوم.. هیچ لە ماڵماندا نەبوو، دوو سێ ڕۆژ بەو حاڵە ماینەوە، ژنەکەم ماڵە دراوسێکان گەڕا بەڵکو (٢٠) جونەیهێك قەرز بکات. کەس نەبوو قەرزی بداتێ..

- هەتا لێت نەقەومێ و موحتاج نەبی نازانی نرخی پارەیەکی کەم چەندە، کەکەس بە قەرز ناداتێ، زانایەك دەفەرمووێ: ئەگەر دەتەوێ نرخی دینارێك بزانی. ئەوا بڕۆ داوای دینارێك قەرز لە کەسێك بکە، بزانە چەند قورسە-!

بەڵێ کە بە قەرز هیچمان دەستنەکەوت، دەست لە دەست و قوەت لە خوا وتم: ئەڕۆم ئیشێکم هەیە، ژنەکەم سوێندی دام و تکای لێکردم کە لەبەر ناساغیەکەم کاری وانەکەم، بەڵام هەرچۆنێك بێ ڕۆشتم. چی گەڕام کەس دەستی لێ ڕانەگرتم. تا خەریك بوو بێ هیوابم.. تاکسیەکی بیجۆ دەستی لێ ڕاگرتم و وتی: برام ئەم نەفەرە میوانە و بیگەیەنە فڕۆکەخانە من ئوتومبێلەکەم لەکار

کەوتووە. کە سەرکەوت و کەوتینە قسە، دەرکەوت کارێکی هەیە لە بنکەی گواستنەوەی کەل و پەل..

وتم: من خزم و ناسیاوم هەیە لەوێ، حەزدەکەیت دەتبەم باکارەکەت بۆ ئاسان بکەن. زۆری پێخۆش بوو، کە بردم لە جیاتی (١٥٠٠) جونەیە، تەنها (٥٠٠) جونەیهیان لەبەر من لێسەند، کە گەڕاینەوە و گەیاندمە فرۆکەخانە، وتی: ئەوە (٢٠٠) جونەیە حەقی ئەو کارەی بۆت کردم. باشە کەم نیە؟!

منیش وتم: من لەکەیەوە وێڵم بە دوای (٢٠) جونەیهدا و خوا دەقاتی ئەوەی نارد، زۆرباشە و ماڵت ئاوابێ. وتی: دەکەواتە مادام وا حاڵت خراپە ئەوە (١٠٠٠) جونەیهی تر. کەوەرم گرت وتم: یارەبی چ ڕۆزی دەرێکی، هەرتۆ پەنای بێ پەنایانی، هەر تۆی بەڕاستی ڕۆزیدەر و فریاد ڕەسی ﴿وَفِي ٱلسَّمَآءِ رِزۡقُكُمۡ وَمَا تُوعَدُونَ ﴿٢٢﴾ فَوَرَبِّ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ إِنَّهُۥ لَحَقّٞ مِّثۡلَ مَآ أَنَّكُمۡ تَنطِقُونَ ﴿٢٣﴾﴾ الذاريات.

واتە: دڵنیاش بن کە سەرچاوەی ڕزق و ڕۆزیتان لە ئاسماندایە (ئێمە لێرە لە بڵندیەوە بەشی هەر یەکێکمان دیاری کردووە، جاری واهەیە هەوڵەکان ناکام دەبن، ڕەنجت بە خەسار دەچێت. جاری واش هەیە دێتە بەر، جاری واهەیە بە بێ چاوەڕێ و بەتەمابوون، دەوڵەمەند و بەهرەمەند دەبیت) هەروەها ئەو بەڵێنانەش کە پێتان دراوە لێرەوە بڕیاری لەسەر دراوە.. سوێند بە پەروەردگار و

بەدیهێنەری ئاسمان و زەوی، ئەو بەڵێن و وادانە، هەرهەمووی ڕاست و دروستن هەروەکو ئێوە چۆن قسە دەکەن و ئاخاوتن دەکەن.. خوایە گیان داوای لێبوردنت لێدەکەین، باشە زاتی شکۆمەندی تۆ، کێ ناچاری کردی سوێندی بۆ بخۆیت تا بڕوات پێبکەن!! ( تەفسیری ڕۆشن، بورهان محمد أمین)

بەڵێ ئیمانداری بەڕێز: تۆش بجولێ، هەوڵبدە و پشت بە خوا ببەستە و تەوەکولی ڕاستەقینت لەسەر خوا بێ. دڵنیابە بە دەستی خاڵی لەماڵ دەچیتە دەر، بەدەستی پڕ دێیتەوە ماڵ..



## سەرنـج بدە و بیربکەوە و دەرس و ئامۆژگاری وەربگرە

ئەی مرۆڤ سەیر دەورووبەرت بکە.. دار و درەخت و گوڵەکان، ڕووەکەکان ببینە، قاچیان نیی پێی برۆن، هیچی ناڕوا و لە شوێنی خۆی ناجولێ، بەڵام ئەم دروستکراوە ڕەنگین و جوانەی خوای گەورە، تەوەکولی ڕاستەقینەی لەسەر خوا هەیە، سەرنجی بدە و لێی ڕابمێنە.. تەماشا دەکەی هەموو گەڵاکانی بەرەو ئاسمان بەرزبوونەتەوە وەکو لەپی دەستی مرۆڤێکی دوعاکار و پاڕاوە لەخوا، ئەویش لە خوا دەپاڕێتەوە.

ئایا گەڵای شۆڕبۆوەتان بۆ سەر زەوی دیوە؟ ئەگەر بینیوتە، ئەوە نیشانەی فەوتان و لەناوچونیەتی، کە ئاوای لێهات یانی مرد..

بەڵێ درەختەکان، ڕووەکەکان، گوڵەکان لەخوا دەپاڕێنەوە و تەوەکولی ڕاستەقینەیان لەسەر خوایە کە ڕزقیان دەدات. دەی سەرنج بدەن خوای گەورە چۆن ڕزقیان دەدات..

هەموو ماددەکان لەخاکەوە بۆ ڕووەك دەڕۆن، ئاوی بۆ دەچێ، جوتیار و باخەوان، نیوەشەو لە خەو هەڵدەستێ بۆ ئەوەی بە فێنکی باخەکەی ئاوبدات.. نەمامەکەی تێراو بکات. چەندی پێخۆشە کە خۆی تینوی بێ و ئاوبخواتەوە، ئاوا دڵخۆشە کاتێ ڕووەك و گوڵەکانی ئاودەدات!

ئەمە خوای گەورە ئەو جوتیارەی ئاوا لێکردووە بۆ ئەو ڕووەکە! ئەمجا خوای گەورە تیشکی خۆری بۆ دەنێرێ، (ڕۆشنە پێکهاتن) ڕوودەدات و ڕۆزی خۆی وەردەگرێ و گەشە دەکات و گەورە دەبێ و ژیانی بەردەوامە.. بەم شێوەیە ڕووەك کە توانای جوڵەی نیە، ڕزق و ڕۆزی بۆی دەچێتە بەردەمی..

لەبەرامبەر ڕووەکدا، گیاندارمان هەیە، ئاژەڵ و زیندەوەرانی ترمان هەیە.. گیانداران چونکە توانای جوڵانیان هەیە، ڕزق و ڕۆزی ئەوان دەستکەوتنی گرانترە، گیانداران دەبێ ماوەیەکی زۆر بگەڕێن تاوەکو تێر دەبن. بەڵام ئەوانیش نائومێد نابن و بە برسیەتی دەڕۆن و بە تێری دێنەوە! ئەمجا زیاتر سەرنج بدەن و ووردببنەوە، لەناو گیاندارانیشدا ئەوانەی بەسەزمانن، فەقیر حاڵن، خوای گەورە ڕزقی ئەوان ئاسانتر دەخاتە دەستیان..

دوعاو نزای دانایەك بۆ ڕزق و ڕۆزی: زانایەکی سوری کە دەپاڕایەوە بۆ ڕزق و ڕۆزی دەیگوت: خوایە ڕۆزیمان بدەرێ هەروەکو چۆن ڕۆزی بێچوی قەلەڕەش دەدەیت!!

ئەگەر بپرسین: ئایا بەچکەی قەلەڕەش چۆن ڕزقی ئەدرێ لەلایەن خوای بالآدەستەوە؟! کاتێ قەلەڕەش بەچکەی دەبێ، بەچکەکان هێشا توکی ڕەشیان لێ نەهاتووە، سپی و سۆڵە، دایك و باوکەکەی قیزی لێدەکەنەوە، ئەوان حەزیان لە ڕەشیە، ڕقیان لەو سپیەیە، بۆیە وازی لێدێنن و خواردنی بەدەمەوە ناکەن!!

جیاواز لە هەموو باڵندەیەك قەلەڕەش سۆز و بەزەیی بۆ بەچکە تازە لە دایك بووەکەی نیە، ئەم بەچکە زەرنەقوتە بەسەزمانە بەجێ دێڵن، ئەم بچکۆلە بێ دەسەلآتە، نەدایك، نە باوك، نە مام و خاڵ و خزم و دراوسێ.. کەسی نیە فریای بکەوێ و شتێ بکات بە دەمیەوە! بەڵآم دروستکارەکەی ﴿الله﴾یە. خۆی ڕزق و ڕۆزی بۆ دەنێرێ. (لەخوا غافڵ مەبە) و سەرنج بدە:

خوای گەورە لەناو دەنوکی ئەم بەچکە قەلەڕەشە بەسەزمانەدا، بۆنێکی تایبەتی دروست کردووە، حەشەراتە بچکۆلەکان، مێش و مێشولە و مێروی باڵدار، حەزیان بەم بۆنەیە! هەر بۆیە ئەم بەچکە لە برسانا دەمی کردۆتەوە، ئەم حەشەرانەش حەزیان بە بۆنی ناو دەمیەتی خۆیان دەکەن بەناودەمیدا، ئەمیش دەم دادەخات و دەیانخوات و تێر دەبێ! هەر کەبرسی بۆوە جارێکی تر دەم

دەکاتەوە و هەمدیسان مێش و مێشولە ئەچنە ناو دەمی و ئەمجارەش تێر دەخوات!! بەڵێ دایك و باوك وازی لێهێنا، بەڵام پەروەردگاری ڕۆزی بەخش ئاگای لێیەتی و بەم جۆرە دەخوات تا پەڕە ڕەشەکانی دێنە دەرەوە، ئەمجا دایك و باوکی ڕەحم و سۆزیان بۆی دەجوڵێ و بەبەچکەی خۆیانی دەزانن و خۆراکی بەدەمەوە دەکەن!!

بەڵێ لەناو گیانداران و زیندوەرانیشدا ئەوانەی بەسەزمان و فەقیر حاڵ و بێ دەسەلاتن ڕزقیان ئاسانتر دەست دەکەوێ لەوانەی بەهێز و زیرەك و فێڵ بازن.. (نمونەیەك):

مەیمون زۆر فێڵباز و ماستاوچی و خاوەن هێز و توانایە. سەدان فرت و فێڵ و ماستاو دەکات تا مۆزێکی دەدەنێ. کەچی مەیمون هەمیشە برسی و چاو لە دەستە!!

یان (ڕێوی): ڕێوی بەو هەموو فێڵ بازیەی خۆیەوە هەتا دەمرێ هەر تێر سکی خۆی خۆراکی دەست ناکەوێت بەو هەموو فێڵبازیەوە، خۆراکی پێ پەیدا ناکرێ.

لە (مەیمون و ڕێوی)یەوە، خوای گەورە ئەو وانەیەمان فێردەکات کە ئەی مرۆڤ بزانە: دەستکەوتنی ڕزق و ڕۆزی بە فێڵبازی و ماستاوچیەتی نیە، بە زۆر زانی نیە، بە فەقیر حاڵی نیە، تا زۆرزانتر بی لەوانەیە ڕزقت کەمتر بێ (زۆربەی شاعیر و ئەدیب و

زانایانی جیهان دەستکورت و هەژارن، بە سەدان گەمژە و کەم عەقڵ و نەزانیش پارەداری گەورەن! !).

کەواتە: خوای پەروەردگار خۆی بە ڕەحمەتی خۆی ڕزق و ڕۆزی دەنێرێ، تۆش ئەی مرۆڤ هەوڵی خۆت بدە و لە خوا غافڵ مەبە..



## خاڵی چوارەم: بەجێ هێنانی سیلەی ڕەحم:

نەپچڕاندنی پەیوەندی و یارمەتی خزمە نزیکەکانت، بە تایبەتی یارمەتی باوك و دایك و برا و خوشکی هەژارت بدە، تاوەکو خوای گەورە ڕزقت زیاد بکات. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:( مَنْ سَرَّهُ أَنْ يُبسَطَ لَهُ فِي رِزْقِهِ، وَأَن يُنسأَ لَهُ فِي أَثَرِهِ فَلْيَصِلْ رَحِمَهُ) رواهُ البُخاريُّ:(٥٩٨٦).

بوە دکتۆرێکی دەوڵەمەند! بەسەرهات

دکتۆر (مەجد) خەڵکی عێراقە و لە وڵاتی ئیمارات دەژی، لە دوای تەواوکردنی کولێژی پزیشکی ددان، عیادەیەکی پزیشکی ددان دەکاتەوە، بە حیسابی خۆی و بە تەماشاکردنی شەهادەی و ناوبانگی وا ئەزانێ عیادەکەی بەناکەوێ و ئیشی زۆری دەبێ. بەڵام –سبحان الله– چەند مانگ تەنها یەك کەسیش سەردانی عیادەکەی ناکات و، ناچار لەو پارەی کە هەیەتی کرێی بیناکە و ئەو هەموو

کارمەند و یاریدەدەری پزیشکی و بەشی تیشکی ددان و موختەبەرەکەی دەدات!! پاشان کە پارەکانی تەواو دەبن و کەسیش ڕوو لە عیادەکەی ناکات..

کرێی چەند مانگی بینای عیادەکەی لەسەر کۆدەبێتەوە، کە بڕەکەی (١٨) هەزار درهەمی ئیماراتی دەبێ.. خاوەن بیناکە شکاتی لێدەکات. دکتۆر مەجد پێش ئەوەی بچێ بۆ دادگا قسە لەگەڵ ماڵی باوکی دەکات لە عێراق و ئەحواڵیان دەپرسێت. باوکیشی باسی وەزعی ناخۆشی خۆیانی بۆ دەکات کە کاتی ئابلۆقەی ئابوری سەر عێراق بوو، ئەمیش تەنها دوو هەزار دیرهەمی بەدەستەوە دەبێت و لەبەرخوا دەینێرێت بۆ ماڵی باوکی!

سبحان الله بەیانی کە دەیەوێت بچێت بۆ دادگا بە دەم شکاتەکەوە، بەڕێوبەری عیادەکە تەلەفۆنی بۆ دەکات و دەڵێت: دکتۆر خێرا وەرە خەڵکێکی زۆر هاتوون، کە دەگەڕێتەوە تومەز شێخێکی ئیمارات خۆی و ماڵ و منداڵی هاتوون بۆ دان چاك کردن، بە چەند سەعاتێك دانیان بۆ چاك دەکەن و کاتێ حیسابیان بۆ دەکات (بیست و دوو هەزار) دیرهەم حەق دەست وەردەگرێت، هەژدە هەزاری ئەدات بە کرێی بیناکە و چوار هەزاریشی بۆ دەمێنێتەوە!!

لەمەوە دەرگای ڕزق و ڕۆزی لەسەر دەکرێتەوە، ئێستا باشترین دکتۆری ددان ڕاستکردنەوەیە لەئیمارات و لە کەناڵە

خەلیجیەکانەوە بەردەوام دەردەکەوێت و لە کەناڵێکیشیان بەردەوام بەرنامەیەکی پزیشکی هەیە.. ئەمەش بەرەکەتی چاکە کردنە لەگەڵ دایك و باوکدا، دیار هیچ چاکەیەکیش ئەگەر بە هێندەی دەنکە خەرتەلەیەکیش بێت، لای خوا بەزایە ناچێت. )زەردەخەنەی هیوا، ئەندازیار عثمان، ل٢٧).

## خاڵی پێنجەم: یارمەتی لاوازەکان بەرەکەتە بۆ رزق:

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: (**هَلْ تُنْصَرُونَ وَتُرزَقُونَ إِلّا بِضُعَفائِكُمْ) رَواه البُخاريُّ**.

واتە: ئایا سەرکەوتن و پایەداریتان، موفەق بونتان لە ئیش و کارەکانتان، وە بونی ڕزق و ڕۆزی فراوان بۆتان، هەر بەهۆی بەرەکەتی لاواز و بێ دەسەلات و بێ دەرەتانەکانتانەوە نیە؟! بەڵێ ئەوانە نەك ئەرك و بارنین لەسەر شانمان بەڵکو هۆکاری بەرەکەتی ڕزق و ڕۆزیشمانن.

لە ڕوانگەی ئەم فەرموودەوە پەیامێك بۆ:

١) ئەو کەسانەی کە خوشکیان لە ماڵەوە ماوەتەوە و شووی بۆ نەکراوە و خۆی موچە و کارێکی نیە، ئاگاداربن هیچ کات ئەو خوشکە بەڕێزانەتان بە ئەرك مەزانن لەسەرتان. مەڵێ من مەصرەفی دەکەم، بەخێوی دەکەم.. نەخێر بەڵکو لەوانەیە خوای گەورە بەهۆی بەرەکەتی ئەوەوە لە ماڵەکەتاندا، بەهۆی دوعای

بەخێری ئەوەوە بۆت، ڕزقی تۆشی دابێ. بەرەکەتی خستبێتە ڕزق و کار و کەسابەتتەوە.

٢) ئەوانەی کە لە ماڵەوە نەخۆشی درێژخایەنیان هەیە، کەم ئەندام و خاوەن پێداویستیەکی تایبەتیان هەیە. منداڵێکی مەغۆل یان ئیفلیج، یان خەلەلی عەقڵی هەیە. تکایە وامەزانە ئەوانە ئەرکن بەسەرتەوە، ئامان نەکەی بڵێی: پێوەی فەوتاوم گیرۆدەبووم، نەخێر.. جگە لە پاداشتی خوایی بۆت کە ئەگەر جوان خزمەتی بکەی و منەتی بەسەردا نەکەی. (لَعَلَّكَ تُرزَقُ بِهِ). لەوانەیە ئەو ڕزق و ڕۆزیەت خوای گەورە بەهۆی ئەو منداڵە کەم ئەندامەوە. ئەو نەخۆشە درێژخایەنەوە بیدات و بەرەکەتی تێ کردبێ، لەوانەیە خوای گەورە لە دەیان بەلا و موصیبەت تۆی پاراستبێ، بەلای گەورە و لەناوبەر کە خەڵکی تووشی بووە، جەڵتەی دڵ و دەماغ، نەخۆشی درێژخایەن، کە تۆ لەشت ساغ و سەلیمە، پارەکەت نادەی بە دکتۆر و دەرزی و دەرمان، کەلە بازرگانیەکەتدا سەرکەوتوی و توشی شکستی ماددی نەبووی. ئەوە بەرهەمی خزمەتی ئەو نەخۆش و بێ دەسەلاتەیە.

**بەسەرهاتێك:**

د. محمد عبدالرحمن العریفی دەڵێت: یەکێ لە قوتابیەکانم دوای ئەوەی کۆلێژی تەواوکرد دامەزرا و شتێ پارەی کەمی هەبوو،

پرسیاری لێكردم چۆن ئیشێكی پێوە بكات، سا بەڵكو شتێ پارە پێكەوە بنێ و بۆ خۆی و بۆ دایكی و خوشكەكەی، منیش دەموت: من هیچی وا لە بازرگانی نازانم..

جارێك هەواڵی دامێ كە لە شوێنێكدا لای باڵەخانەیەكەوە لەگەڵ خاوەنەكەیدا رێك كەوتووە كە كۆشكێك دروست بكات لەسەر حیسابی خۆی و دوای (بیست) ساڵ بیداتەوە بە خاوەنەكەی.. نزیكەی (١٢) هەزار ریاڵێكی خەرج كرد خوای گەورە و رۆزی بەخش وەكالەتی كۆمپانیایەكی عەتری گەورەی بۆ نارد، لەبەر ئەوەی شوێنەكەش باش بوو، لێیان كڕی بە (٨٥٠) هەزار ریاڵ..

ئەم گەنجە كە دایكی و خوشكێكی كە شوی بۆ نەكرابوو، لە ماڵەوە لەگەڵی دەژیان و ئەم مەصرەفی دەكردن و، زۆر رێزی لێ دەگرتن و ئەوانیش هەمیشە دوعای خێریان بۆ دەكرد. دەرگای رزق و رۆزی لێ كرایەوە و بەو پارە زۆرەی دەستی كەوت خانووی پێ كڕی، سەیارەی پێ كڕی، ژنی پێ هێنا، خوای گەورە دەرگای رزق و رۆزی لێ كردەوە، هەمووی بەبەرەكەتی چاكەكردن و خزمەتی جوان و بێ منەتی دایك و خوشكەكەی..

(زەردەخەنەی هیوا، ل٢٨).



## خاڵی شەشەم: یارمەتیدانی فێرخواز رزق زیاد دەکات..

هەر کەسێك خزمەتی فێرخوازێك بکات. پێداویستیەکانی بۆ دابین بکات، قوتابیەکی زانکۆ و پەیمانگا و ئامادەییت هەیە. بەهۆی خوێندنەکەیەوە ناتوانێ کار و کەسابەت بکات، تۆی باوك و دایك، تۆی برا و خوشکی هاوکاری بکەن. پێداویستیەکانی بۆ دابین بکەن. مەڵێ بارێکی گرانە لەسەر شانم، من پارەی خۆمی دەدەمێ. دڵنیابە خوای گەورە ڕزقی ئەویش لە ڕێگەی بەرەکەتەوە دەنێرێت بۆ تۆ و هیچ بارگرانیەکی بۆ تۆ نیە، بەڵکو خوای گەورە ڕزق و کەسابەتی تۆی بەهۆی ئەوەوە زیاد کردووە.

ئەمەش فەرموودەیەکی پێغەمبەرە ﷺ: **عَنْ أَنَس بنِ مالِك: (كانَ أَخَوانِ عَلى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَكانَ أَحَدُهُما يَأتي النَبِيَّ ﷺ وَالآخَرُ يَحْتَرِف، فَشَكا المُحْتَرِف أَخاهُ إلى النَبِيِّ ﷺ، فَقالَ: لَعَلَّكَ تُرزَقُ بِهِ)** صَحيح سُنَنْ الترمذي:٢/٢٧٤.

واتە: لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ دوو برا هەبوون. یەکێکیان هەمیشە دەهاتە خزمەتی پێغەمبەری خواو زانستی شەرعی دەخوێند، یەکێکیشیان کاسپی دەکرد و پیشەکار بوو، برا کاسبکارەکە ڕۆژێ شکوای کرد لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە دەست برا خوێندکارەکەی کە دەبێ ئەم مەصرەفی بکا و نان و بەرگی بۆ بکات. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: منەتی بەسەردا مەکە، ڕەنگە تۆ

بەهۆی ئەوەوە خوای گەورە ڕزق و ڕۆزی دابی و لەش ساغی کردبی و هۆشی بەهێز کردبی و پارەی زۆرت دەستبکەوێ و ئیشی زۆرت هەبێ..

لە کۆتایدا: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلْقُوَّةِ ٱلْمَتِينُ ۝٥٨﴾ الذاريات.



## وانەی دووەم

## بابەت: دایکی میهرەبان، مندالەکەت لە شیری خۆت بێبەش مەکە

۞ **قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى:** ﴿ وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ ۖ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ ۚ وَعَلَى ٱلْمَوْلُودِ لَهُۥ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ۚ ﴾ **البقرة: ٢٣٣.**

۞ **و قالَ اللهُ تَعالى:** ﴿وَحَرَّمْنَا عَلَيْهِ ٱلْمَرَاضِعَ مِن قَبْلُ فَقَالَتْ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰٓ أَهْلِ بَيْتٍ يَكْفُلُونَهُۥ لَكُمْ وَهُمْ لَهُۥ نَٰصِحُونَ ﴿١٢﴾ فَرَدَدْنَٰهُ إِلَىٰٓ أُمِّهِۦ كَىْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ وَلِتَعْلَمَ أَنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٣﴾﴾ **القصص.**

۞ **عَنْ أَبي أُمامَةَ الباهِلِي، قالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ، يَقُولُ: (بَيْنا انا نائِمٌ إِذْ أَتاني رَجُلانِ، فأخَذا بِضَبْعَيَّ، فأَتَيا بي جَبَلاً وَعْراً، فَقالا لي: إِصْعَدْ حَتَّى إذا كُنْتُ في سَواءِ الجَبَلِ، فَإِذا انا بِصَوْتٍ شَديدٍ، فَقُلْتُ: ما هذهِ الأَصْواتُ؟! قالُوا: هذا عَواءُ أَهْلِ النّارِ، ثُمَّ انْطُلِقَ بي، فَإِذا أَنا بَقَوْمٍ مُعَلَّقِينَ بِعَراقِيبِهِمْ، مُشَقَّقَةٌ أَشْداقُهُمْ، تَسيلُ اشْداقُهُمْ دَماً، فَقُلتُ مَنْ هؤلاءِ؟! فَقِيلَ: هؤلاءِ**

الذين يُفطِرُون قَبْلَ تَحِلَّةِ صَوْمِهِمْ، ثُمَّ انْطُلِقَ بي، فَإذا بِقَوْمٍ أَشَدَّ شَئٍ إِنْتفاخاً وانْتَنَهُ ريحاً، وَ أَسْوَئه مَنْظَراً، فَقُلْتُ: مَنْ هؤلاءِ؟ قيلَ: الزَّانُونَ وَ الزَّواني، ثُمَّ انْطُلِقَ بي، فَإذا بِنِساءٍ تنهش ثُدِيهِنَّ الحيّات، فَقُلْتُ: مابالَ هؤلاءِ؟! قيلَ هؤلاءِ اللاّتي يَمْنَعْنَ أَولادَهُنَّ البانَهُنَّ..) رَواهُ إِبْنُ خُزَيْمَةَ: (١٩٨٦). وَإِبْنُ حِبّان: (٧٤٩٤).

## سەرچاوەکان:


١) پەروەردەکردنی منداڵ لە چل فەرمودەی صەحیحدا، دانراوی: دکتۆر عادل عبدالله بن سعدالحمدان الغامدی، وەرگێڕانی: م. عمر تۆفیق الخطاط، لاپەڕە: ٢٤ و ٢٠١، چاپی یەکەم، ٢٠١١، کتێبخانەی نارین.

٢) ڕاستیەکانی زانستی سەردەم، نوسینی: عبدالرحمن العصاڤ، وەرگێڕانی: أدیب نجم الدین قەرەداغی، لاپەڕە:٣٢.

٣) آياتُ الله في الإِنْسان، د. محمد راتب النابْلُسي، ص١٧٩.

٤) گۆڤاری پزیشك.

٥) گۆڤاری (نیگا) ژمارە: ١١٣، لە ٢٠١٠/١٢/٥، لاپەڕە:٤.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحَمْدُ لله رَبِّ العالَمين، وَالصَّلاةُ وَ السَّلامُ عَلى سَيِّدِنا محمد وَ عَلى اله وَ صحبه أجْمَعين:

ئیماندارانی بەڕێز: یەکێ لە نیشانەکانی دەسەڵاتی بێ سنوری خوای پەروەردگار بریتیە لە بوونی (شیر)، لە مەمکی دایکدا لەو کاتەی کە لەدایك دەبێ. تا وەکو دەکەوێتە سەر خواردن و پێویستی بە شیر نامێنێ. ئەم وتارەمان زیاتر تایبەتە بە خوشکان و پێیان دەڵێین: لەخوا غافڵ مەبن و ئەم دیاری و خەڵات و بەخششەی خوای پەروەردگار کە پێی بەخشیون، کە کاتێ کۆرپەتان دەبێ و مەمکەکانتان پڕدەبێ لە شیر، منداڵەکانتان لە شیری پاکی خۆتان بێبەش مەکەن.

سەرەتای وانەکەمان با بچینە خزمەت ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە باسی ئەو ئافرەتانەی تێدایە، کە منداڵەکانیان بەبێ هۆکار لە شیری خۆیان قەدەغە دەکەن: پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ دەفەرموێت: خەوتبووم لە خەومدا دوو پیاو هاتن بۆ لام و هاتنە ژێر دەستم و قۆڵیان گرتم و بردیانم لەگەڵ خۆیان و، گەیشتینە شاخێکی زۆر سەخت و پێیان وتم: بە شاخەکەدا سەرکەوە.. تاگەیشتمە سەر کێوەکە و لەپڕ گوێم لە دەنگێکی زۆر توند بوو..

وتم: ئەم دەنگە چیە؟! وتیان: ئەمە گریان و هاواری جەهەننەمیەکانە..

پاشان بردیانم بۆلای خەڵکێك، کەسانێکم بینی بە پاژنەی پێ هەڵواسرابوون و، کاکیلە و چەناگەیان دووکەرت کرابوون و خوێنیان لێ دەچۆڕان وتم: ئەمانە کێن؟ وتیان: ئەمانە ئەو کەسانەن کە پێش کاتی هاتنی ڕۆژوو شکاندن لە ڕەمەزاندا ـ بەبێ عوزری شەرعی ـ ڕۆژوەکەیان دەشکێنن..

پاشان لەوێوە بردیانم بۆ شوێنێکی تر و، کەسانێکم بینی زۆر ئاوسابوون و بۆگەنێکی زۆر ناخۆشیان لێ دەهات و چارە و ڕوخساریان زۆر ناشرین و بەدفەساڵ بون! ! وتم ئەمانە کێن؟

وتیان: ژنان و پیاوانی شەڕواڵ پیس و زینا کەرانن! !

پاشان بردیانم بۆ شوێنێك، لەوێ گەیشتمە کۆمەڵێك ئافرەت کە ماری گەورە پەلاماری مەمکی دەدان و، بۆی دەڕنین و مەکی شیتاڵ شیتاڵ کردبوون! وتم: ئەی ئەمانە چیان کردووە؟

وتیان: ئەمانە ئەو ئافرەتانەن کە نەیان هێشتووە کۆرپەکانیان مەمکیان بمژن و شیر بخۆن! ! ئەم فەرموودەیە: ((رَواهُ ابنُ خُزَيمَة: ١٩٨٦) و إِبنُ حِبّان: (٧٤٩٤) بِإِسْنادٍ صَحيح).

بەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (**فَإِذا بِنِساءٍ تَنهش ثَديهنَّ الحيّات، فَقُلْتُ: مابال هؤلاءِ؟! قيلَ هؤلاءِ اللاّتي يَمْنَعْنَ أَولادَهُنَّ البانَهُنَّ**) بەڵێ پێغەمبەری ڕەحمەت.. ئافرەتانی بەڕێزی

ئوممەتەکەی ئاگادار کردەوە، کە ئێوەی دایکان کە خوای گەورە ئەو شیرە پاکەی بۆ منداڵە جوانەکانتان پێ بەخشیون. شوکری خوای لەسەر بکەن و لەخوا غافڵ مەبن و لە شیری خۆتان بێبەشیان مەکەن..

لەبەر ئەوەی هیچ شتێ ناتوانێ قەرەبووی شیری دایك بۆ کۆرپەکەی بکاتەوە. هەر لەبەر ئەمەیە کە حکومەتەکانی جیهان بە کۆی دەنگ داوایان کردوەو، بۆتە بڕیار کە پێویستە لەسەر هەموو قوتوە شیرێکی دەستکرد بنوسرێ: (**لا شَئَ يَعْدِلُ حَليبَ الأمِّ**).

## نابێ ئافرەتی دووگیان ئازاری دەروونی بدرێت:

ئافرەتی دووگیان (حامیلە) دەبێ زۆر ئاگاداری بکرێ و نابێ ئازاری دەرونی بدرێ، زانایانی بواری کۆرپەلە ناسی گەیشتوەتە ئەو ڕاستیەی کە: هەڵچونی باری دەرونی و سۆزداری (عاطفي) ئافرەت لەکاتی دووگیانی دا، یان پێش حاڵەتی دووگیانیش، دەبێتە هۆکارێکی کاریگەر بۆئەوەی کە مناڵەکەی توشی گرفت و شێواوی جەستەیی و عەقڵی ببێت. لەبەرئەوە یەکێك لە هۆکارە هەرە بەهێزەکانی تێکچوونی منداڵ و شێواوی لەسکی دایکیدا، باری دەرونی و دایکەکەیەتی لە کاتی دووگیانیدا.

زانایان دەڵێن: (فشار و هەڵچونی دەرونی هۆکارێکی بەهێزە بۆ بەرزبوونەوەی هۆرمۆنی (کورتیزون)، کە ئەمیش دەبێتە هۆی

بەرزبوونەوەی ڕێژەی شەکر لە خوێندا و کەم بونەوەی ئۆکسجین لە شانەکاندا. کە ئەم دوانەش دەبنە هۆی تێکچوونی شێوەی کۆرپەلە لە سکی دایکیدا)! (آيات الله في الإنسان، د. محمد راتب النابلسي، ص١٧٩).



## چەند زانیاریەکی گرنگ دەربارەی کۆرپەلە:

١) تێبینی کراوە کۆرپەلە لەناو سکی دایکیدا، بەهۆی جگەرە کێشانی دایکیەوە حاڵی دەگۆڕێت و ئازار دەخوات!

٢) کاتێك دایکی دڵخۆش دەبێت ئەو منداڵە لەناو سکی دایکیدا جموجۆڵێك دەکات کە لەسەما دەچێت! بەهەمان شێوەش لە کاتی تورەبوونی دایکیدا، ئەم کۆرپەلەیە گرژ دەبێت و جموجۆڵ ناکات و دوایش مرۆڤێکی تورە و پەستی لێدەردەچێت.

٣) لە کاتێکدا باوکی ئەم کۆرپەلەیە قسە دەکات ـ کە هێشتا لەناو سکی دایکیایەتی و نەهاتۆتە دونیاوە ـ ئەو منداڵە لە جموجۆڵ دەکەوێت و گوێ لە دەنگی باوکی دەگرێت! کاتێکیش هاتە دنیاوە لەناو هەموو دەنگەکاندا، دەنگی باوکی دەناسێتەوە.

٤) ئافرەتی دووگیان نابێ بە هیچ شێوەیەك لە کۆرپەلەی ناو سکی بێزار بێت: ئافرەتێکی دووگیان بە چەند شێوەیەك ویستی کۆرپەلەکەی لەناو بەرێت، بەڵام بێ سوود بوو لەناو نەچوو، کاتێك

ئەم کۆرپەلەیە هاتە دونیاوە ـ کە کیژۆڵەیەك بوو ـ، بۆ ماوەی چوار ڕۆژ شیری دایکی نەخوارد، بەڵام شیری کەسانی تری دەخوارد، زانایانی لێکۆڵەر لەم حاڵەتە، هاتن چاوی ئەم کیژۆڵەیان گرت ـ بۆ ئەوەی دایکی نەبینێ ـ ئینجا ویستیان شیری بدەنێ، بەڵام هەر وەری نەگرت و نەیخوارد! ئەم ڕووداوەش لە میصر ڕوویداوە.

٥) ئافرەتی دووگیان کاریگەر دەبێت بە هەموو ئەو قسە و دەنگانەی کە دەیانبیستێ و ڕاستەوخۆ کاردەکەنە سەر کۆرپەکەی. بۆیە پێویستە ئافرەتی دووگیان لە کاتی حامیلەیی دا، خۆی بپارێزێت لە قسەی ناشەرعی و ناشرین و زۆرتر گوێ لە قورئان و ووشەی جوان بگرێت.

ڕووداوێك: ئافرەتێکی دووگیان، لەکاتی هەستان و دانیشتن و ڕاکشاندا قورئانی دەخوێند، یان گوێی لە قورئان دەگرت. کاتێك منداڵەکەی هاتە دونیاوە، لە تەمەنی پێنج ساڵیدا، هەموو قورئانی لەبەر کرد. ـ ئەم ڕووداوەش لە شاری کەرکوك ڕوویداوە ـ.

( ڕاستیەکانی زانستی سەردەم. ل٣٣).



## لە ئیسلامدا ئافرەتی دووگیان و شیردەر، گرنگی تایبەتیان پێدراوە:

حوکمە شەرعیەکان بۆ ئافرەتی شیردەر:

١) ڕۆژووی لەسەر لادەچێت لەو ڕۆژانەدا کە شیر دەدات بە کۆرپەکەی.

٢) جێبەجێ نەکردنی حوکمی زینا لەسەر ئەو ئافرەتەی کە کۆرپەی شیرە خۆرەی هەیە تا لە شیر دەبڕێتەوە.

هەروەك لە زەمانی پێغەمبەری خوادا ﷺ ئافرەتێك هاتە خزمەتی و دانی بەوەدانا کە زینای کردووە، داوای لە پێغەمبەر کرد کە ڕەجمی بکات و خاوێنی بکاتەوە، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: (**فَاذْهَبي حَتَّى تلدي**) واتە: بڕۆرەوە بۆماڵەوە تا منداڵەکەت دەبێت..

دوای ئەوەی منداڵەکەی بوو، پێچای بە پەڕۆیەکەوە و هێنایەوە خزمەت سەروەر ﷺ و وتی: ئەوەتا منداڵەکەم بوو.. ئەمجا پاکم بکەوە لەو گوناهە بۆ گەنەی کە ژیانی لێ تاڵ کردووم.. با بەم گوناهەوە نەچمە دیوانی خوای گەورە ! !

ئەمجارەیان پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (**إذْهَبي فارضِعِيهِ حَتَّى تفطميه**) بڕۆرەوە شیری پێ بدە تا لەشیر دەبڕێتەوە.. ژنەکە پاش ماوەیەك هاتەوە و پارچە نانێکی دابوو بە دەستی کۆرپەکەیەوە و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەوەتا لە شیرم

براندۆتەوە و نان دەخوات. پێغەمبەریش منداڵەکەی دایە دەستی پیاوێك، بۆ ژنەکەش فەرمانیدا چاڵێکیان هەڵکەند بۆی تا سنگی دەهات. فەرمانی دا بە خەڵکەکە تا ڕەجمی بکەن، ئەوانیش ڕەجمیان کرد..

(ئەم فەرموودەیە: رَوَاهُ أَحْمَد (٣٤٨/٥) و مُسْلِم: (٤٤٥١). )

**ماوەی شیر خواردنی منداڵ:**

ماوەی شیر پێدانی تەواو دوو ساڵە، وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَٱلۡوَٰلِدَٰتُ يُرۡضِعۡنَ أَوۡلَٰدَهُنَّ حَوۡلَيۡنِ كَامِلَيۡنِۖ لِمَنۡ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ﴾ البقرة: ٢٣٣. واتە: دایکان بۆ ماوەی دوو ساڵی تەواو شیر دەدەن بە منداڵەکانیان..

**شیردان بە منداڵ دوای دوو ساڵ:**

هەندێك لە سەلەفی صاڵح نەیانهێشتووە لە پاش دوو ساڵ شیر بدرێت بە منداڵ، پێشەوا (إِبنُ كثير) لە تەفسیرەکەیدا دەفەرمووێ: (باس کراوە کە شیردان بە منداڵ لەدوای دووساڵ زیان بەخشە بۆی، چ لە ڕووی بەدەنیەوە یان لە ڕووی عەقڵیەوە).

پێشەوا (إِبْنُ القَيِّم) دەفەرمووێ: (پێویستە تاکاتی ددان دەرهاتن دایك تەنها شیر بدات بە منداڵەکەی، چونکە لەو کاتەدا گەدەی منداڵ لاوازە و توانای هەرسکردنی خواردنی نیە، هەر کە

ددانی دەرهات و گەدەی بەهێز بوو، خواردنی پێ بدات. چونکە حیکمەتی خوایی لەوەدایە کە ددان دەرکردنی دوا دەخات، تاکاتێ پێویستی بە خواردنەو بەزەییشە بە دایکەکەدا کە ددانی نیە گاز بگرێت لەسەر گۆی مەمکەکانی دایکی. (تحفَة الولود ـ ابنُ القَيِّم ـ ص٣٨٨). (پەروەردەی منداڵ لە چل فەرموودەدا ل٢٠٤ — ٢٠٨).



## شیر پێدانی سروشتی سودی بۆ دایکانیش هەیە!

ئەکادیمیای ئەمریکی بۆ نەخۆشیەکانی منداڵ، ئەوەیان ڕاگەیاند کە شیر پێدانی سروشتی بە تەنیا هەر سوودی بۆ کۆرپەکە نیە، بەڵکو سوودی بۆ دایکەکەش هەیە و ئەو سودە هەنوکەیی و درێژخایەنە. دوای ماوەیەکی کەم لە بوونی منداڵ، ئەگەر دایکەکە شیری خۆی بدات بە کۆرپەکەی، ئەوا سودەکانی شیر پێدانی لەسەر دەردەکەوێت بەم شێوەیە:

ئەو دایکانەی شیری خۆیان دەدەن بە کۆرپەکانیان کەمتر خوێنیان لەبەر دەڕوات دوای لەدایك بونی کۆرپەکەیان، هەروەها منداڵ زوتر دێتەوە شوێنی خۆی و باری ئاسایی خۆی، بەبەراورد بەو ژنانەی کە شیری خۆیان نادەن بە کۆرپەکانیان، هەروەها تەندروستی بیروهۆشیان باشتر دەبێت و بینراوە ئەو دایکانەی شیر نادەن بە کۆرپەکانیان یان زوو منداڵیان لە شیر دەبرنەوە، ئەگەری

توش بونیان بە خەمۆکی دوای منداڵ بوون زۆر دەبێت.. دایك ئەگەر شیری خۆی بدات بە کۆرپەکەی ئەوا کێشی لەشی کەمتر دەکات دوای منداڵ بوون بەبەراورد بەو دایکانەی کە شیری خۆیان نادەن بە منداڵەکانیان، هەروەها ئەو دایکانەی کە نەخۆشی شەکری کاتی دووگیانیان هەیە و دوای لەدایك بوونی منداڵەکەیان شیری خۆیان دەدەن بە منداڵەکەیان، ئەوا بە ڕێژەی (٤ – ١٢ ٪) ئەگەری توشبوونی بە نەخۆشی شەکرە کەم دەکات!!

هەرچی سەبارەت بە سودە دوور و درێژخایەنەکانی شیر پێدانی سروشتیشە ئەمەیە: بینراوە ئەو دایکانەی کە شیری خۆیان بۆ ماوەی (١٢) مانگ دەدەن بە کۆرپەکانیان ئەوا ئەگەری توش بوونیان بە ڕۆماتیزمی جومگە، بە ڕێژەی (٢٠٪) کەم دەبێتەوە بەڵام ئەگەر دایکەکە شیری خۆی بۆ ماوەی (٢٤) مانگ بدات بە کۆرپەکەی! "سُبْحانَ الله ئەمە فەرموودەکەی قورئانە: حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ" ئەوا ئەگەری تووشبوونی بە نەخۆشی ڕۆماتیزمی جومگە بە ڕێژەی (٥٠٪) کەمتر دەبێت!!

هەرچی سەبارەت بە نە خۆشیەکانی دڵە دیراسەیەك لەسەر (١٣٩) هەزار ژن کرا، بۆ زانینی کاردانەوەی شیر پێدانی سروشتی لەسەر دڵی دایکەکان، دەرکەوت: کە ئەو ژنانەی شیری مەمکی خۆیان دەدەن بە کۆرپەکانیان ئەگەری تووشبوونیان بە نەخۆشی

بەرز بوونەوەی فشار بەرێژەی (١١٪) کەم دەکات. هەروەها ئەگەری تووشبوونیان بە زیاد بوونی چەوری لەناو خوێن بە رێژەی (١٩٪) کەم دەکات.. بە شێوەیەکی گشتی ئەو ژنانەی شیری خۆیان دەدەن بە منداڵەکانیان ئەگەری تووشبوونیان بە نەخۆشیەکانی دڵ بە رێژەی (١٠٪) کەم دەکات.

هەروەها ئەو دایکانەی بۆماوەی یەك ساڵ شیری مەمکی خۆیان داوە بە کۆرپەکانیان، ئەگەری تووشبوونیان بە شێر پەنجەی مەمك و شێر پەنجەی (سرطان)ی هێلکەدان بە رێژەی (٢,٨٪) کەم دەکات! لەبەر هەموو ئەو سودانە، ئەکادیمیای ئەمریکی بۆ نەخۆشیەکانی منداڵان، ئامۆژگاری دایکان دەکات کە شیری خۆیان بدەن بە کۆرپەکانیان، هەر هیچ نەبێت هەتا ساڵێکی دوای بوونی منداڵ و زوو منداڵ لە شیر نەکەنەوە.. (گۆڤاری پزیشك).

سوپاسی تۆ دەکەین خوای پەروەردگارمان کە قورئان و پێغەمبەری ئیسلامت پێ خەڵات کردین و، هەرچی زانست و زانیاری و خۆشبەختی و سودی دونیا و دوا رۆژە پێیان گەیاندوین و ئەگەر نەخوێندەواریش بین، بە شوێن کەوتنی قورئان و سوننەت، هەزار ساڵ زیاتر لەپێش ئەکادیمیای ئەمریکاوە ڕاستیەکانمان زانیوە.



## دایکی بەڕێز: لەدوای دووگیان بونت، شیری خۆت بدەرە منداڵەکەت..

دکتۆر جەمال ئەحمەد ڕەشید ـ پسپۆڕی نەخۆشیەکانی منداڵ ـ باسی شیری منداڵ دەکات و دەفەرموویت: گرنگە هەموو دایکان لە نەخۆشخانەدا منداڵیان ببێت بۆئەوەی دکتۆرە چاودێری دایکەکە و منداڵەکە بکات، بە تایبەت هەندێ دایك کە شەکرەی بەرز بووە، منداڵەکەشی کێشیان زۆرە و شەکریان دادەبەزێت، ئەمەش کاریگەری زۆر خراپی لەسەر مێشکی منداڵەکە دەبێت ئەگەر زۆر دابەزێت. ئەو منداڵانە لە نەخۆشخانە دەهێڵرێنەوە بۆ ئەوەی چارەسەری پێویستیان بۆ بکرێت.. ئەم جۆرە منداڵانە باشتر وایە زوو زوو شیریان بدرێتێ و ڕۆژێ تا دوو ڕۆژ لە ژێر چاودێریدا بن. هەمان ئەو منداڵانەی دایکیان شەکرەی هەیە ئەگەری هەیە کە نەخۆشی هەبێت لە دڵیاندا یان مێشك یان بڕبڕەی پشتیان یان لە شوێنی تریاندا.. (٩٥٪)ـی منداڵان پێویستیان بە داخڵ بوون نیە لە نەخۆشخانە و یەکسەر دەدرێتەوە بە دایکەکە بۆئەوەی دەست بکات بە شیر پێدانی.

دەرکەوتووە کە شیر پێدانی سروشتی لەهەموو جۆرە شیردانەکانی تر تەندروسترە، تەنها لە حاڵەتی زۆر تایبەتی پزیشکی نەبێت کە دکتۆر بەو دایکە دەڵێت شیری خۆتی مەدەرێ..

لەبەرئەوە پێویست ناکات دایك بڵێت: شیرەکەم بە منداڵەکەم دەکەوێت یان نا، پێویستە شیری خۆی بداتێ..

لە ڕاستیدا، یەکەم ڕۆژ و دووەم و سێهەم ڕۆژی لەدایك بوونی کۆرپەکە زۆر زۆر گرنگە کە سنگی دایکەکە بەتاڵ بێتەوە، چونکە ئەگەر لەو ماوەیەدا بەتاڵی نەکاتەوە، ئەوا شیر دروست نابێت..

## خاڵێکی زۆر گرنگ:

بۆ ئەوەی شیرێکی تەواو بۆ منداڵەکە دروست ببێت، پێویستە لەسەر دایك پێش ئەوەی سك بکات و، لەکاتی سکەکەشدا بەس بیر لەوە بکاتەوە کە شیری خۆی دەدات بە کۆرپەکەی لە داهاتوودا. چونکە شیری دایك لە مێشکەوە دروست دەبێت هەندێ هۆرمۆنات هەیە لەو کاتەوە ئەرێژرێن، ئامادەکاری دەکەن لەسنگی ئەو دایکە بۆئەوەی گلاندەکانی ناو سنگی وا دروست بێت کە شیر بە شێوەیەکی تەواو دروست بکات.. ئەگەر دایکەکە جار جار بڵێت شیری خۆمی نادەمێ و شیری قوتوی ئەدەمێ، لەوانەیە شیرەکەی بەشی نەکات و ووشك بکات. چونکە لەو کاتەوە سویچکەی کوژاندۆتەوە، واتە: ئەگەر دایکەکە بە تەواوەتی بڵێت شیری خۆمی دەدەمێ خۆی دڵنیا بکات، ئەوا شیرەکەی زۆر بەباشی بەشی دەکات و شیری تری ناوێت!!

ڕێژەی شیر خواردن:

دکتۆر جەمالی منداڵان لە درێژەی باسە گرنگەکەیدا دەفەرمووێت: لەو یەك دوو ڕۆژەی سەرەتادا زۆر کەم شیری دەوێت، ڕەنگە یەکەم ڕۆژ پیاڵەیەك یان دوو پیاڵە شیری بوێت، دووەم ڕۆژ زیاتر، سێهەم زیاتر.. کاتێك ئەزانی لە سێهەم ڕۆژوو و چوارەم ڕۆژدا شیری بۆ دروست دەبێت، بە کەمیەتێکی باش ئەتوانی بەردەوام بێت هەتا شەشە مانگی شیری بداتیٚ.

<u>ئاگادارکردنەوەیەکی گرنگ</u>: شەش مانگی یەکەم زۆر پێویستە دایکەکە لە شیری خۆی زیاتر هیچ شتێکی تر نەداتە منداڵەکەی، لەدوای (٦) مانگی ئەتوانیٚ لەپاڵ شیری خۆیدا شیری تری بداتیٚ، ئەگەر خواردنیشی بداتیٚ باشترە!



گەورەیی و دەسەڵات و بەزەی و سۆزی خوای پەروەردگار ببینە:

دکتۆر جەمال دەفەرمووێت: لە هەزار دایك، دوو یان سیٚ دایك هەیە کە شیرەکەی بەشی منداڵەکەی ناکات. لە سیٚ چوار هەزار دایکیشدا، یەك کەس شیری بۆ دروست نابێت ئەوەش لای ئەو دایکانەیە کە بیریان لەوە نەکردۆتەوە شیری خۆیان بدەن بە منداڵ.

## شیری قوتو چۆن بدرێتە منداڵ؟

د. جەمال ئەحمەد ڕەشید دەفەرمووێ: ئەو دایکانەی شیرەکانیان بەشی منداڵەکانیان ناکات، دەبێت پەنا بۆ شیری قوتو بەرن.. منداڵ هەمیشە هەفتەی سەرەتا پێویستە دوو کاتژمێر جارێك شیری بدرێتێ، دوای ئەوە لە نزیکی مانگێك ئەبێت (٣) کاتژمێر جارێك شیری بدرێتێ. کە دوو مانگ تەواو دەکات دەبێت بە (٤) سەعات جارێك شیری بدرێتێ.

وە یەکێك لەو خاڵانەی کە دایك یان بەخێوکەری منداڵ گرنگە بیزانێت ئەوەیە: کە نابێت شیری خەست بدرێتە منداڵ. ئەگەر عەیارەکە گەورە بوو، یەك عەیارە شیر بۆ دوو ڕەقەم ئاوە، ئەگەر عەیارەکە بچوك بوو، ئەوا یەك عەیارە شیر بۆ یەك ڕەقەم ئاوە، ئەگەر بەو شێوەیە بێت ئەوا منداڵەکە تینوی نابێت. بەڵام ئەگەر شیری لەوە خەستری بدرێتێ ئەوا کاریگەری لەسەر دوا خستنی گەشەی مێشکی منداڵەکە دەبێت.

وە پێویستە دایکانی بەڕێز ئاگاداری ئەوە بن کە: لە (١٠) ڕۆژی یەکەمدا منداڵ کێشی زیاد ناکات.. لەوانەیە شتێك کەمیش بکات. دوای ئەوە پێویستە منداڵ کێشی زیاد بکات.. لە (٥) مانگی یەکەمدا کێشی ئەبێت بە (دوو) ئەوەندەی کێشی لەدایك بوونی. لە ساڵی یەکەمیدا کێشی (٦ تا ٧) کیلۆ زیاد دەکات. بەڵام ساڵی

دووەم كیلۆیەك بۆ كیلۆ و نیوێك زیاد دەكات، ئەمە گرنگە دایك بیزانێت.

- منداڵێكی دوو مانگ و سێ مانگ، شەو و ڕۆژێك (٢٥ بۆ ٣٠) عەیارە شیر دەخوات. بەڵام منداڵێكی یە ساڵە لەوانەیە كەمتر بخوات. دایك نابێت وا بیر بكاتەوە كە بڵێ: بە (٥) مانگی (٣٠) عەیارە شیری خواردووە. ئێستا ئەبێت (٧٠) عەیارە بخوات. لەبەرئەوەی منداڵ لە تەمەنی كۆتایی یەكساڵیدا، چارەكە كیلۆیەك زیاد دەكات. لە تەمەنی (١ تا ٣) مانگیدا دەبێت مانگی سێ چارەكە كیلۆ زیاد بكات.

**شۆردنی منداڵ دوای لەدایك بوونی:**

د. جەمال أحمد ڕەشید لەوەڵامی ئەو پرسیارەدا كە ئایا: منداڵ لەدوای لەدایك بوونی پێویست دەكات یەكسەر بشۆرێت یان پاش چەند هەفتەیەك بشۆرێت؟! دەفەرموێت: منداڵ دوای لەدایك بوونی دەتوانرێ بشۆرێت، بەڵام نەك بەو جۆرە شۆردنەی كە خەڵكی منداڵ دەباتە حەمام و سابونی زۆر بەكاردەهێنن. منداڵی واهەیە بەم جۆرە شتنە بارودۆخی زۆر تێك دەچێت كە ئەو سابون و كەفە بەردەم و چاو و لوتی بكەوێت. هەندێكیان وەك حەساسیەت خەریكە دەخنكێت.

منداڵ لە ژینگەیەکی پاکی پارێزراوەوە هاتۆتە دەرەوە، هیچ ئیلتیهابێکی بەسەرەوە نیە. لەبەرئەوەی ماددەیەکی وەکو سابون بەسەریەوەیەتی، تەنها پاك کردنەوەی دەوێت بە پەڕۆیەکی نەرمی پاك، دەشتوانی تۆزێ ئاوی شلەتێن بۆ بن باڵ و ڕانی بەکاربهێنی. دوای چەند ڕۆژێکی تر بەهەمان شێوە بشۆردرێت بەبێ ئەوە سابونێکی زۆر بەکار بهێنرێت لە ژورێکی گەرمدا، لەماوەی چەند دەقیقەیەکی کەمدا منداڵەکە پاك بکرێتەوە. دواتریش بەپێی وەرزی زستان و هاوین، لە زستاندا شۆردنی کەمتری دەوێت وەك لە هاوین. (گۆڤاری خێزان).



"ئەی دایك لەخوا غافڵ مەبە و
منداڵەکەت لە شیری خۆت بێبەش مەکە"

## ڕووداوێکی دڵتەزێن و جێگای پەند لێوەرگرتن

دادوەر (ئاسۆ سەردار ڕەشید) کە یەکێکە لە حاکمە چالاك و بەڕێز و شارەزاکانی بواری شەریعەت و یاسا، وە کەسێکی بە ویژدان و مسوڵمانی چاکە. ئەم بەسەرهاتەمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەڵێ: کۆتایی مانگی یانزەی، ساڵی (٢٠١٠) بوو، هاوڵاتیەك هاتەدادگا و داوای بینینی منی کرد، دوای ئەوەی ڕێم پێدا، هاتە

ژوورەوە.. بەڵام پێش ئەوەی قسە بکات دەستی کرد بە گریان و بە شێوەیەکی پچڕ پچڕ کەوتە قسە کردن.. بەڵام لە ڕاستیدا هیچی لێتێنەگەیشتم، داوام لێکرد هێور بێتەوە و واز لە گریان بێنێت بۆ ئەوەی لێی تێبگەم. دوای ئەوەی هێمن بووەوە دەستی کرد بە گێڕانەوەی چیرۆکەکەی ( بابڵێین ناهەمواریەکەی) کە بەمجۆرەی خوارەوە بوو، وەك خۆی دەڵێت:

من گەنجێکی (٢٢) ساڵم و دەرچووی ناوەندیم و فەرمانبەرم لە (..) پێش (٣) ساڵ کچێکم هێنا کە لە ماڵی مامم بینیم چونکە ماڵیان دراوسێیان بوو، ئەویش فەرمانبەرە لە بەڕێوبەرایەتی (..) سەرەتا ژیانی هاوسەریمان زۆر بەختیاربوو، ژنەکەم کەسێکی جوان و ڕۆشنبیرە و زۆر گرنگی پێدەدام، لەسەر داوای ئەو پرۆژەی منداڵبوونمان دوا خست بۆ ماوەی (٢) ساڵ. بۆ ئەوەی ئەو ماوەیە چێژ لە ژیان وەربگرین، ساڵێك لەمەوبەر ڕازی بوو کە منداڵمان هەبێت، منیش زۆرم پێ خۆشبوو..

بەڵام ئەم شادیەم زۆری نەخایاند هەستمکرد ژنەکەم گۆڕاوە بەرامبەرم و هەمیشە گلەیی دەکات و دەبۆڵێنێ و بە قسە و هەڵسوکەوتەکانم نارەحەت و نارازیە، کە پێشتریش هەر هەمان ووشە و هەڵسوکەوتم هەبوو کەچی پێی ناخۆش نەبوو، هەندێ لەکەس و برادەرەکانم پێیان وابوو ئەم هەڵوێستە لە ئەنجامی سك پڕیەکەوەیەتی، منیش زۆر گرنگیم پێدەدا و ئاگاداری دەبووم، وە

هەمیشە دڵنەوایم دەکرد، بەڵام مامەڵەکردنی لەگەڵم ڕۆژ بە ڕۆژ خراپتر دەبوو.. ڕۆژێك بەو پەڕی ڕاشکاویەوە داوایکرد کە تەڵاقی بدەم! زۆر سەرم سوڕما..

بەڵام زۆر بەڕاشکاوی وتی: کە ئێستا وەکو جاران منی خۆش ناوێت و هیچ هەست و سۆزێکی بۆم نەماوە، بە هەموو ڕێگەیەك بڕیارمدا لەو بڕیارە پەشیمانی بکەمەوە و هانام برد بۆ کەسوکاری و پاڕامەوە لێیان، بەڵام بێ سوود بوو.. کاتێك من ڕەتم کردەوە تەڵاقی بدەم، سەردانی دادگای کرد و داوای تەڵاقی خولعی کرد، بە پێی یاسای تازە کە مافی تەڵاق دەدات بە ژن بەرامبەر بە وازهێنان لە مافە شەرعیەکانی تەنانەت ئەگەر مێردەکەشی ڕازی نەبێت.. بەم پێیە تەڵاقەکە ڕوویدا دوای ئەمە بۆ دوو هەفتە، ژنەکەم دوانەیەکی بوو، هەردووکیان کچ بوون.

دوای لەدایك بوونیان بەهەفتەیەك هەردوو کچەکەی ناردەوە بۆ ماڵی باوکم، لە ئافرەتێکی خزمیەوە زانیم کە هۆکاری وازهێنانی لەمن ئەوە بوو کە ئارەزووی ئەوەی هەیە شوو بکات بە کوڕی پورێکی خۆی کە لە وڵاتی ئەورووپا دائەنیشێ، ئەویش بەڵێنی ئەوەی داوەتێ کە هەرکات مانگەکانی (عیددە)ی تەواو بوو ئەبیات بۆ دەرەوەی وڵات و وە ئێستا خەریکی دەرهێنانی پاسپۆرتە.. من ناتوانم و نامەوێ ڕێی لێبگرم و بیگێڕمەوە بۆ لای خۆم، چونکە ئێستا ئەوە ژیانی تایبەتی خۆیەتی و ئازادە، بەڵام کێشەی من لەو

دوو منداڵە ساوایە دایە، هەرچی جۆری شیر هەیە لە بازاڕدا بەکارم هێناوە، تەنانەت شیری مەڕ و بزنیشم بەکار هێنا، هەر پێی ناکەوێت!!

سەردانی زۆربەی دکتۆرەکانی شاری سلێمانیم کردووە، هەموویان ڕایان وایە کە شیری دایکیان باشترین و گونجاوترین شیرە، زۆر پاڕامەوە لەخۆی و کەس و کاری کە دوو منداڵەکەی بەخێو بکات لە پێناو ژیانیاندا، بەڵام وەڵامەکەی ئەوەبوو کە نایەوێت پابەند بێت پێیانەوە، ئێستا دوو منداڵە کچەکەم لە نەخۆشخانەن و بە موغەزیی دەژین!! ئەم باوکە داماوە پرسی: کە ئایا یاسا ئەتوانێ هیچی بۆ بکات؟! ئایا دایك ناچار دەکرێ کە منداڵەکانی بەخێو بکات؟! لەم بارەدا حوکمی شەرعی ئیسلام چیە؟!

پێش وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارە، من سەرم سوڕماوە لە هەڵوێستی ئەم دایکە و دڵڕەقیەکەی بەرامبەر نزیکترین کەسی کە منداڵەکانیەتی، کە پێیان ئەوترێت (جەرگ)، مێژووی نەتەوەی کورد، سەدان بەڵکو هەزاران دایکمان بەبیر دێنێتەوە کە بەرگەی هەموو جۆرەکانی ئەشکەنجە و ئاستەنگ و توند و تیژی مێردیان گرتووە لەپێناو منداڵەکانیاندا، ئەم دایکە چۆن قبوڵی دەکات منداڵەکانی خۆی جێبهێڵێت لە پێناو خۆشی و ڕابواردنی خۆیدا؟! ئەمە بەڕاستی لوتکەی خۆپەرستیە، ئەی کوڕی پورەکەی چۆن

متمانەی پێ دەکات؟! ئایا ئەگەری ئەوە نیە کە سبەینێ ئەمیش و منداڵەکانی ئەمیش جێبێڵێت؟!

حاکم ئاسۆ دەڵێ: سەبارەت بە پرسیاری ئەم هاوڵاتیە من دڵنیای دەکەمەوە کە چ شەرعی ئیسلام، چ یاسای باری کەسێتی، دایك ناچار ئەکەن بە بەخێوکردنی منداڵەکەی، شەریعەتی ئیسلامی ئەوەی گرتۆتە ئەستۆ کە منداڵ مافی بەخێوکردنی هەیە لەگەڵ لە دایك بوونیدا، تا گەشەی جەستەیی و توانا پەیدا کردنی ئەوەی کە پێویستی بە شیری دایکی نەبێ..

زانایانی کۆمەڵناسی و پزیشکی فەقیهانی مسوڵمان کۆك و هاوڕان لەسەر ئەوەی کەدایك نزیکترین کەسی کورپەکەیەتی و شیرەکەی باشترین خۆراکە بۆی و لەگەڵ هەموو بار و قۆناغەکانی گەشەیدا ئەگونجێ.. مەزهەبە ئیسلامیەکان کۆکن لەسەر ئەوەی کە دەبێ دایك ناچار بکرێت بە گۆش کردنی منداڵەکەی ئەگەر هیچ شیرێکی تری پێ نەئەکەوت، چ سروشتی بێت یان دەستکرد.. ئەمەش لەپێناو پارێزگاری لە ژیانی و لە پێناو تەندروستی منداڵەکەدا.

بەڵام ئەگەر توانرا منداڵەکە بەخێو بکرێ بە شیری تر بەبێ ئەوەی زیانی پێ بگەیەنێت ئەوا دایکەکە ناچار ناکرێ لەم بارەدا، چونکە گۆشکردنی منداڵ لەسەر نەفەقەیە و نەفەقەش لەسەر باوکە نەك دایك. پێویستە لەسەر باوك بەخێوکەرێك دابین بکات بۆ

منداڵەکە یان شیری قوتوی بۆ دابین بکات. حوکمی یاساش هەر هەمان شتە، ماددەی (٥٥) لە یاسای باری کەسێتی تێیدا هاتووە کە: (پێویستە لەسەر دایك کۆرپەکەی گۆش بکات تەنها لەو بارە نەخۆشیانەدا نەبێت کە ڕێگرن لێی).

مەبەست لە بارە نەخۆشیەکان ئەوەیە کە ئەگەر شیری دایکەکە ببێتە هۆی توش کردنی منداڵەکە بە نەخۆشی، یان بەخشینی زیانێك بە دایکەکە (بەڵام شەریعەتی ئیسلام دایکەکە ناچار دەکات کە منداڵەکەی گۆش بکات، تەنانەت ئەگەر زیان بە دایکەکەش بگات). بەهۆی ئەوەی کە زیانی دایك کەمترە لەو زیانەی کە بەر منداڵ دەکەوێت ئەگەر دایکی جێبێڵێت و بەخێوی نەکات..

جەنابی حاکم دەڵێت: ئەو هاوڵاتیەم تێگەیاند کە ئەتوانێت سەردانی دادگای باری کەسێتی بکات و داوا بکات بە دەرکردنی فەرمانێك بە ناچار کردنی ژنەکەی پێشووی، بەبەخێو کردنی دوو کچەکەی تا ئەتوانن دەستبەرداری خواردنی شیری دایکیان ببن.. تەنانەت قازی دەتوانێ ژنەکە ناچار بکات سەفەر نەکات لەبەر هەمان هۆ.. بەڵێ ئەم ڕووداوەمان لێرەدا باسکرد چونکە زۆر دایك هەن واز لە گۆش کردنی کۆرپەکانیان دێنن، کاتێك تەڵاق لە نێوانیان و مێردەکانیاندا ڕوودەدات، جا بە ئارەزووی خۆیان بێت، یان بەزۆری کەس و کاریان بێت..

من ئەڵێم: باوکەکە چەندە خراپیش بێت، منداڵە داماوەکە تاوان و گوناهی چیە؟! تەنانەت ئەگەر ئێمە ئاین و یاساشمان خستە لاوە، خۆ شتێك هەیە پێی دەڵێن ویژدان و بنەمای مرۆڤایەتی، هەمووشتان لەگەڵمدا کۆکن لەسەر ئەوەی ئەو باوك و دایکەی منداڵەکەی فەرامۆش بکات و گوێی پێ نەدات، ئەوا هیچ بەشێکی ئاین و ڕەوشتی نیە و مۆڵەتی درێژخایەنی بێکۆتای داوە بە ویژدانی!! (گۆڤاری نیگا، ژ: ١١٣، ل٤.)

بەڵێ ئەمە سەرەنجامی ئەو مرۆڤەیە کە لەخوا غافڵە و توشی داوی شەیتان دەبێ، بەڵام سەرنج بدەن چۆن پەروەردگار، تۆڵەی لێدەکاتەوە و کارێکی وادەکات کە هەموو شیرەکان - ئاژەڵی و دەستکرد - لەو دوو منداڵە کچە بێ گوناهە قەدەغە دەکات، بۆئەوەی بەناچاری منداڵەکانی بە شیری خۆی بەخێو بکات و خەیاڵە پوچە بەتاڵەکەی چونە هەندەرانی لێ تێك بدات!! ئەمەش هەر ئەو پەروەردگارە کردی، کەکاتی خۆی (موسا)ی مەلۆتکەی قەدەغەکرد کە مەمکی هیچ ئافرەتێکی شیردەر بمژێ. تەنها دایکی خۆی نەبێت!! دەی لەخوا غافڵ مەبە..



## وانەی سێهەم:

# لەخوا غافڵ مەبە و
# ستەم مەکە، تەنانەت
# لە ئاژەڵ و زیندەوەرانیش

# وانەی سێهەم

## بابەت: لەخوا غافڵ مەبە و ستەم مەکە، تەنانەت لە ئاژەڵ و زیندەوەرانیش

۞ قالَ اللّهُ سُبحانَهُ وَتَعالى: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةً لِّلۡعَٰلَمِينَ ۝١٠٧﴾ الأنبياء.

۞ وَ قالَ اللّهُ سُبْحانَهُ و تَعالى: ﴿وَٱلۡأَنۡعَٰمَ خَلَقَهَاۗ لَكُمۡ فِيهَا دِفۡءٞ وَمَنَٰفِعُ وَمِنۡهَا تَأۡكُلُونَ ۝٥ وَلَكُمۡ فِيهَا جَمَالٌ حِينَ تُرِيحُونَ وَحِينَ تَسۡرَحُونَ ۝٦﴾ النحل.

۞ عَنْ عائِشَةَ، قالَتْ: كانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَضَعُ لِلْهِرَّةِ الإِناءَ فتشْرَبُ، ثُمَّ يَتَوَضَّأُ بِفَضْلِها) رَواهُ الطَّبراني في الأَوْسَط: (٧٩٤٩)، و صحَّحَهُ الأَلْباني في صَحيحِ الجامع: (٤٩٥٨).

۞ مَرَّ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَلى قَوْمٍ و هُمْ وُقوفٌ عَلى دَوابَّ لَهُمْ، وَ رواحِلَ..

۞ فَقالَ لَهُمْ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (اركبوها سالِمَةً، و دَعُوها سالِمَة، وَلا تَتَّخذوها كراسِيَّ لِأَحاديثِكُمْ في الطُّرُقِ وَ الْأَسْواقِ،

فَرُبَّ مَرْكوُبَةٍ خَيْرٌ مِنْ راكِبِها هِيَ أَكْثَرُ ذِكْراً لِلّهِ تَعالى مِنْهُ) رَواهُ أَحمد: (١٥٢١٩) و صَحَّحَهُ الألْباني في صَحيحِ الجامِع: (٩٠٨).

۞ قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عُذِّبَتْ امْرَأَةٌ في هِرَّةٍ سَجَنَتْها حَتَّى ماتَتْ، فَدَخَلَتْ فيها النّارَ، لا هِيَ أَطْعَمَتْها وَ سَقَتْها إِذ حبسَتْها، ولا هي تركتْها تَأْكُلُ مِنْ خَشاشِ الأَرْضِ). رَواهُ البُخاريُّ: (٣٤٨٢) وَ مُسْلِمْ: (٢٢٤٢).

۞ عَنْ جابِرِ بنِ عَبْدِالله، أَنَّ النَبِيَّ ﷺ مَرَّ عَلَيْهِ حِمارٌ قَدْ وسمَ في وَجْهِهِ، فَقالَ: لَعَنَ اللهُ الَّذي وَسَمَهُ). رَواهُ مُسْلِمْ: (٢١١٧).

۞ عَنْ إبْنِ عَبّاسٍ، أَنَّ رَجُلاً أَضْجَعَ شاةً يُريدُ أَنْ يَذبَحَها وَ هُوَ يحدُّ شفرته، فَقالَ النَبِيُّ ﷺ: (أَتُريدُ أَنْ تَميتَها موتاتٍ؟! هَلا حَدَدْتَ شَفْرَتَكَ قَبْلَ أَنْ تَضْجِعَها). رَواهُ الحاكم: (٧٥٦٣). وَ صَحَّحَهُ الأَلْباني في الصَّحيحة: (٢٤).

## سەرچاوەکان:


١) كَيْفَ عامَلَهُمْ محمد ﷺ محمد صالح المنجد، ص٨٤١، ط: ١، ٢٠١٤، مكتَبة العبيكان.

٢) بەختەوەر بژی، نوسینی: د. محمد عبدالرحمان العريفی، وەرگێڕانی: هێمن محمد علی. ل٥٩، چاپی یەکەم، نارین.

٣) گۆڤاری: (چرای ڕووناکی) ژمارە: ٣٥، ل٣٨. لە نوسینی: حاجی فاتح دارەبەنی.

٤) وانەکانی بەختەوەری، حاجی کاروان، ب٢، ل٧٢.

٥) ئەسرینەکانی سەدەی بیست و یەك، ئاوات أبوبکر أحمد، ل٧٤.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العالَمين، وَ الصَّلاةُ وَ السَّلامُ عَلى سَيِّدِنا محمد وَ على آلهِ وَ صَحْبِهِ أجْمَعينَ:

خواناسانی بەڕێز: زوڵم، ستەم، ناڕەوایی، ناحەقی کردن، چەوساندنەوە، خۆفەرز کردن، ڕەنگە لە ناخی زۆربەی مرۆڤەکاندا هەبێ، مرۆڤ ئەگەر لەخوای پەروەردگاری خۆی غافڵ بوو، بیری خوای نەبوو، لە کاتی دەسەڵات و دەست ڕۆشتنندا، لە کاتی لەش ساغی و گەنجی و سەرکەشی و هەبوونی دا، حەز بە خۆ دەرخستن و خۆنواندن دەکات و لەم کاتەدا هێزی خوایی بەسەر بێ دەسەڵاتەکانی ژێر دەستی دا تاقیدەکاتەوە.

ئاینی ئیسلامیش کە ئاینی دادپەروەری و چەسپاندنی عەدالەتە لە کۆمەڵگە و ژیان و ژینگەدا، لە ڕوانگەی ئەوەی کە یەکێك لە ناوە جوانەکانی خوای پەروەردگار (العَدْلَ)، دادپەروەری تەواو تەنها لای (الله)یە، خوای گەورە (العَدْلَ) نەك هەر (العادِلَ). جا خوای پەروەردگار دەیەوێت ئەم مرۆڤایەتیە ستەم لەیەك نەکات. وە پێغەمبەران و کتێبە ئاسمانیەکانی هەر بۆ ئەوە ناردوە: ﴿لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلۡقِسۡطِ..﴾

بەڕێزان: زۆرجار کە مرۆڤ ستەم ناکات، کە زوڵم ناکات لە کەسێك، ڕەنگە لێی بترسێ، بڵێ فلان کەس بەرەو ڕووم دەبێتەوە،

هێزی هەیە، قەوم و هۆزی هەیە پشتیوانی لێدەکەن. جاری واهەیە مرۆڤ ستەم ناکات لە ترسی ئەوەی ڕووبەڕوی یاسا دەبێتەوە و سزا وەردەگرێ.

بەڵام ئەمانە هیچیان نابنە هۆکاری دروستکردنی مرۆڤێکی حەق خوازی، سەلامەتی، دوور لە ئاژاوە و پشێوی، بەڵکو ئەوەی مرۆڤ لە ستەمکاری دەپارێزێ بریتیە لەوەی کە: (لەخوا غافڵ نەبێت). بەردەوام خوای پەروەردگاری خۆی لەیاد بێت..

جا ئیسلام هاتووە لە چیەوە دەستپێدەکات؟ لەوەوە دەست پێدەکات کە فەرمان بە مرۆڤی موسڵمان دەکات، دەفەرمووێت: ئەی مرۆڤ ستەم لە شتێك مەکە کە غەیری (الله) هیچ کەس نیە دیفاعی لێبکات. کەس نیە لەسەری بکاتەوە و پشتیوانی لێبکات و تۆڵەی بۆ بسێنێ، ئەو شتەش کە غەیری خوا کەس نیە دیفاعی لێبکات بریتیە لە (زیندەوەرەکان). باڵندەیەك، چۆلەکەیەك، کۆترێك، ئاژەڵێك، مێروولەیەك، کرمێکی بێ زیانی وورد، کە غەیری خوای پەروەردگار کەس نیە دیفاعی لێبکات.

ئیسلام دەفەرمووێ: ئەی مرۆڤ تۆ لێرەوە فێرببە کە ستەم نەکەی، وەرە با بەزەیت بە ئەمەدا بێتەوە، لەو کاتەوەی کە لە ژێر دەستت دایە، دەتوانی ئازاری بدەی، بیکوژی بەڵام تۆ لەبەر خوا دەستی لێ دەپارێزی، ئازاری نادەی، نایکوژی، ئالەم کاتەدا کە تۆ خۆت پاراست لەستەم و ئازاردانی زیندەوەرێك، وات لێدێت

بەزەییت بەبەندەکانی خودا دێتەوە، چونکە لەو ناترسی تۆڵەت لێبکاتەوە، نەفست پێت دەڵێ ئەو مێرولەیە بکوژە، بەڵام تۆ نایکوژی، کەواتە تۆ لەخوا غافڵ نیت.



## پێغەمبەری خوا ﷺ فێرمان دەکات بەبەزیی بین لەگەڵ گیانداران

### نمونەی یەکەم:

خاتوو عائیشە دەفەرمووێت: (كانَ رَسُولُ الله ﷺ يَضَعُ لِلْهِرَّةِ الإناءَ فَتَشْرَبُ، ثُمَّ يَتَوَضَّأُ بِفَضْلِها). رَواهُ الطَّبراني وفي الأوْسَط: (٧٩٤٩)، و صَحَّحَهُ الألْباني في صَحيح الجامع: (٤٩٥٨).

واتە: ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ قاپێ ئاوی دانابوو بۆئەوەی دەستنوێژی پێ بشوات..

بەڵێ لەو کاتەدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ خەریك بوو دەست بخاتە ئاوەکەوە و دەستنوێژ بگرێت، پشیلەیەك لەولاوە بەمیاوە میاو هات.. پێغەمبەری دڵسۆز و دڵ پڕ لە ڕەحمەت هەستی کرد ئەم پشیلەیە تینویەتی، چونکە زۆر سەرنجی ئاوەکەی دەدا، لەم کاتەدا پێغەمبەری میهرەبان وازی لە دەستنوێژەکەی هێنا و قاپەکەی لارکردەوە بۆ پشیلەکە، پشیلەکەش چوو دەمی بە

ئاوەکەوە ناو دەستی کرد بە ئاو خواردنەوە هەتا تێری خواردەوە و پاشان دوورکەوتەوە.. دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ بەبەرماوەی پشیلەکە دەستنوێژی شت!

بەڵێ پێغەمبەری خۆشەویستمان، ئیمامی هەموو پێغەمبەران ئاوا دینداری دەکرد، لە مەنجەڵە ئاوێکی بچوکدا کە دوو تاسێ لیتر ئاوی تێدابوە دەستنوێژی گرتووە، زۆر بە پاك و خاوێنی و ئاوا دینەکەی بە ئاسانی بە ئێمە گەیاندوە، نەك وەکو هەندێ موسڵمانی ناحاڵی و غافڵ لە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ کە بەتانکیەك ئاو دەستنوێژی بۆ ناگیرێ و، هەمیشە وەسوەسەی هەیە و بۆتە مایەی ئازار و ناڕەحەتی بۆ خۆی و بۆ ئەوانەی لەگەڵی دەژین.

لێرەدا، لەگەڵ دڵ نەرمی و سۆز و بەزەیی پێغەمبەری خوا ﷺ بەرامبەر بەو پشیلەیە کەکەسی نەبوو غەیری خوا نەبێ. ئیعجازێکی گەورەی زانستیشی پێ گەیاندین کە: دەم و لیکی پشیلە ـ بە پێچەوانەی سەگەوە ـ هیچ میکرۆبێکی تێدانیە. چونکە پشیلە ـ بە پێچەوانەی هەموو زیندەوەرەکانی ترەوە ـ هیچ دڵۆپە ئاوێکی ناو دەمی لەکاتی ئاو خواردنەوەدا، ناکەوێتە ناو قاپی ئاو خواردنەکەوە.. بۆ زانیاری زیاتر لەسەر پشیلە و ئەم ئیعجازە زانستیە، تەماشای زنجیرە باسی (هذا خَلْقُ الله ـ ئەمە دروستکراوی خوایە ـ باسی پشیلە) بکە بەشێوەی وتار. إِنْ شاءَ الله.

بەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ فێری کردین ئاڵەوێوە بەزەیی دروست دەبێ، کە تۆ بەزەییت بە پشیلەیەکی تینودا هاتەوە، تۆ بڵێی، هێندە دڵ ڕەق بی بەزەیت بە مرۆڤێکی تینوو برسی و نەخۆش و هەژاردا نەیەتەوە؟! بێگومان لە خوا غافڵ نابی و دەبی بە ڕەحمەت و نابی بە زەحمەت. بێگومان نابی بە دڕندە و هەرگیز نازاری مرۆڤەکان نادەی..



## نمونەی دووەم:

عَنْ إِبْنِ عَبّاسٍ، أَنَّ رَجُلاً أَضْجَعَ شاةً يُرِيدُ أَنْ يَذبَحَها وَ هُوَ يحدُّ شفرته، فَقالَ النَبِيُّ ﷺ: (أَتُريدُ أَنْ تَميتَها موتاتٍ؟! هَلا حددْتَ شَفْرَتَكَ قَبْلَ أَنْ تَضْجِعَها). رَواهُ الحاكم: (٧٥٦٣). وَ صَحَّحَهُ الألباني في الصَّحيحة: (٢٤).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی بینی کە مەڕێکی پاڵخستبوو، قاچی خستبووە سەر ملی مەڕەکە، لەبەرچاوی مەڕەکەدا چەقۆیەکی قەصابی گەورەی بەدەستەوە بوو، بە هەسان تیژی دەکرد و مەڕەکە سەرنجی دەستی قەصابەکە و چەقۆکەی دەدا، لەم کاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ بەلایدا تێپەڕی و کە ئەم دیمەنەی بینی زۆر پێی تورە بوو.. "پێغەمبەری خوا هەمیشە دەم

بە خەندە و هێمن و نەرم و نیان بوو، بەڵام کە ستەمی دەبینی توڕە دەبوو، ستەمکاری ئازاردەری ئاگادار دەکردەوە".

بەڵێ ڕووی کردە سەربڕی مەڕەکە و فەرمووی: ئەوە بۆچی دەتەوێ ئەم مەڕە بەسەزمانە ئاوا چەند جار لەسەر یەك بکوژی و بە زەلیلی گیانی بکێشی؟! (دیارە قەصابەکە وتوویەتی: کوا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کاری وام کردووە. من تەنها یەك جار سەری دەبڕم!!).

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دەبوایە پێش ئەوەی مەڕەکە بێنی بۆ سەر بڕین و پاڵی بخەی، چەقۆکەت تیژ بکردایە، ئەی نابینی ئەو مەڕە هەژارە بێ زمانە، چۆن بە ترسەوە سەیرت دەکات و چرکە بە چرکە چاوەڕێی مەرگە و، هەموو کاتێکی ژێر قاچتی تا سەر بڕینی بۆی مردنێکە؟! ئەی نازانی ئەوە ستەمە؟ دڵنیابە خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا لەسەر ئەم کارە ناڕەوایەشت لێپرسینەوەت لەگەڵ دەکات.. سبحان الله لە گەورەیی ئەم ئیسلامە، چۆن مرۆڤ فێردەکرێ کە بەبەزەیی بێ بەرامبەر بە مەڕێك، ڕاستە خوای گەورە بۆ سوودی تۆی دروست کردووە، ڕاستە چەقۆی لەسەرە و سەر بڕینی شەرعی هەیە بۆی، بەڵام نابێت سنور ببەزێنی، نابێ چەند جارێك ئازاری بدەی و بیمرێنی، چەقۆی لەبەر چاو تیژ بکەی!!

(لێرەدا با ئەوانەی ئیسلام بە بکوژ و سەر بڕی مرۆڤەکان دەزانن سەرنجی ئەم فەرموودەیە بدەن و پاشان خۆیان بڕیار بدەن کە: ئایا ئیسلام میهرەبانی و سۆزە، یان دڵڕەقی و مرۆڤ کوژی و سەربڕین؟! وە ئەوانەش کە بەناوی ئیسلامەوە شمشێر لە ملی دیل و خەڵکی بێ تاوان دەدەن و سەری دەبڕن، بزانن ئەم ستەمە لەکوێی دینی خوادا جێی دەبێتەوە؟! ئیسلامێك ڕازی نەبێ لەبەرچاویا مەڕێك لەکاتی سەر بڕیندا چەقۆی لەبەرچاو تیژبکرێ. ئەی چۆن ڕێگا دەدات ملی مرۆڤ ببڕدرێ؟!).



## نمونەی سێیەم:

فەرموودەیەك: (مَرَّ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَلى قَوْمٍ و هُمْ وُقُوفٌ عَلى دوابَّ لَهُمْ، وَ رَواحِلَ. فَقالَ لَهُمْ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (اركبوها سالِمَةً، وَ دْعُوها سالِمَةً، وَلا تَتَّخذوها كُراسِيَّ لِأَحاديثِكُمْ في الطُّرُقِ و الْأَسْواقِ، فَرُبَّ مَرْكوُبَةٍ خَيْرٌ مِنْ راكِبِها هِيَ أَكْثَرُ ذِكْراً للّهِ تَعالى مِنْهُ) رَواهُ أحمد: (١٥٢١٩) و صَحَّحَهُ الألْباني في صَحيح الجامع: (٩٠٨).

واتە: جارێكیان پێغەمبەری خوا ﷺ كۆمەڵە كەسێكی بینی كەلەسەر پشتی وشترەكانیان بوون و لەڕێگادا وەستابوون و قسە و

باس و گفتوگۆیان دەكرد، پێغەمبەری خەمخۆری هەموان، لە ئاستی ئەمەشدا بێدەنگ نەبوو، بۆیە ڕووی تێكردن و فەرمووی:

تكایە ئاوا مەكەن مافی ئەو ووشترە بدەن، بەجوانی سواری پشتی ببن و بە جوانی لێی دابەزن و ئازاری مەدەن، ووشترەكانتان وەكو كورسی دانیشتن بەكارمەهێنن و گفتوگۆ و قسەی لەسەر بكەن، لە كاتێكا لە سواری پشتی ووشترەكانتانن و توشی هاوڕێ و دۆستان بوون، لە ڕێگا و بان و لە بازاڕدا، مەوەستن و هەر لەسەر پشتی ئەو ئاژەڵە بێ زمانەوە قسە مەكەن.. چونكە ئەو ئاژەڵە كورسی دانیشتن نیە و بۆئەوە دروست نەكراوە و دروست نیە لەسەر پشتیان بن، تەنها كاتی ڕۆشتنی پێویست نەبێت، پاشان كە پێویستیەكەتان تەواو بوو، دەبێت دابەزن، بۆئەوەی ئەوانیش پشوویەك بدەن!

پاشان فەرمووی: ئای چەند ئاژەڵی سواری هەیە كەكەسێك لەسەر پشتیەتی، بەڵام ئەو زۆر لەو كەسە ـ سوارە ـ چاكترە، چونكە ئەو سوارە یادی خوا ناكات و لەخوا غافڵە، بەڵام ئەو ئاژەڵە یاد و تەسبیحاتی پەروەردگاری دەكات و لەخوا غافڵ نیە و لەو سیستەم و ڕێبازە لانادات، كە خوای دروستكەری بۆی داناوە!!

ئاماژەیەك: پەروەردگار ڕێزی لە مرۆڤ گرتووە، بەڵام ئەمە دەرگای ئەوە بەڕووی مرۆڤەکاندا واڵا ناکات کە سوکایەتی بە دروستکراوانی تر بکەن و بیان چەوسێننەوە.

## ئاگاداربە پەروەردگار تۆڵەی دروستکراوەکانی دەکاتەوە

بەڵێ ئەو کەسانەی کە لەم ژیانی دونیایەدا لەخوا غافڵن و ستەم لە ئاژەڵ و زیندەوەران دەکەن، ئەوا دڵنیابن خوای گەورە هەر لە دنیادا پێش قیامەت تۆڵەیان لێدەکاتەوە، چونکە ئەو مرۆڤە لە خوا غافڵە ستەم و زوڵمی کرد لە شتێك کە غەیری ـ الله ـ هیچ کەس نیە بەرگری لێبکات، ئەمیش خوای لەبیرکرد، دەی خوای گەورە هەر لە دنیادا تۆڵەکەی نیشان دەدات.

## بەستەمێك.. توشی شێرپەنجەی لێو بوو! ‹بەسەرهات›

پێش شۆڕشی (١٩٥٨) بووە، ئەو کاتە سات و سەردەمی ئاغا و دەرەبەگ بووە، لەیەکێك لە گوندەکانی سەر بە پارێزگای هەولێر، ئاغایەك لەگەڵ کابرایەکی جوتیاری گوندەکەیان لێیان دەبێتە کێشە و نیزاع و ناخۆشی، خەزوری ئەم ئاغایە کە ئاغای گوندێکی تر بووە لە هەمان ناوچە، بۆ تۆڵەی زاوایەکەی هەڵدەستێ دوو پیاوی خۆی دەنێرێتە سەر ماڵە جوتیارەکە بۆئەوەی دەستێکی

لێبوەشێنن، لەم ناوەشدا هەم زاواکەی ناکەوێتە بەرشکی خاوەن ماڵ و پرسیار و وەڵامی پۆلیس..

ئەم دوو پیاوی ئاغایە دوو هێستری ئەو ماڵە جوتیارە دەدزن و لە گوندەکە دوور دەکەونەوە لە شیوێکدا، دوو گوللە لەسەری هەردوو هێسترەکە دەدەن و دەیان کوژن، پێش ئەوەی بە تەواوەتی گیانیان دەرچێ یەکێکیان چەقۆیەك لە گیرفانی دەردێنێ و لچ و لێوی هەردوو هێسترەکە لێدەکاتەوە ئەمجا پێدەکەنێ و دەڵێ دەبا کە خاوەنەکەی، جوتیاری شڕۆڵ کە هەموو سەرمایەکەی ئەو دوو هێسترە بوون. هەم باری پێدەبردن بۆ ئاش و کاروان. هەم جوت و گێرەی پێدەکردن و هیچی نەما، با کەهاتە سەریان تەماشایان بکات کە پێدەکەنن!!

بەڵێ ئەم ستەمە گەورەی بۆ ئەتك پێکردن و سوکایەتی کرد... ڕۆژگار هات و ڕۆشت پاش چل ساڵ، ئەو پیاوەی لچ و لێوی وڵاخەکانی بڕی، تووشی سەرەتانی لێوی بوو، چی دکتۆری هەولێر و بەغدا و کەرکوك بوو کردی، تێکڕای دکتۆرەکان پێیان وت: هیچ چارەیەکت نیە تەنها ئەوە نەبێت کە دەبێ لچ و لێوی ببڕن!! ئەو کەسەی ئەم بەسەرهاتە دەگێڕێتەوە دەڵێ: سوێند بەخوای تۆڵە ئەستێن، چومەلای ئەو پیاوە کە لچ و لێویان بڕی بوو، بەجامەدانی دەم و لێوی خۆی بەستبوو، چونکە ددانی سەرەوە و خوارەوەی

بەدەرەوەبوون و دیمەنێکی زۆر ناشرین و سامناکی هەبوو، بەڵێ چی بەو دوو ئێسترە بەسەزمانە کرد، ئاوای پێ کرایەوە.

کێ تۆڵەی لێ کردەوە؟! (الله) سُبْحانَهُ وَ تَعالى، دەی لە (الله) غافڵ مەبە چونکە ئەم گەردونە خوای پەروەردگار خۆی بەڕێوەی دەبات و مافی کەس بەسەر کەسەوە ناهێڵێ..



## نمونەی چوارەم:

فەرموودەیەك: (عَنْ جابِرِ بنِ عَبْدالله رضيَ اللهُ عَنهُما قال: انّ النَبِيَّ ﷺ مَرَّ عَلَيْهِ حِمارٌ قَدْ وَسَمَ فِي وَجْهِهِ، فَقالَ: لَعَنَ اللهُ الّذي وَسَمَهُ). رَواهُ مُسْلِمْ: (٢١١٧).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ بینی وا کەرێك (گوێدرێژێك) نێوچەوانی داخ کراوە! پێغەمبەر ﷺ بە بینینی ئەم دیمەنە زۆر توڕە بوو، ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستە لەسەرخۆیەی کە هەرگیز نەفرەتی لە هیچ کەس نەدەکرد، لە بینینی ئەم ستەمە لەم بێ زمانە داماوە، زۆر خەمبار بوو، فەرمووی: خوای پەروەردگار نەفرەت بکات لەو کەسەی کە ئەو گوێدرێژەی داخ کردووە!!

بەڵێ هەموو ئەوانەی کە لە گرتوخانەکاندا مرۆڤەکان بە ئەشکەنجە و ئازاری داخ کردن و کارەبا لێدان و ئوتو بە پشتا

هێنان، ئەشکەنجە دەدەن، ئەوانەن کە سەرەتا گوێدرێژ و ئاژەڵی تریان داخ کرد بە ئاگر و لەخوا نەترسان و سەرەنجام بوونە جەللاد..

## ستەمی لەسەگێك کرد.. دەستیان بڕیەوە! ﴿بەسەرهات﴾

پیاوێك باس دەکات و دەڵێت: چووم بۆ فڕۆکەخانە، لەگەڵ شۆفێرێك سەرکەوتم، لەو کاتەدا دەوروبەری فڕۆکەخانە هەر بەفر بوو، ئەوەی کە بەفر نەبوو سەر جادەکەیە، سەرجادەکەش خۆر لێی ئەدا و دونیاش زۆر سارد بوو، لەو کاتەدا سەگێکی بچکۆلە ئەبینن هاتۆتە سەر جادەکە خەوتووە، چونکە جادەکە خۆر لێی داوە و گەرمترە، کاتێ شۆفێرەکە ئەم سەگە بچکۆلە (توتەڵە سەگە) دەبینێت دەڵێ: سەیر بکە بزانە ئێستا چی لەو سەگە دەکەم!! کەنزیك دەبێتەوە لێی دەبینێت سەگەکە هەردوو پەلی پێشەوەی درێژ کردووە، ئەویش بە هەردوو تایەکەی دەچێتە سەر دەستەکانی یەکسەر هەردوو دەستی ـ پەلی پێشەوەی ـ سەگەکە دەپەڕێ!!

شۆفێری سەرکەشی لەخوا غافڵ پێدەکەنێت و دەڵێ: تەماشا بکە چۆن قاچی ئەو سەگەم لێکردەوە، ئیتر سەگەکەش بەهات و هاوار ڕادەکات، ئەو کەسەی نەفەر بووە لەگەڵ ئەم شۆفێرە دەڵێ: منیش زۆرم پێناخۆش بوو، وتم: باشە بۆچی وا لەم ئاژەڵە بێ زمانە

دەکەیت؟! بەداخەوەم بۆ ئەم کارەت، خۆزگە لەگەڵ تۆ سەرنەکەوتمایە و ئەم سەفەرەم هەر نەکردایە..

ئەڵێ: من ڕۆشتم و سەفەرەکەم کرد و دوو مانگێکم پێچوو، کاتێك هاتمەوە دەنگ و باسێك لەناو خەڵکیدا بڵاوبووبوەوە گوتیان: کوڕە بەسەرهاتێکی سەرسوڕهێنەر ڕوویداوە، لەم ڕۆژانەدا کابرایەکی شۆفێری تەکسی، تایەی پەنچەر بووە، دابەزیوە جەگی لە ئوتومبێلەکە داوە، تاوەکو تایە پەنچەرەکەی لێبکاتەوە، تا دەگاتە لای پەنچەرچیەك، لەو کاتەدا ڕووداوێکی سەرسوڕهێنەر ڕوویداوە، کە ڕووداوی ئاوا زۆر دەگمەن بووە، ئەویش ئەوە بووە، جەگەکە ترازاوە و شۆفێرەکە هەردوو دەستی چۆتە ژێر سەیارەکەوە و تاوەکو گەیاندویانەتە نەخۆشخانە، دەماری خوێن بەری پچڕاوە و دکتۆر بۆی نەدوراوەتەوە و هەردوو قوڵیان لێ کردۆتەوە!!

سبحان الله لە کوێوە دەستی سەگەکەی لێکردەوە، لەهەمان شوێنەوە دەستیان بڕیەوە. دەی هەرگیز لەخوا غافڵ مەبە و ستەم لە هیچ شتێك مەکە، هەتا تەنانەت لە بەچکە سەگێك، چونکە خۆ خراپەیەکی بەرامبەرت نەکردووە، لێی گەڕێ بابە ئازادی بژی.

بەئازاردانی کیسەڵێك.. پشتی نەخۆشکەوت! (بەسەرهات)

پیاوێکی جوتیار دەڵێ: لەخوار قەزای (چوارتا)وە، پەڵەیەك بێستانی کاڵەکم کردبوو، ڕۆژانە سەردانم دەکرد، بێستانەکەم هاتە ئەوەی بەرگی گرت، کاڵەکی شیرن و جوان زۆر دڵخۆشیان کردم، بەلاَم ڕووداوێکی زۆر گران ناڕەحەتی کردم.. ڕۆژانە و کاتی بەیانیان کە دەچومە ناو بێستانەکەم و سەیرم دەکرد زرکە کاڵەکەکان یەکی لایەکی خوراوە و خراپ کراون بڕکەیەك نەبوو، دوان نەبوو، زۆربەی هەرە زۆری وەهایان لێکرابوو.. بەڕاستی زۆر پێی بێتاقەت بووم..

کاتێ لەو سەری بێستانەکەمەوە ویستم بچمە دەرەوە و بچمە لای دراوسێ بێستانەکەم، سەیری بەرپێی خۆم دەکرد، بینیم وا کیسەڵێکی گەورە بەخاوە خاو و خشپە خشپ خەریکە دەچێتە دەرەوە لە بێستانەکەم، لە دڵی خۆمدا وتم: ئای ئەمە تۆی ئەم بێستانە جوانەت ئاوا لێ کردووم، ئێستا بە قوربانت دەبم!! هەر خێرا گرتم و خستمە سەر پشت و بەردێکی گەورەم خستە سەر سکی و ڕووە و ئاسمان بەجێم هێشت.

بەهۆی سەرقاڵیمەوە ئەم کارەم لەبیرچۆوە کە بەهیوا بووم بۆ ڕۆژی دوای ئەوە دوری بخەمەوە، ئیتر دوای ئەوە ڕۆژانە هەستم بە ماندووبوونی زۆر دەکرد دوای سێ چوار ڕۆژ ئازارێکی زۆر ناڕەحەتی کردم و لەتاو ئازاری پشتم هەناسەم بە ئاستەم بۆ

دەردرا، چومە لای جەڕاحی شارەزا بۆی شێلام و دەرمانی کردم. کە ئەم کارە پیشەی جەڕاحەکانە و زۆر چاك مرۆڤ پێی چاك دەبێتەوە و زۆر جاریش بێخود دەبیَ.. منیش یەکێك بوم لەو کەسانەی کە هیچ سودمەند نەبووم، بەم ئازارەوە وەکو مارانگاز، بێتاقەت ئەتلامەوە کارەکانی ڕۆژانەم زۆر بە ناڕەحەت بۆ دەکرا..

ڕۆژ هات و ڕۆژگار تێپەڕی، ڕۆژێکیان بەقەدەری ئیلاهی لەو سەری بێستانەکەم بژارم دەکرد لە پڕ چاوەکانم زەق و ئەبڵەق بوون، خوایە گیان چی ئەبینم، ئەوە چیە؟! من چ کارێکم ئەنجامداوە؟! خوایە گیان.. تۆبەبیَ تۆبە، ئای کە دڕندەم!

لەپڕ پەلامارم دا و بەردەکەی سەر سکیم لابرد، کیسەڵی داماو بەحاڵ نوزەی تیامابوو، بە هێواشی هەناسەی دەدا، زۆر بە نەرم و نیانی خستمە سەر زەوی، ئای کیسەڵی بەسەزمان ئەوە تۆی ماوەی (٢٥) ڕۆژە لەم سوری هەتاوە سەنگە و بەردنراوی، خۆمن هەرگیز لەیادم نەمابوو، ئەم کیسەڵە بەستەزمانە لەسەر گازی پشت ئەوەندە ملی درێژ کردبوو، هەموو گڵی دەوری خۆی، کە ملی گەشتبویە لە برسانا خواردبووی، گەرما و درێژی ڕۆژگار بڕستی لێبڕی بوو، تۆزیَ سەیرم کرد و ئەویش بە زەلیلی سەیری کردم، لەناخەوە بەخۆم وت: خوایە ئەم گوناهە چی بوو کردم؟!

بۆ ئەم تاوانەم ئەنجامدا؟! بەڵام نەمزانی ئەمە ئاکامەکەی دەبێت و بیرم دەچێتەوە، ئێستاش نەچووە بچیَ، وردە وردە

ڕێگەم بۆ خۆشكرد و بەرەو جۆگەلە ئاوی قەراغ بێستانەكەم یارمەتیم دا و بەچاوی بەزەییەوە سەرنجم دەدا..

وەك زمانزان، ئاوڕێكی لێدامەوە و پاش سەرنجێ بەخاوە خاو و خشپە خشپ كەوتەوە ڕۆشتن و بەرەو جۆگەلە ئاوەكە، هێندەی چارەكە سەعاتێك دەمی لەو ئاوە بەرنەدەدا. بێ پسانەوە ئاوی خواردەوە، ئای چەندە ئاوی خواردەوە؟!

بێتاقەت بوم لە سەیركردنی، پاش كەمێ هۆشێكی هاتەوە بەخۆی و سەیرێكی تری كردم، بەهێواشی، بەلارە لار بەرەو ناو گژ و گیا و دڕوو پونگەلانی لێواری جۆگەلەكە خزی و لەچاوانم وون بوو، ئەو ڕۆشت و منیش هێدی هێدی ئازاری پشتم چاك بۆوە، بڕواتان هەبێ تا ئێوارە ئازارم نەما و گەڕامەوە سەر دۆخی جارانم!!

وانەی ئەمجارەمان پێمان دەڵێت: ئەی مرۆڤ لەخوا غافڵ مەبە چونكە خوای گەورە لە گەردونا ستەم لە كەس قبوڵ ناكات، با فێربین ستەم لە مێرولەیەك نەكەن لە چۆلەكەیەك ستەم نەكەین، ئەی چۆن ڕێگە بەخۆمان بدەین ستەم لە مرۆڤێك بكەین؟! دەی با هەمیشە خوای پەروەردگارمان لەیادبێ و لەبەرخوا نەك لە ترسی كەسی تر ستەم نەكەین، بەتایبەت لەو شتانەی كە غەیری خوا كەس نیە پشت و پەنایان بێ.. دە خوای گەورە و میهرەبان خۆت پشت و پەنای هەموو لایەكمان بیت. آمین.

## وانەی چوارەم:

**فریوی شەیتان مەخۆ،**

**دەستکاری میرات مەکە و**

**بە شەرعی بسپێرە..**

## وانەی چوارەم:

## بابەت: فریوی شەیتان مەخۆ، دەستکاری میرات مەکە و بە شەرعی بسپێرە..

۞ **قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وَ تَعالى:** ﴿يَـٰبَنِىٓ ءَادَمَ لَا يَفْتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيْطَـٰنُ كَمَآ أَخْرَجَ أَبَوَيْكُم مِّنَ ٱلْجَنَّةِ﴾ **الأعراف: ٢٧.**

۞ **وَقالَ اللهُ سُبْحانَهُ وَ تَعالى:** ﴿فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ ٱلشَّيْطَـٰنُ قَالَ يَـٰٓـَٔادَمُ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلْخُلْدِ وَمُلْكٍ لَّا يَبْلَىٰ ﴿١٢٠﴾﴾ **طه.**

۞ **قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (إِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الخَيْرِ سَبعينَ سَنَة، فإذا أَوْصَى حافَ في وَصِّيَتِهِ، فَيُخْتَمُ لَهُ بِشَرِّ عَمَلِهِ، فَيَدْخُلُ النَّارَ). رَواهُ إبن احمد و ابْنُ ماجَةَ.**

۞ **وَقالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (إِنَّ اللهَ قَدْ أَعْطى كُلَّ ذي حَقٍّ حَقَّهُ فَلا وَصِيَّةَ لِوارِثٍ) رَواهُ الترمذي، وَ صَحَّحَهُ الألباني في صَحيح الجامع: (٧٥٧٠).**

۞ **وَقالَ رَسُولَ اللهِ ﷺ لَيْسَ لِلْقاتِلِ مِنَ الميراثِ شَئٌ) حَديثٌ صَحيح، رَواهُ أبو داود: (٤٥٦٤).**

۞ **عَنْ أَنَسْ (رَضِى اللهُ عَنْهُ) قالَ: كانوا يكتبُونَ في صُدُورِ وَصاياهُمْ:**

بِسْمِ اللهِ الرَّحمنِ الرَّحيم.

هذا ما أَوْصى بِهِ فُلانُ بْنُ فُلانٍ: يَشْهَدُ أَن لا إله إلّا اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، وَ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَ رَسُولُهُ، وَ أَنَّ السّاعَةَ آتِيَةٌ لا رَيْبَ فيها وَ أَنَّ اللهَ يَبْعَثُ مَنْ في القُبُورِ، وَ أَوصى مَنْ تَرَكَ مِنْ أَهْلِهِ أَنْ يَتَّقوا اللهَ وَ يُصْلِحوا ذاتَ بَينِهِمْ، وَ يُطيعوا اللهَ وَ رَسُولَهُ إنْ كانوا مؤمِنينَ. ثُمَّ يُوصِي بَعْدَ ذالِكَ بِما شاءَ وَ بِما عَلَيْهِ مِنْ حُقوقٍ وَ مَظالِمَ، وَمالَهُ مِنْ حُقُوقٍ وَ مَظالِمَ، وَبِما يُريدُ أَنْ يُوصي بِهِ مِنْ مالِهِ، وَهكَذا..

## سەرچاوەكان:


١) رَوْضَةُ المُتَنَزِّه، شرح بداية المُتَفَقِّهِ، أَيْمَنُ بن علي موسى. ج٢، ص٤٨٩.

٢) خُطَب الشَّيْخ: الدكتور سعيد عبدالعَظيم، ص٢٠١.

٣) چیرۆكەكانی قورئان. نوسینی: عمرو خالد، وەرگێڕانی: سامان خضر علي، ل١٧٧.

٤) گۆڤاری سلێمانی، ژ: ١٤٢، نیسانی ٢٠١٣، ل٢٥.

٥) نوری مینبەر، فاتح مەلا ڕەسول شارستێنی، ب٢، ل٦٧٧.

٦) هەفتەنامەی (ستاندەر) ژمارە: ٦٣، لە ٢٦/١/ ٢٠٠٩، ل١٠.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

**الحَمْدُ للهِ رَبِّ العالَمين، وَ الصَّلاةُ وَ السَّلامُ عَلى سَيِّدِنا محمد وَ على آلِهِ وَ صَحْبِهِ أَجْمَعين:**

بابەتی ئەم وانەیەمان لە زنجیرە باسی (لەخوا غافڵ مەبە)، سەرەتا دەچینە خزمەت ئەو ئایەتە پیرۆزەی کە پەروەردگارمان ئاگادارمان دەکاتەوە و دەفەرمووێ: ﴿يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ لَا يَفۡتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ كَمَآ أَخۡرَجَ أَبَوَيۡكُم مِّنَ ٱلۡجَنَّةِ﴾ **الأعراف: ٢٧.**

واتە: ئەی نەوەکانی ئادەم، ئاگاتان لەخۆتان بێت، شەیتان نەتانخلەتێنێ، هەروەك چۆن باوك و دایکتانی خەڵەتاند و لە بەهەشت هێنانیە دەرەوە..

بەڵێ شەیتان بەچی ئادەم و حەوای هەڵخەڵەتاند، هات لایەنی بێ هێزی (خاڵی زوعفی) ئەوانی گرت، لەبێ هێزترین شوێندا، کە مرۆڤ زۆر لە ئاستیدا لاوازە، کە ئەویش بریتیە لە ژیانی نەمری و زۆر ژیان و بەجێ هێشتنی دونیا و بونی سامانێکی زۆری لەبن نەهاتوو.

بۆیە شەیتان لەو ڕێگەیەوە بۆیان چوو، وە خۆی لێکردن بە ئامۆژگاری کارێکی دڵسۆز، قورئان ئەمەمان بۆ باس دەکات و دەفەرمووێ: ﴿فَوَسۡوَسَ إِلَيۡهِ ٱلشَّيۡطَٰنُ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ هَلۡ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلۡخُلۡدِ وَمُلۡكٖ لَّا يَبۡلَىٰ ﴿١٢٠﴾﴾ طه.

واتە: شەیتان كەوتە فرێدانی وەسوەسە و خەتەرە و خەیاڵ بۆ ئادەم و پێی وت: ئایا حەز دەكەیت درەختی نەمریت نیشان بدەم؟! كە ئەگەر لە بەروبومەكەی بخۆیت، ئەوە دەسەڵاتت بەردەوام دەبێت و موڵك و دەسەڵاتێكت دەبێت كە هەرگیز لەناو ناچێت!! وە هەرگیز مردن یەخەت ناگرێت!!.

بەڵێ سەرەنجام شەیتان قەناعەتی پێكردن و لە درەختەكەیان خوارد و هێڵی سوریان بەزاند، بەمشێوەیە فریوی دان و لەبەهەشت دەری كردن و سەری لێتێكدان.

جا خوای گەورە و میهرەبان دەفەرمووێ: ئەی ئەوانە كە نەوەی ئادەم و حەوان ئاگاتان لەخۆتان بێت، لەخوا غافڵ مەبن و بەوەسوەسە و هاندانی شەیتان بۆتان لە ڕێگەی ماڵی دونیاوە، فریو مەخۆن و ئەو بەشەی پەروەردگار بۆی بڕیار داون پێی ڕازی بن و سنوری خەڵكی مەبەزێنن و ماڵی كەسانی تر بە ناڕەوا مەخۆن..

جائەم وانەیەمان، بریتی نیە لە باسی بازاڕ و كڕین و فرۆشتن، كە مرۆڤ ئەگەر زۆر لەخوا ترس نەبێ، هەر ئەوەندە لەخوا غافڵ بوو، شەیتان دەیخەڵەتێنێ و توشی حەرام خۆری دەكات. بەڵكو بابەتی سەرەكیمان بریتیە لە مەسەلەی میرات، كەدەبێ زۆر ئاگامان لەخۆمان بێ لەدوو حاڵەتدا:

یەکەم: ئێمە وەکو باوك و دایك ستەم لە ڕۆڵە و نەوەکانمان نەکەین، نەیان کەین بە دوژمنی یەکتری، ئەویش بەوەی کەبێیت وەسیەت نامەیەکی دوور و درێژ بنوسێت و هێشتا خۆت لە ژیانداى بڕیار بدەیت دوای مردنم ئەم زەوی و موڵکەم بۆ ئەو کوڕەم و ئەو خانوەم بۆ ئەوەیان و ئەو دوکانەم بۆ ئەمەیان، ئەی ئەم کوڕەیان؟! ئەو بۆخۆی دەوڵەمەند و کاسبە، حەزیشم بە چارە و نەخلاقیشی نیە، هیچی نادەمێ!! ئەی کچەکەت؟! کاکە من بۆیە کچم بەشوو داوە بۆئەوەی زاواکەم بەخێوی بکات!! بۆ ماڵی خۆم بدەم بە کوڕی خەڵکی!!

بەڕاستی ئەمە دەستکاری کردنی شەرعی خوای پەروەردگارە، ئەوە غافڵ بوونە لەخوا ـ پەنا دەگرین بە خوا ـ، دەی باهەمووماں ئاگامان لەخۆمان بێ، لە پێناوی کەسانی تردا، با نەوە و جگەر گۆشەی خۆشمان بێ. با قیامەتی خۆمان نەسوتێنین..



## وەسیەتی نا بەجێ مەکەن..

پێغەمبەری ئازیز و دڵسۆزمان، دڵسۆزتر لەخۆمان بۆ خۆمان ـ صەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێ ـ ئاگادارمان دەکاتەوە لەمەترسی و خەتەرناکی ئەم کارە و دەفەرمووێ: (إِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الخَيْرِ سَبعينَ سَنَةً، فإذا أَوْصَى حافَ فِي

وَصِيَّتِهِ، فَيُخْتَمُ لَهُ بِشَرِّ عَمَلِهِ، فَيَدْخُلُ النَّارَ). رواهُ احمد و إبْنُ ماجَّة.

واتە: كەسی واهەیە لەژیانی دونیادا كاروكردەوەی چاكە و خواناسانەی چاك دەكات و لەسەر ڕێگا و ڕێبازی خواناسانە بۆ ماوەی حەفتا ساڵ، بەلاَم كاتێك كە وەسیەت دەكات بۆئەوەی لەدوای خۆی ماڵ و سامانی دابەش بكرێ بەسەر نەوە و میرات گرانیدا، دەستكاری شەرعی خوا دەكات و ستەم دەكات لە وەصیەتەكەیدا و ئەمەش دەبێتە كۆتاهی هاتنی ژیانی بە شەڕ و خراپە و بێ دینی و سەرەنجام بەهۆی ئەم كارەوە دەچێتە جەهەنەمەوە ! !

بەڵێ ئەم بابەتە زۆر سامناكە، ئەوەتا دوای (٧٠) ساڵ خواپەرستی، نوێژ و ڕۆژوو و عیبادەت بەوەی لە وەصیەتێكی ناشەرعیدا، پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلامی كرد، لەخوا غافڵ بوو، نەیگوت خوایەك هەیە كە عەدل و دادپەروەری تەواو تەنها لە شەریعەت و بەرنامەكەی ئەودایە، چووە جەهەنم. پەنا دەگرین بەخوا لە چوونە جەهەنەم و هەركار و كردەوەیەك كە مرۆڤ دەباتە دۆزەخ.. ئەمە لە كاتێكدا كە كارەكە زۆر ئاسان بوو، دەیتوانی وەسیەتی شەرعی بكات، سەلەفی صالح ئاوا وەصیەتیان دەنوسی، ئەنەس ـ ڕەزای خوای لێبێت ـ دەفەرمووێ: صەحابەكان ئاوا پێشەكی وەصیەتنامەكەیان دەستپێكرد:

(بەناوی خوای گەورە و میهرەبان): ئەمە وەصیەتی فلأنی کوڕی فلأنە، ئاگادارین ئەم بەندەی خوایە شایەتی داوە بەوەی کە هیچ شتێ نیە، هیچ مەعبود و پەرستراوێك نیە شایەنی پەرستن بێت، تەنها زاتی (الله) نەبێ، ئەو خوایەی هیچ هاوبەش و شەریکی نیە. وە شایەتی داوە بەوەی کە محمد ﷺ بەندە و پێغەمبەر خوایە، وە ڕۆژی قیامەت دێت و هیچ شك و گومانی تێدانیە، وە خوای گەورە هەموو ئەوانەی لە گۆڕەکانیاندان دەهێنێتە دەرەوە و زیندویان دەکاتەوە و پاداشت و سزای کردەوەکانیان دەداتەوە.. لەدوای ئەمانە، بزانن و شاهید بن، ئەم بەندەی خوایە وەصیەتی کردووە بۆ نەوە و بنەماڵە و کەس و کاری خۆی. خێزان و کوڕ و کچەکانی کە تەقوای خوا بکەن و سنورەکانی شەرع مەبەزێنن..

لە نێوان خۆتاندا ڕێك و پێك و تەبا و بە حورمەت بن، لەسەر ماڵی دونیا و نێوانی برایەتی و خوشکایەتیتان تێك مەدەن، ڕێزی یەکتری بگرن، گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەری خوا بن ﷺ، شەریعەتی ئیسلامی چی بڕیاردا ئیلتیزامتان پێوەی هەبێ و پێی ڕازی بن، لێی لامەدەن، پاش ئەمە ئەمجا دەینوسی کە ئەی خێزان و نەوەکانم ئاگادارین کە حەزدەکەم لەدوای مردنم ئەم خێر و خێراتەم بۆ بکەن (ناوی جۆری خێرەکانی دەهێنا لە صەدەقەی نەبڕاوە). وە بزانن حەق و مافی ماڵی کەس و فلأنە کەسم لەسەرە، تکایە مافی خۆیان

بدەنەوە، وە قەرز و ماڵم لای فلانە، لەدوای مردنم لێیان وەربگرنەوە، ئەوە بڕەكە و جۆرەكەیەتی).

بەڵێ ئەمە وەصیەتی پیاو چاكان و خواناسان بوو، دەی خۆشەویستمان ﷺ دەفەرمووێ: (إِنَّ اللهَ قَدْ أَعْطَى كُلَّ ذِي حَقٍّ حَقَّهُ فَلا وَصِيَّةَ لِوارِثٍ) رَواهُ الترمذي، وَ صَحَّحَهُ الألباني في صَحيح الجامع: (٧٥٧٠).

واتە: بەڕاستی و بەدڵنیاییەوە خوای گەورە مافی هەموو خاوەن ماف و بەشێكی داناوە، لەبەرئەوە ئێوە دەستكاری مەكەن، وەصیەت مەكەن بۆ میراتگر، كە ئەوە و ئەوەی بدرێتێ، خوای گەورە بەش و حەقی هەموو میراتگرانی بەدادپەروەری داناوە، هەر خوا دەزانێ كێ پێش كێ دەمرێ، چەندین باوكمان بینی بەدەستی خۆی جگەر گۆشەی خۆی ناشت، خۆ مردن بەساغی و نەخۆشی و گەنجی و پیری نیە، دەستكاری مافی میرات و گرانت مەكە و بیسپێرە بە شەرعی خوا و لەخوا غافڵ مەبە.

## بەوەسیەتێك.. خۆی بێبەشكرد لەسامانی خۆی!

زانا و بانگخواز: (د. سعید عبدالعظیم) لە كتێبەكەی خۆیدا كە وتارەكانیەتی، بەناوی: (خُطب الشَّيْخ سَعيد عَبْدُ العَظيم، ص٢٠١)دا دەفەرمووێت: ئافرەتێك هەبوو، بەتەنها مابوەوە لەسەر ماڵ، هاوسەری ژیانی نەمابوو، سامانێكی زۆریشی هەبوو پاش ماوەیەك

توشی نەخۆشی بوو، دکتۆرەکان پێیان وت: هیچی تر پارە لەخۆت خەرج مەکە و چاوەڕێی شیفای خوای پەروەردگار بکە، بە کورتی تێیان گەیاند کە مردنی نزیکە و چارەسەری نیە، ئەم ئافرەتە کۆمەڵێ خوشك و برای هەبوون، کە هیچ چاکەیەکیان بۆی نەبوو، سەریان لێنەدابوو، خۆیان بە خوشك و برای نەزانیبوو، تەنها یەك خوشکی هەبوو، کە زۆر بۆی دڵسۆز بوو..

ئەم ئافرەتە بۆ مەحروم کردنی براکانی و خوشکەکانی لە میراتەکەی، وەکو تۆڵە کردنەوەیەك لێیان و هەروەکو پاداشتێك بۆ خوشکە باشەکەیەوە، وەهەرچی هەیەتی لەسەر ئەوی تاپۆ بکات. ئەوە بوو مامۆستایانی بەڕێزی شەرعزان پێیان وتبوو وامەکە و تاخۆت ماوی با هی خۆت بێت و کە خۆشت نەمای شەرعی خوا چۆنە با ئاوا میراتت لێبگرن و تۆ تۆڵەی خۆتیان بەم شێوازە لێمەکەوە، چونکە مرۆڤ تەنها بە کوشتنی میراتلێگرێکی مەحرووم دەبێت لە میرات. کەسێك باوکی خۆی، دایکی خۆی، برا و خوشکی خۆی بکوژێ. میراتی لێ ناگرێ. نەوەکو کەسانێکی لەخوا غافڵی دوور لە دین بۆ سەروەت و سامان پەلە بکەن و میرات لێگیراوەکەیان بکوژن، تازوتر بەسامانەکەی بگەن، هەروەکو پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **(لَيْسَ لِلْقَاتِلِ مِنَ الميراثِ شَئٌ)** **حَديثٌ صَحيح، رَواهُ ابو داود:** (٤٥٦٤).

بەڵام ئەم ئافرەتە لەگەڵ ئەو هەموو ئامۆژگاریەی پێشكەشی كرا، لەبەرئەوەی زۆر داخ لەدڵ بوو، بە قسەی نەكردن، هەموو ماڵ و موڵكەكەی كرد بە ناوی ئەو خوشكەیەوە كە بۆی چاك و بە خزمەت و دڵسۆز بوو، ئەمجا چاوەڕێی مردنی خۆی دەكرد، بەڵام (سبحان الله) ئەم خوشكە، ساغە، باشە، كە هەموو ماڵ و موڵكەكەی بەناوی ئەوەوە تاپۆ كرا، كت و پڕ جەڵتە لێی دا و مرد!! خوشكە نەخۆشەكە چوند ساڵی زۆر دوای ئەو هەر ژیا و ئەمجا مرد!! ئەمجا بە پێی یاسا ماڵ و موڵك و پارەی ئەم خوشكە مردووە دابەش كرا و ئەم خوشكە نەخۆشە، كە هەموو ماڵ و موڵكەكە هی خۆی بوو، وەكو یەكێ لە میرات گران مایەوە و بەشێكی كەمی بەركەوت!!

پەند و ئامۆژگاریەكان لەم بەسەرهاتە:

١) لەخوا غافڵ مەبە و هیچ كەس نازانێ كێ لە پێش كێدا ئەمرێ.

٢) ئای سیلەی ڕەحم پچڕاندن چەند خراپە، ئەم ژنەی والێكرد ئەم بڕیارە هەڵە بدات و لەجیاتی دار بكات بە ڕوحی برا و خوشكە خراپەكانیدا، داری كرد بە ڕۆحی خۆیدا!! بێ هیچ منەت و مەمنونی و دوعای خێر بۆی، لەبەرچاوی خۆی ماڵەكەیان بەشكرد!

٣) دەستكاری مەسەلەی میرات مەكە لە ژیانی خۆتدا و لێ گەڕێ باشەرعی خوا كە مافی هەموو كەس دەدات دابەشی بكات.

کێ دەڵێ تۆ لەدوای ئەو کەسە نامێنیتەوە لە ژیاندا کەماڵەکەت پێ بەخشیوە و ئەو بەخۆی و ماڵەوە دەڕوا و تۆ بە دەستی خاڵی دەمێنیتەوە، ئەمجا موحتاج و ئاتاجی دەستی ئەم و ئەو دەبیت.



## کەسێکی لە خواترس میراتی کەسانی تری نەخوارد..

بەسەرهات

پیاوێك ئافرەتێکی بە نهێنی بەسەر ژنەکەیدا هێنا، بێ ئەوەی پێی بڵێت، ژنەکەی بەمەی زانی، بەڵام لەبەرئەوەی ژنێکی زۆر دیندار و خواناس و بەحەیا و حورمەت بوو، بڕیاریدا که بێدەنگ بێت، تاوەکو حورمەتی خۆی و مێردەکەی و منداڵەکەی لەکەدار نەبێ و ناحەزی پێی خۆش نەبێت و ماڵی لێ تێك نەچێ، پاش ماوەیەك مێردەکەی مرد و ماڵ و سامان بە پێ شەرع دابەش کرا و هەرکەس بەشی خۆی وەرگرت و ئەم ژنەش هەشتیەکی ماڵەکەی بەرکەوت..

هەرچەندە لە ناخەوە لە مێردەکەی و لە ژنی دووەمی پەست بوو، بەڵام بەسەر ناخ و ڕقی خۆیدا زاڵ بوو، هات بە دادپەروەری ماڵەکەی لەبەشە میراتی خۆی کرد بە دوو بەشەوە و بردی بۆلای ژنی دووەمی و تێی گەیاند کە من دەزانم تۆ هەوێمی و ئەمەش بەشە میراتی مێردەکەمانە.. بەڵام بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو و

سەرسوڕهێنەر، ئەمیش مەردانە هاتە وەڵام و وتی: من ناتوانم هیچ شتێ لەو میراتە وەربگرم، چونکە پێم حەڵاڵ نیە، لەبەرئەوەی هەفتەیەك پێش مردنی منی تەڵاق داوە ! !

(چیرۆکەکانی قورئان ـ عمرو خالد، وەرگێڕانی: سامان خضر علي، ل١٧٧).

## خواناسی مرۆڤی ئاوا دروست دەکات! ‹بەسەرهات›

مامۆستای زانا و دانا و نوسەری بەناوبانگی کورد، مامۆستا محمد علی قەرەداغی، کە لەشاری سلێمانی وتار خوێنی مزگەوتی: (مەلا عبدالکریمی مدریس)ە، دەفەرمووێ: مامۆستا مەلا ئەحمەدی نەزیری بۆی گێڕامەوە، ئەویش لە مامۆستا سەید محمدی مامۆستای ئاینی گوندی (چەشمە نەنتەش)ی بیستوە کە فەرموویەتی:

لە گوندی ناوبراو سەیدێك کۆچی دوایی کرد، کاتی دابەش کردنی میراتەکەی خێزانەکەی بانگی کردمە لاوە، وتی: مامۆستا من ساڵەهایە لەگەڵ ئەم پیاوەدا بەیەکەوە ژیاوین و تا ئێستا من هەر کچم و لە خۆم و خۆی بەولاوە، تەنها هەر خوای گەورە بەم باسەی زانیوە، تەنانەت دایکیشم نەیزانیوە، ماوەی پەنجا و سێ ساڵ (٥٣) ساڵ لەگەڵ ئەو خوالێخۆشبوەدا بەو شێوەیە ژیاوم!! جا پێم وایە لە شەرعدا جیاوازی لەنێوانی ژنێکدا کە مێرد نەچووبێتە

لای، لەگەڵ ژنێکی تردا کە مێرد چووبێتە لای، لە میراتدا وەکو یەك ناگرن، با تووشی حەرام نەبم، بۆیە ئەمەم بۆ تۆ باسکرد!! (گۆڤاری سلێمانی، ژ: ١٤٢).



ڕیپۆرتاژێکی ڕۆژنامەوانی، هەفتەنامەی (ستاندەر) ژمارە: ٦٣، لە بارەی میراتەوە باسێك دەکات، بە ناونیشانی:

**بەرد شەقی برد تا بەشی خۆم وەرگرت، ئینجا نۆرەی سەرکۆنە کردنە..**

دایك و باوك تا منداڵەکانیان پێ دەگەیەنن بە هەزار دەردەسەری بەبێ جیاوازی کوڕ و کچ، لەهەمان کاتدا ئەو برەماڵەی هەیانە بۆ منداڵەکانیان دەمێنێتەوە، ئەی ئەگەر باوکەکە بمرێ، براگەورە شانۆیەکە بەڕێوە ببات، خۆی سەرپەرشتیاری ماڵەکە بکات، حیساب بۆ خوشکەکەی نەکات تەنها بیر لەخۆی بکاتەوە، ئەگەر سەیری دادگا بکەیت کێشەی لەم جۆرانە بەرچاو دەکەوێت، هەندێکیان بەشخوراون، هەندێکی تر پارەیان لێزیادە نازانن چی لێ بکەن. لە هەمووی چاکتر ئەوەیە مرۆڤ دەرونی خۆی ئاسودەبکات و لەسەر ماڵی کەسانی تر نەژی.

لە درێژەی ڕاپۆرتەکەدا قسە لەگەڵ چەند کەسێك کراوە، کە دەردە دڵی خۆیان کردووە لەم بارەیەوە، یەکێکیان ئافرەتێکە

دەڵێ: خاوەنی دوو منداڵم، براکەم تاقانەیە، دایکم دەڵێ دەبێ بەزۆر ڕازی بی کەواز لە بەشە میراتی باوکت بێنی بۆ براکەت، لە کاتێکدا کرێچیم و خەڵك خێرم پێدەکەن، خانوەکەی باوکم نزیکەی (٨) دەفتەر دەکات، گوایا حاشام لێدەکەن ئەگەر بەشی خۆم وەربگرم، بەردەوام هەڕەشەم لێدەکەن..

دایکم بیر لە هەژاری من ناکاتەوە بۆ کوڕەکەی ئێمە بێبەش دەکات، ئەی ویژدان لەکوێ خەوی لێکەوتووە، خوشکەکانم لە ترسی دایکم و براکەم ئیمزا دەکەن، باشە بڵێم چی ئەگەر دایك ئەو دەورە بێ سۆزیە بنوێنێ؟! بەڵام بڕیارم داوە وەریبگرم، هەرچی دەکەن بابیکەن، دادگا لە پشتمە!!

کەسێکی تر دەڵێت: من کچێکم هەر لەدوای لەدایك بوونمەوە لە بێشکەوە، ماڵی باوکم منیان دایە ماڵی مامم، چونکە منداڵیان نەدەبوو، ناوم خرایە سەر مامم، باوکم خاوەنی سەروەت و سامانێکی زۆر بوو، باری دارایشم باش نیە، خوشك و براکانم سامانەکەیان دابەش کرد، یەك پولیان پێ نەدام، وتیان: تۆ لەسەر ناوی باوکمان نەماویت، ڕاست دەکەن بە یاسا هیچم ناکەوێ، بەڵام خۆزگە تۆزێك هەستی مرۆڤایەتیان بجولایە بەهەموویان یارمەتیان بدامایە و لەو بێ دەرامەتیە ڕزگاریان دەکردم، نەك بێ ویژدانانە هەریەکەو بەشی باشیان بۆ خۆیان برد و منیان کردە بێگانە.

ماف خوراوێکی تر کە هەر کچە دەڵێ: باوکم دوو ژنی هەبوو، بەڵام من تاقانەی دایکم بووم، دایکەکەی ترم (باجیەکەم) کۆمەڵێ کوڕ و کچی هەبوو، کاتێ باوکم مرد حیسابیان بۆنەکردم، وتیان: باوکمان زیندوو بوو حیسابی بۆ ئێوە نەکرد، ئاوارەی کردبوون، چۆن بەشی باوکم بەتۆ دەدەین؟! حاشا تۆ خوشکی ئێمە نیت، داخەکەم ئەوەیە باوکم لەڕۆژی دوایی دا چۆن وەڵام دەداتەوە دەرهەق بە مافی من و دایکم؟!

ئافرەتێکی تر دەڵێت: خانوەکەمان بەناوی دایکمانەوە بوو، براکەم بە هەزار فڕ و فێڵ کردی بە ناوی خۆیەوە، ئینجا وتی: تاقەتی پرتە و بۆڵەمان نیە، دەبێ هەر هەفتە و لەلای کچێك بێ، لە هەمان کاتیشدا دەڵێ: بۆ کچ عەیب و شوورەییە میرات وەربگرێ.



لەکۆتاییدا شیعرە بەهێز و بە پێزەکەی مامۆستا قانع لەبارەی میراتەوە دەکەینە دیاری:

برا باوکمان ڕۆیی بە ڕەحمەت
چاك نەجاتی بوو لە دەرد و زەحمەت.

باوك بۆ هیچ کەس نامێنێ تاسەر
کوڕ ئەو کوڕەیە لە کڵ بێتەدەر.

مەسەلە مەشهور برامان برایی
بەلاّم بەو شەرتە كیسەمان جیایی.

ماڵەكەش بەش كەین بێ مەلا و قازی
یەك لە یەكتری چاك ببین ڕازی.

ئەو هێسترە شێتەی جوتە وەشێنە
دایبنێ بۆ من هیچ دامەمێنە.

ئەو پشیلە جوانەی پڕ خەت و خاڵە
چش بابۆ تۆ بێ ڕەونەقی ماڵە.

ئەو جوتە مانگای زلّ و زۆر خۆرە
كە یەكێ شینە و یەكێكیان بۆرە.

بۆ من، دوو مریشك لاری هێلكەكەر
دابنێ بۆ خۆت بەبێ دەردی سەر.

ئەو ماینە پیرەی زین هەڵپچڕاوە
مەرحومی باوكم بۆ منی داناوە.

بەشی تۆ لەسەر ئەم ماینە نیە
باوكم فەرموویە خەتای من چیە.

مس و مەسینەی لە ژەنگا پواو
دایبنێ بۆ من لە ساغ و شكاو.




کیتەڵە و گۆزە، دیزە و دەرخۆنە

هەمووی بۆ تۆ بێت لە تازە و کۆنە.

قەت پارە نەدەی بۆ سپی کردن

مسگەر ناناسی تا ڕۆژی مردن.

زڕنگەی مەنجەڵ و زەحمەتی سینی

لەخوام گەرەکە تۆقەت نەیبینی.

ئەو ئاوە ساردە لەئەو جەوەنە

دایبنێ بۆ خۆت هەر پێی پێکەنە.

ئەو هیزە ڕۆنەی کوێك و مووداره

دایبنێ بۆ من چارم ناچارە.

لەدەرگای حەوشە تاوەکو سەربان

دایبنێ بۆ من سەرپاك هۆدەكان.

ئەمما لە سەربان هەتاکو ئاسمان

هەمووی بۆ تۆبێ بێ کەسری و نوقصان.

هەردووکیان بۆ من گاسور و گاڕەش

دوو سەگمان هەیە بۆتۆ لەجێی بەش.

نەکای بۆ بێنە نەجێی بماڵە

هیچیان ئەرکیان نیە ئەو دوو گەماڵە.

شەو تابەیانی بە جوت ئەوەڕن

حەلەلیان لیَ كەی سك پیاو ئەدڕن.

برا وامالَمان تەواوی بەش كرد

هەمووی بە زیادۆ بەشی خۆتت برد.

ئەلحەمد و لیلا بەبیَ دلَ یەشان

جیابوینۆ لەیەك بە سەهل و ئاسان.

هەرچەند مەغدور بووم بەشی تۆ زۆرە

لەبەر تانەی عام ڕازیم بەو جۆرە.

باخەلَقی نەلَیَن بڕوانە حالَی

تەماعی كردە برای منالَی.

بەلَیَ زۆر كەس هەن ئاوەها وەكو مامۆستا (قانیع) باسی دەكات میرات دابەشی دەكات. بەلاَم بە دلَنیاییەوە ئەوەی لەخوا غافلَ بیَ و ستەم لە بەشە میراتی كەسانی تر بكات هەر زەرەر دەكات و مولَكەكەشی، سامانەكەشی هەر بەجیَ دەمیَنیَ بۆ یەكیَكی تر كە هیچ مەمنونی نیە و سوپاسی ناكات..

## وانەی پێنجەم :



ئەی دایك و باوك..

بە ناکۆکیەکانتان منداڵەکانتان

سەرگەردان مەکەن

# وانەی پێنجەم:

## بابەت: ئەی دایك و باوك.. بە ناكۆكیەكانتان منداڵەكانتان سەرگەردان مەكەن

❁ **قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وَ تَعالى:** ﴿وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾﴾ **الروم.**

❁ **وَقالَ اللهُ سُبْحانَهُ وَ تَعالى:** ﴿وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَٱجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴿٧٤﴾﴾ **الفرقان.**

❁ **قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (إذا ماتَ الإِنْسانُ إِنْقَطَعَ عَنْهُ عَمَلُهُ إِلاّ مِنْ ثَلاثَةٍ: صَدَقَةٍ جارِيَةٍ، أَوْ عِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ، أَوْ وَلَدٍ صالِحٍ يَدْعو لَهُ). رَواهُ احمد في المُسْنَد (٢/٣٧٢) وَ مُسْلِمْ: (٤٢٣٢).**

❁ **قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (إِنَّ اللهَ يُصْلِحُ بِصَلاحِ الرَّجُلِ وَلَدَهُ، وَوَلَدَ وَلَدِهِ، وَ أَهْلَ دويرات حولَهُ، فَما يَزالُونَ في حِفْظِ اللهِ مادامَ فيهِمْ). رَواهُ إِبْنُ مردويَة كَما في الدر المنثور (٥/٤٢٢).**

## سەرچاوەکان:

١) پەروەردەکرنی منداڵ لە چل فەرموودەی صەحیحدا، نوسینی: د. عادل عبدالله الغامدی، وەرگێڕانی: م. عمر توفیق الخطاط ل٦٩.
٢) گۆڤاری سلێمانی، ژمارە: ١٤١، ئازاری ٢٠١٣، ل٣٢.
٣) ئەسرینەکانی سەدەی بیست و یەك، ئاوات أبوبکر أحمد، ل١٧.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

**الحَمْد لله رَبِّ العالَمين. وَالصَّلاةُ وَ السَّلامُ عَلى سَيِّدِنا محمد وَ عَلى آلِهِ وَ صَحْبِهِ اجْمَعينَ:**

**کاتێك مرۆڤ ژیان هاوسەری پێك دێنیٚ، ئەو هەموو کوڕ و کچانەی بەهۆی هاوسەرگیری شەرعیەوە دەبنە ژن و مێرد، یەکەم شتیٚ دوای بەیەك گەیشتنیان لە ژیانی هاوسەریاندا کەبیری لێدەکەنەوە و دەبێتە خەون و خولیا و هیوا و ئاواتیان، بریتیە لە بونە دایك و بونە باوك. بەهۆی هاتنە دنیای کۆرپەیەکی جوانەوە، منداڵێکی چاوگەشی بیلبیلەی چاوانەوە، لێرەدا دوای لەدایك بوونی منداڵ و پەیدابونی ئەندامێکی نویٚ لەم خێزانەدا و ناوێکی نویٚ لەم بنەماڵەیەدا، ووشەی جوان و بەڕێز و ناسکی (دایك و باوك)یش دروست دەبیٚ.**

**کەواتە: ووشەی (دایك) زۆر گەورەترە لەو مانایەی کە ئافرەتێك وەکو ڕەگەزی میٚ منداڵی ببیٚ، یاخود باوك لەسەر ناسنامەکەی و لاپەڕەی باری کەسیەتیەکەی ناوی کۆرپەیەکی لەگەڵ تۆمار بکریٚ. بەڵکو باوك و دایکی ڕاستەقینە و گەورە ئەوەیە کە: (باوك بچێتەوە سەر باوەگەورەی کە (ئادەمە) دایکیش وەك دایکە حەوا بێت..**

## با باوکان وەك باوکە ئادەم بن..

بەڵێ یەکەم باوکی سەر زەوی ناوی (ئادەم)ە، ئادەم ناوێکی خۆشە. ئایا صیفاتەکانی ئادەم، باوە گەورەی هەموو مرۆڤایەتی چی بوو؟! ووشەی (ئادەم) لە: (أديمُ الأرض)ەوە هاتووە، بە مانای: سەرتوێژی زەوی، توێکڵە ڕاستەقینەکەی زەوی، چونکە زەوی حەوت بەشە، ئەو بەشەی کە مرۆڤ لێی سودمەند دەبێ ئەم توێژاڵەی سەرەوەیەتی، کەواتە: ئەی ئەو کەسەی کە بووی بە (باوك) وەکو باوکە ئادەمت ئەم صیفەتانەت هەبێ:

یەکەم: وەك زەوی خاکی و خۆ بەکەم زانبە: ئەو هەموو مرۆڤە، ئاژەڵە، زیندەوەرە، بەسەریا دەڕوات. هیچ فیز و تەکەبوری نیە و بە تەوازوعەوە پێشوازی لە هەموویان دەکات.

دووەم: وەك زەوی ئارام بە: ئەوەتا زەوی لێی دەدرێ، بەچەکوش لەسەری تەق و هوڕ دەکرێ، ئازار دەدرێ، بە نەزانی ڕەفتاری لەگەڵ دەکرێ، کەچی بێدەنگ و خۆڕاگرە، کەسێکیش کەبوو بەباوك دەبێ بەڕاستی خۆڕاگربێ، خۆڕاگربێ لە ژێر باری سەختی بەڕێوبردنی ماڵ و منداڵ و خێزان، بەرامبەر ناڕەحەتیەکانی ژیان، زوو هەڵنەچێ، بەئارام بێ، وەکو مرۆڤە سەرکەشەکەی جاران نەبێ، مرۆڤێکی ورە بەرزی خۆڕاگربێ..

سێهەم: وەك زەوی بەخشندەبە: زەوی ئەم هەموو بەخششەمان پێشکەش دەکات:

ا) خاکەکەی سەرەوەی دانەوێڵە و ڕووەکی لەسەر دەڕوێ و بەرهەمی خۆش و بەتام و سودبەخشی ژیانمان پێ دەبەخشێ، بەخۆمان و ئاژەڵ و باڵندە و تەنانەت دڕندەکانیش.

ب) زەوی بەخشندەیە و بەو مادانەی لەناویدان، لە ڕێگەی ڕەگی ڕووەکەوە هەرچی ماددەی بەسوودە دەیبەخشێ بۆئەوەی ئێمەی مرۆڤ سەرەنجام لێی سودمەندبین.

ئەو ئاوەی لەناخیدا کۆبۆتەوە، بەجوانترین شێوە لە شێوەکانی کارێزدا پێمان دەبەخشێ.

ئاوەکە ناتەقێنێ ولاتێك وێران بکات. بە ئەندازەی پێویستی دەیبەخشێ، لێرەدا دەبێ باوکیش ئاوا بەخشندە بێ، بەلام نابێ دەست بلاوبێ. نابێ باوك قومارچی و عەرەق خۆر و زیادە مەصرەفی بێسود بکات. پێویستە بە ئەندازەی پێویست ببەخشێ.

بەڵێ زەوی زۆر بەخشندەیە، هەرچی لەناویایەتی پێشکەشی دەکات لەنەوتەکەی، گۆگردەکەی، فۆسفاتەکەی، ئاڵتون و ئاسنەکەی، بەلام نایشیخاتە بەردەستمان، ئەبێ خۆشمان هەوڵی بۆبدەین. لەڕێی زانستەوە شارەزایی بەدەست بهێنن بۆئەوەی بتوانین لە خێر و بێری ئەم زەویە بەخشندەیە سودمەندبین. لێرەدا دەبێ باوکی ڕاستەقینەش ئاوابێ، ببەخشێ بە منداڵەکانی، بەلام

نەك بەو شێوەیەی دەم بگرنەوە و بیخاتە دەمیانەوە. بەڵکو هانیان بدات بۆئەوەی بخوێنن، پەیمانگا و زانکۆ تەواو بکەن، فێری کار و کەسابەتی سودبەخش ببن، دەست ڕەنگین بن، پیشەیەك لە ژیاندا فێرببن، ئەمیش بە زانستەکەی، بەماڵ و سامانەکەی، بە ئەزمون و تەجروبەی ژیانی خۆی، بەخشندەبێ لەگەڵیان و هاوکار و دەستبار و پشتیوانیان بێ!..

چوارەم: وەك زەوی بەسۆز و میهرەبانبە: ئەو هەموو خراپەیەی لەسەر دەکرێ، پیاو خراپان ئازاری دەدەن، شەکوای هەیە لە دەستیان، کەچی ئەم خراپەکارە کاتێ مرد، یەکسەر لە ئامێزی دەگرێ و فڕێی نادات، نەفرەتی لێ ناکات، لەخۆی بێ بەری ناکات، فەرق و جیاوازی کەس ناکات، ناڵێ ئەمە بەدین بوو، ئەمە بێ دین بوو، ئەمە چاکەی لەسەر کردم، ئەمە خراپەی لەگەڵ کردم. ئەمە کاولی کردم، ئەمە ئاوەدانی کردمەوە، ئەمیان مزگەوتی لەسەرم دروست کرد، ئەمیان عەرەق خانە.. نەخێر هەر کەکەوتەوە باوەشی، وەری دەگرێتەوە، باوکیش دەبێ ئاوابێ، زۆر بەسۆز و دڵسۆز بێ بەرامبەر بەنەوەکانی، نابێ باوك کەللە ڕەق و دڵڕەق بێ، هەر جگەرگۆشەکەی خراپە و بێ گوێیەکی کرد و ناڵەباریەکی نواند، هەرزەکار بوو، هەڵەیەکی کرد، جا کوڕ بێ یان کچ بێ، ئیتر بڵێ تازە لێم بێبەریە و نایەتەوە بەچاو و دڵم، بەڵکو هەر کەدانی نا بە هەڵەکەیدا و هاتەوە ئامێزی، دەبێ وەکو زەوی بە سۆز بێ بۆی

و لە ئامێزی بگرێتەوە، ئامۆژگاری بکا و ڕێنمایی بکات بۆ ژیانێکی تازە و پاك. لە ڕابردووی ببورێ.



## با دایکی ڕاستەقینە، وەك دایکە حەوا بێ..

یەکەم دایکی سەرزەوی، دایە گەورەی هەموو مرۆڤایەتی ناوی (حَواء) بوو، مانای ناوی دایکە (حەواء ) سێ مانای هەیە:

یەکەم: حَیاة، بە کوردی خۆمان (ژیان). کەواتە: ئەگەر ئافرەتێك ناوی (ژیان) بوو. ئەوە هەر ناوی (حواء ). لەم ناوەوە فێردەبین کە: ئەو ئافرەتەی منداڵی بوو وەبوو بە دایك ئەبێ بەڕاستی ژیان دۆست بێ، نەك ئافرەتێك بێ، هەریەکێ بەحاڵ بڵێ لەل، بڵێ دەبێ خۆم بسوتێنم، نەوت بکات بە خۆیدا. خۆی بکوژێت!! چونکە ئەم دایکە، ئەبێ وەکو دایکە حەوای ژیان دۆست بێ، چونکە ئەی دایکی بەڕێز تازە تۆ هەر خۆت نی، تۆ منالّیشت هەیە، دەبێ زۆر حەزت بەژیان بێ، حەزبکەی بژی، بۆئەوەی منداڵەکانیشت بژین.

دووەم: حَیاء، واتە: شەرم و شکۆ، واتە: هەرکات ئافرەت بوو بەدایك ئەبێ بەڕاستی خاوەن شەرم و شکۆ بێ، زۆر شت هەیە دایپۆشێ، دەنگ بەرز نەکاتەوە، لەپێناوی ئەوەی بڵێ با ئابڕومان نەچێ، با خەڵك گوێی لە دەنگمان نەبێ، با نەیاران پێمان خۆش

نەبن، یا منداڵەکانم بەهۆی منەوە سەرشۆڕی ناو کۆمەڵگا نەبن، بەڵێ ئەبێ دایك حەیا و شەرم و شکۆی زیاتر بێ لە کچێکی هەرزەکار، لە ئافرەتێك کە هێشتا منالی نەبووە.

سێهەم: إحتواء، مانای سێهەم، (حَواء) یانی: ئامێز، لەباوەش گرتن. ئەگەر کچێك ناوی (ئامێز) بێ. هەر دایکە حەواکەی خۆمانە بەلاّم بە زمانی شیرینی کوردی. ئەمەش پێمان دەڵێ: ئافرەت کە بوو بە دایك، دەبێ ئامێزی گەرمتر بێ لە جاران، نەك ئافرەتی واهەیە کە بوو بەدایك ئەمجا مێردەکەی ئیهمال و پشت گوێ دەخات.

ئەڵێ تازە من و تۆ تەواو، ئەوە منداڵ پەیدا بوو، بە پێچەوانەوە، دایکی ڕاستەقینە ئەبێ ئامێزی بۆ مێردەکەی گەرمتر بێ لە جاران، باوەشی بۆ ڕۆڵەکەی گەرمتربێ، ئەوەندە دەست بێنێ بەسەر منداڵەکانیا کە منداڵەکانی ناچار نەبن لەبەربێ سۆزی، ڕوو لە کۆلاّن بکەن و تووشی کەسانی لار و لەوێر ببن، بە دڵنیاییەوە زۆربەی ئەو منداڵانەی لە کچ و کوڕ کە لەدەرەوەی ماڵ تووشی لاڕێ بوون دەبن، سەرەنجامی ئەوەیە ئامێزی دایکێکی میهرەبان نەبووە لەباوەشی بگرێ، دەستی سۆزی بەسەردا بێنێ. دایکی ڕاستەقینە یانی ئامێزی گەرم، ئەوەندە بەگەرمی و خۆشەویستی یەوە لە ئامێزیان دەگرێ، ئەم منالە هەست بەبێ

نازی ناکات. تا بچێ خۆشەویستیەکانی لەدەرەوەی ماڵ پڕ بکاتەوە.

جا لێرەدا چەند جار ووشەی (منداڵ) بەکار دێنین، مەبەستمان منالّی شیرە خۆرەی ناوبێشکە و (بەبە) نیە، بەتەنها، بەڵکو ئەو کوڕ و کچەی دەبێتە پانزە شانزە ساڵیش هەر منداڵە، هەر پێویستی بەوەیە کە چووە ماڵەوە دایکی ئامێزی بۆ بگرێتەوە. بەتایبەتی کچ. چونکە ئەگەر لە ماڵەوە ئامێزی خۆشەویستی بۆ نەگیرایەوە، لە دەرەوەی ماڵ بەدوای کەسێکدا دەگەڕێ کە خۆشەویستی بۆ دەربڕێ و لە ئەنجاما دەستی دەبڕێ..

بەڵێ ئەمە کۆمەڵێ صیفاتی باوکە (ئادەم) و دایکە (حەواء ) بوون، جا ئەگەر دایك و باوك: ئەصڵ زادە بوو، حەلاڵ زادە بوون، ڕەسەن بوون، ئەوا صیفاتی ئادەم و حەوایان تێدا دەبێ، هەم خۆیان بەختەوەر و هەم نەوەکانیان بەختیار دەبن.

## دەرئەنجامی دایك و باوکی خراپ:

ئەگەر دایك و باوك صیفاتی باشیان زۆر نەبوو، هەروەکو نێر و مێ یەك ژن و مێرد بوون و جوت بوون بۆ:

١) ئارەزوو شکاندنی جنسی بە یەکتری.

٢) ماڵ و حاڵ پێکەوەنان و خانوو دروست کردن و نان و خەوتن بەیەکەوە.

٣) منالّ خستنەوە و شانازی بەوەی چەند کوڕ و کچی هەیە.

ئەوە بەڕاستی کارەساتێکی گەورە چاوەڕێی ئەم خێزانەیە، چونکە بناغەی لەسەر بۆشی دانراوە و ڕۆژێ هەرەس دێنێ، بەلاّم هەرەس هێنانێك کە پەشیمانیەکی لەدوایە کە قوربانی کارەساتی گەورەی لیّ دەکەوێتەوە بەم شێوەیە:

### یەکەم: ئەو ژن و مێردە خۆیان سەرگەردان دەبن:

یاخوا هیچ ژن و مێردێك بە تەلاّق لەیەکتری جیانەبنەوە، ژن ئەو کاتە هەست بەبرینی خۆی دەکات کە لەدادگا (مەحکەمە) تەلاّق دەدریّ، کە ئەوکاتەی تەلاّق درا، ئەمجا ئەزانیّ چ زەربەیەکی گەورەی بەرکەوتووە، زۆر ئافرەت سوورە لەسەر ئەوەی تەلاّق وەربگریّ، بەلاّم هەتا تەلاّق نامەکەی وەرنەگریّ، لەسەر ناسنامەکەی نەنوسریّ بێوە ژن، نازانیّ چ برینێکی گەورەی پێوەیە، ئەو کاتە ئەزانیّ کۆمەڵگای بیّ ڕەحم چۆن سەیری دەکەن، بە تایبەتی لەم سەردەمەدا. وە هەر پیاوێك بۆ دواجار ـ پەنا بەخوا ـ لە دادگا لە ژنەکەی جیابۆوە، تانەیەتەوە ماڵەوە و نەبینیّ کە ماڵەکەی چۆڵە و بیّ خانمەکەی و هاوژین و هاوسەرەکەی وەکو کەلاوە وایە. هەست بە برینی لەشی خۆی ناکات. زۆر پیاو سورە لەسەر تەلاّقدانی ژنەکەی بەلاّم دوایی بە هەردوو دەستی قوڕ دەکات بەسەری خۆیدا و پەشیمانی دەردەبڕیّ.

**دووەم: (باوك و دایك) ژن و مێردەکە ڕەنج بە خەسار دەبن:**

باوك و دایك کچیان بەخێوکردووە گەورە کردووە و پەروەردەوە گەورە کردووە، بەو ئاواتەوە لە کچەکەی ڕوانیوە کە ڕۆژێك لە حەیا و حورمەتەوە بەشووی بدا و لە ماڵ و حاڵی خۆیدا بێ و نەوەکانی داهاتووی ببینێ، باوك و دایکی کوڕەکەش هەر بەهەمان شێوە، پاروی دەمی خۆیان گرتووە و، تاڵ و سوێری ژیانیان نۆشیوە بۆئەوەی کوڕەکەیان لەداهاتوودا ماڵ و حاڵی خۆی هەبێ و، لەگەڵ خێزانەکەیدا خۆشبەخت بێ و نەوەی کوڕەکەیان لە ئامێزبگرن.. بەڵام کاتێ کە خێزانەکەیان تێك دەچێ و کوڕەکە ژنەکەی تەڵاق دەدا و کچە بە بێوەژنی دەچێتەوە ماڵی باوکی، ئەوە بزانە ئەو دوو بنەماڵەیە چەند خەمبارن..

هەروەکو نمونەی ئەو باخەوانە وان کە هەموو هەوڵ و تێکۆشانی خۆی بەکارهێناوە، سەرما و گەرمای قبوڵ کردووە، خەوی شیرینی شەوان و بەری بەیانی لەخۆی حەرام کردووە بۆئەوەی نەمامێك پێبگەیەنێت، ئێستا نەمامەکە هاتۆتە بەرهەم و لەم کاتەدا کەمایەی دڵخۆشبوون و چاو پێ ڕۆشن بوونە، لە کتوپڕێکدا ئافاتێك ڕوویکاتە نەمامەکە و ووشکی بکا و گەڵای سەوز و جوانی وەکو خەزانی پایز هەڵبوەرێنێ، ئالەم کاتەدا دیمەنی ئەو باخەوانە دڵسۆزە، خەمخۆرە بخەرە، بەرچاوت بزانە چەندە خەمناکە. چۆن لاپەڕەکانی ماندوبوونی چەند ساڵەی دێنە بەرچاوی کە بەهەدەردەچن و خۆی

بەرەنج بە خەسار دەزانێ، بەهەمان شێوەش هەرکاتێ خێزانێك بە تەڵاق لەیەکتر جیابوونەوە، باوك و دایکی کوڕ و کچەکە ئاوا وەکو ئەو باخەوانە دڵتەنگ و خەمناکن، کەوەکو نمونە باسمان کرد، ئەگینان هەرگیز خەمی باخەوانی نەمام و باخەوانی ئەولاد بەراورد ناکرێن! چونکە شتی ماددی دروست دەکرێتەوە. بەڵام خێزان کە تەڵاقی تێکەوت چاك نابێتەوە.

### سێهەم: منالْ دەبێ بەقوربانی:

قوربانیەك، تیاچونێك، خەمێك، شڵەژانێك، شڵەقانێك، لەرزینێك، تەزینێك، نەهامەتیەك، لێقەومانێك.. کە تەنها و تەنها ئەو کەسانە دەزانن چەند بە ئازارە. کە کاتی خۆی منداڵبوون و دایك و باوکیان لەیەك جیابوونەوە.

جا لێرەوە ڕوودەکەینەوە ئەو باوك و دایکانەی کە منداڵیان هەیە و کێشەی خێزانیان هەیە گەیشتونەتە ئاستێك کە خەریکە لەیەکتری جیادەبنەوە، دەڵێین: (لەخوا غافڵ مەبە). وەرە لەبەرخاتری ڕەزامەندی خوا کۆشکی خێزانیت مەڕوخێنە، درزوکەلێنەکان چاك دەکرێن، دەگیرێن، بەڵام خانوەکە مەڕوخێنە بە تەڵاق. ئەی باوك، وەکو باوك بە، وەرە هەندێ خاکی و خۆبەکەم زانبە، عینادی و کەللەڕەقی واز لێبێنە، نەرم و نیان بە، بەخشندە بە، لێبوردە بە..

ئەی دایك تۆش ئامێزت بکەوە، تۆزێ حەیا و حورمەتت زیاد بکە، شەرمت زیاتر بێ، ژیانت پێ خۆشتر بێ، ژیان دۆست بە، هەردوولاتان وەرن سەیری ژیانی ئەو منداڵانە بکەن کە دایکیان و باوکیان بە تەڵاق لەیەکتری جیابونەتەوە، بزانن چۆن ژیانێکی تاڵ بەسەر دەبەن، کە ویژدان و ناخی هەموو مرۆڤێکی ویژدان زیندوو دەهەژێنێ. ئاوا بە خۆتاندا بچنەوە بە ئومێدی خوا کێشەکانتان چارەسەر دەبێ.



## دایك و باوکێکی بێ هەست، بۆ منداڵەکەیان!

بەسەرهات

مامۆستای بەڕێز و خەمخۆر: (م. عەلی مەلا محمد) لە گۆڤاری سلێمانی، ژ: ١٤١ دا، لە ژێر ناونیشانی: (یادەوەرییەکی پڕ لە کسپە، ئەو منداڵە وتی: من دایك و باوکم نیە و دایك و باوکیشم هەیە) بەسەرهاتێکی واقعیمان بۆ دەگێڕێتەوە وەك خۆی لەناویا ژیاوە و دەفەرمووێ: گەر هەموو ئەم بەسەرهاتە نەخوێنیتەوە، لەوانەیە بڵێیت: ئەمە چۆن شتی وادەبێت؟! ئایا ئەمە مەتەڵە؟! یان مەبەستێك لەدوای ئەم باسەوە هەیە، جانازانم ئێوە لێرەدا خەیاڵتان بۆچی ئەچێت و چۆنی لێك ئەدەنەوە...

ئەو منداڵەی کە ئەم وتەیەی وت: لە ڕووداوێکی ڕاستەقینەوە دروست بووە، وەك خۆی چۆن ئەڵێت وایە، جا با لە زمانی منداڵەکە خۆیەوە بەسەهاتەکە ببیستین، ئەگەر بچینە ناو قوڵایی ڕووداوەکەوە بەم شێوەیەیە:

لەساڵی (٢٠٠٣ — ٢٠٠٤) دا، مامۆستا بووم لە خانەی نەوجەوانانی کوڕان، ئەم خانەیە وە ناوخۆییەك وابوو، چونکە منداڵانی بێ دایك و باوك. یان دایك و باوك ئەنفال کراو، یان منداڵی ونبوو، بێ لانە و بێ سەر و شوێن گرتبووە ئەستۆی خۆی، هەروەها ئەو منداڵانەی کە لە لادێ و لە ناو شاریشدا لەبەر هەژاری و نەبوونی، لە ئامێز دەگرت و ئەمانەی وەردەگرت و دەخرانە خوێندنگا و قوتابخانە لەوێ وەك ناوخۆیی (داخلی) وابوو، هەموو پێداویستیەکانی ژیانیان بۆ ئامادە دەکردن و لەوێ دەخەوتن، حکومەت زۆر بە پەرۆشەوە کەمتەرخەمی نەدەکرد لەگەڵیان و جل وبەرگ و پێڵاو و کتێب و دەفتەر و هەموو پێداویستیەکانی خوێندن، لەگەڵ ئەوەشدا مانگانە پارەیان بۆ بڕابۆوە بۆ خەرجکردنی ڕۆژانەیان.

ئەوەشمان لەبیر نەچێ کە خێر خوازانی شارەکەش دەستی یارمەتیان بۆ درێژ دەکردن لە هەموو ڕوویەکەوە.

ئەم منداڵانە لە جەژنەکانی ڕەمەزان و قوربانداد، ئەو سێ چوار ڕۆژە، لە ڕۆژانی (عارفە)وە ئەنێردرانەوە بۆ سەردانی کەسوکاریان،

بۆنەوەی بە تەواوەتی لە کەس و کاریان دانەبڕێن و یەکجاری دوورنەکەونەوە لە دایك و باوك و خوشك و برا و مام و خاڵ و سەردانیان بکەن، گەر لە گوندەکان بوایە، ئەوا بە ئوتومبێل ئەبرانەوە بۆ دێکەی خۆیان و تەسلیم بە کەس و کاریان ئەکران، هەروەها ئەوەشمان لەبیر نەچێ کە لە کاتی نەورۆز و بەهاران ئەبران بۆ سەیران و گەشت و سەردانی شوێنەکان لە شارەکانی تری کوردستان. لە هەموو لایەکەوە بەسەر ئەکرانەوە و تا ئێستا ئەم خانەیە بەردەوامە لە خزمەتکردنی منداڵان. ئێستا دێینە سەر گێڕانەوەی زمانحاڵی ئەو منداڵەی کە ئەڵێت: من دایك و باوکم نیە و دایك و باوکیشم هەیە..

ڕۆژی عارفە بوو، هەروەك ساڵانی پێشوو، پێشتر دوای جەژنانە و پارە و جل و بەرگ بۆ کردنیان، داوا لە منداڵان کرا، کە خۆیان ئامادە بکەن بۆ سەردانی کەسوکاریان.

دوای ئەوەی ئەو ڕۆژە لە بەیانیەوە منداڵان وردە وردە کەوتنە خۆکۆکردنەوە و خواحافیزی کردن لە مامۆستا و کارمەندان، چۆڵی و بێدەنگی باڵی بەسەر ژوور و ڕاڕەو و چێشتخانە و هەموو خانەکەدا کێشا، هەتا هەموو مامۆستا و کارمەند و باجیەکان ڕۆشتنەوە، منیش بەتەمابووم بڕۆم، لەناکاو پاسەوانەکە (حەرەسەکە) هات بۆلام و وتی:

مامۆستا منداڵێك دەگری و لەو قوژبنەدا خۆی گرمۆڵە کردووە و ئەگری و ئەڵێت: (من بچم بۆ کوێ؟!) لەبەر گریان وەڵام ناداتەوە و لێی تێناگەم! منیش وتم: چۆن؟ کوا لەکوێیە؟!

وتی: ئەوەتا لەو قوژبنەدا، ئینجا خۆم چووم بۆلای تەماشام کرد ئەو منداڵە زۆر بە کوڵ دەگری و فرمێسکەکانی بەسەر ڕوومەتەکانیا دێنە خوارەوە.. ئینجا پێم وت: وەرە باوکم بزانم بۆ دەگری؟ بۆ نەڕۆیشتیتەوە؟!

بەدەم گریان و هەنسکەوە چەند قسەیەکی کرد، بەڵام هیچی لێتێنەگەیشتم، وتم: کوڕی خۆم تۆ بەجوانی قسە بکە بزانم ئەڵێیت چی، پارەت پێ نیە، کەسێ شەڕی لەگەڵ کردویت؟!

چاوەکانیم سڕی و دانیشتم لەبەردەمیا و ئینجا وتم: قسەم بۆ بکە درەنگە ئەها هاوڕێکانت هەموو ڕۆشتونەتەوە، خانەکە کەسی تیانەماوە، ئەویش وتی: مامۆستا من بچم بۆ کوێ؟!

وتم: ئەی کوڕی خۆم هەموو ساڵێك لە جەژنا ئەم سێ چوار ڕۆژە ناچنەوە سەردانی کەس و کارتان؟

وتی: مامۆستا من کەسم نیە بچمەوە بۆلای، وتم: چۆن دایك و باوکت یەکێکیان نەماوە، وتی: بامامۆستا هەردووکیان ماون، بەڵام بەمن چی؟! وتم: چۆن هەردووکیان ماون؟

وتی: بەڵێ مامۆستا ماون، بەڵام خۆزگەم بە (نەبەن) نەدایکی ماوە و نەباوکی ئەو لێی مەعلومە، بەڵام من بەناو دایك و باوکم

هەیە و دایك و باوکیشم نیە، ئەها مامۆستا کەسیان لێم ناپرسنەوە و نەهاتوون بەلامەوە. ئینجا وتی: مامۆستا من باوك و دایکم لەیەك جیابوونەتەوە، باوکم ژنی هێناوەتەوە و لە هەولێرە، دایکیشم شووی کردۆتەوە بە برایەکی خەیات (بەرگدروو) ماڵی وا لە گوزەری (دارەسوتاوەکە)یە، سێ چوار منداڵی لەو پیاوە هەیە، من منداڵ بووم ئەمە ڕوویداوە، برایەکیشم لەگەڵم بوو، ئەویش ڕۆشتە لای خاڵم، خاڵم بردویەتیە لای خۆی لەگەڵ ئەو ئیش دەکات و نایەت بەلاما.

وتم: کوڕی خۆم خەفەت مەخۆ، چونکە تۆ هەر وانیت. ئەوەتا نەڵێیت نەبەز دایك و باوکی نەماوە، چەندەها منداڵی تریشمان هەیە هەر لە خانەکەدا کە دایك و باوکیان نەماون و ئەنفال کراون.

ئەها کوڕی خۆم، پێغەمبەر ﷺ تۆ خۆت ژیانەکەیت خوێندۆتەوە، کە لەسکی دایکیا بووە باوکی مردووە و لە تەمەنی (٦)ساڵیدا دایکیشی مردووە و لە تەمەنی (٨) ساڵیدا باپیرەشی مردووە، بەمجۆرە هەرجارە یەکێ لە نزیکترین کەسە نزیکەکانی مردوون، بەلام چاك بزانە بۆیە خوا وای بەسەر پێغەمبەردا ﷺ هێنا بۆئەوەی منداڵانی بێ دایك و باوك خەفەت نەخۆن..

هەرچەندە پێغەمبەر ﷺ خۆشەویستی خواش بووە زۆر تەنگ و چەڵەمەی چەشتووە و دژایەتی کراوە، هەروەها لەناو قەومێکی بت پەرست و خوانەناسدا ژیاوە، لەگەڵ ئەوەشدا بۆتە ئازاترین کەس و

رابەر و خەڵکی لەبت پەرستی ڕزگار کردووە، ئیتر ئێستا کاتی ئەم باسە نیە، ئەگەر ناڕۆیتە لای کەس، وەرە لەگەڵ من ئەم سێ چوار ڕۆژە لەگەڵ ئێمە جەژن بکە، وتی: بەخوا مامۆستا من ناچمە لای کەس، ڕووشم نایە بچمە ماڵی کەس، ئەگەر ڕێگەم بدەی من لێرە ئەم چەند ڕۆژە ئەمێنمەوە.!

وتم: ئاخر کوڕی خۆم ئەوە بەدەست من نیە و دەرگای خانەکەش دائەخرێ و خواردنی لێدروست ناکرێ و هەموو دەرگای ژوورەکان داخراوە و باجیەکان ڕۆشتوونەتەوە، تۆ بەبێ خواردن چی دەکەیت؟!

وتی: مامۆستا من پارەم پێیە خۆم خواردن ئەکڕم، تۆ بەس ڕێگام بدە با لێرە بمێنمەوە، گەر دەرگای ژوورەکانیش دابخرێ تەنها بەتانی و سەرینێکم بدەنێ لەو پەنایەدا دەخەوم..

وتم: کوڕی خۆم ئەمە زۆر زەحمەتە و ئینجا ئەوەش بزانە کە ئەمە مەسئولیەتی لەسەرە و بەبێ ڕەزامەندی لێپرسراوی بەشەکە و یان بەڕێوبەری گشتی کاروباری کۆمەڵایەتی دروست نیە، هەستە لەگەڵ من بابچینە ماڵی خۆمان، وەك کوڕی خۆم لەگەڵ منداڵەکانم پێکەوە جەژن دەکەین تا جەژن تەواو دەبێ.

وتی: بەخوا مامۆستا من لەڕووم نایەت لێرەبم باشترە، ئینجا حەرەسەکە وتی: مامۆستا من ئەم سێ چوار ڕۆژە لێرەم، نۆبە حەرەسی من خەمی نان خواردنت نەبێ، چونکە من هەموو ڕۆژێك

خواردنی بۆ دەهێنم، نایەڵم برسی بێ، بەس بە مەرجێ لە قسەم دەرنەچێ و بەملا و بەولادا نەڕوات و تووشی دڵەڕاوکێم نەکات..

گەر ڕێگە بدەن لێرە بمێنێتەوە من وەك کوڕی خۆم ئاگام لێی نەبێ و بەرەلاّی ناکەم. وەئەگەر ڕازی ببن من (٢) منداڵی وەکو ئەمم هەیە، تا بێتاقەت نەبێ ئەیانهێنم لەگەڵی بن، سەردانی جەژنەکەش بکەن، منیش زۆر سوپاسی حەرەسەکەم کرد، بەلاّم وتم: ئەمە وانابێ چاك وایە.. بۆ ئەڵێیت براکەم چۆتە ماڵی خاڵم، تۆ ماڵی خاڵت دەزانی؟

وتی: بەڵێ لە گەڕەکی خەباتە گەر لەوێ مابن. منیش وتم: کەواتە: زۆرباشە هەستە وەرە بابچین بۆ ماڵی خاڵت، سەر لە ماڵی خاڵت بدە و براکەشت ببینە، بزانین چۆنن و جەژنە پیرۆزەشیان لێبکە. ئیتر هەرچی چۆنێك بوو ڕازیم کرد و ڕۆشتین بۆ ماڵی خاڵی، دۆزیمانەوە هەرچەندە خاڵی و براکەی لە ماڵەوە نەبوون، بۆ ئیش چوبون بۆ ئێوارە دەگەڕانەوە، بەلاّم خاڵۆژنی زۆر بە ڕووخۆشیەوە، بەچاوی پڕ بەزەییەوە باوەشی بۆ گرتەوە و ماچی کرد و وتی: با لێرەبێت، ئەم چەند ڕۆژی جەژنە لەگەڵ منداڵەکاندا بێت، لەوانەیە خاڵی و براکەشی پەیدا ببن...

بەمجۆرە تەسلیمم کرد بە ماڵی خاڵی و تۆزێ دڵم ئارامی گرت. بەلاّم زۆر دڵتەنگی و پەژارە و خەمۆکی دایگرتم، بیرم لە سەر

لێشێواوی ئەو منداڵانە ئەکردەوە کە بەهۆی جیابوونەوەی دایك و باوکیان سەرگەردان و سەر لێشێواو دەبن.

جاله دوایدا ئەم منداڵە بێ گوناهە وتی: مامۆستا منیش حەزم دەکرد دایك و باوکم دەستیان بگرتمایە و بیان بردمایە بۆ بازاڕ و شتیان بۆ بکڕیمایە، بەڵام ئەوەتا کەسیان لێم ناپرسنەوە، بۆیە ئەڵێم: دایك و باوکیشم هەیە و دایك و باوکیشم نیە..

بەڵێ ئەمە قوربانیەکی ئەم کۆمەڵگایە، کە ڕەنگە بە سەدانی ئاوەها هەبێ، ئەگەر خانەی بێ سەرپەرشتان ئەمەی جێکردۆتەوە ماڵیان ئاوابێ، ئەی دەیان هەیە لەوێش جێی نەبۆتەوە، کە لە ڕاستیدا خانەی بێ سەرپەرشتانی نەوجەوانان زۆر زۆر باشترە لە لای باوەژن، لەلای باوە پیارە، لە لای مام و خاڵ. چەندین منداڵ بە دەستی باوەژن کوژراوە.



## بەسەرهاتێکی خەمناك

پۆلیسی (هەولێر) لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانیدا ڕایگەیاند کە (ش. م) باوەژنی (ئەیوب یوسف قادر)ی تەمەن پێنج (٥) ساڵ، دانی بە تاوانەکەیدا ناوە کە: چەندین جار هەر لە ئێوارەوە تا بەیانی ئەیوبی (٥) ساڵە لەبەر باران بەستراوەتەوە!!

مانگێك بەر لە مردنی، ئەیوب بەهۆی لێدان و کێشانی بەدیواردا، لەلایەن باوەژنەکەیەوە، قاچ و حەوزی شکێنراوە. دوا جار لە ڕۆژی (٢٠٠٨/٢/١٢) باوەژنەکەی دەست دەخاتە سەردەمی ئەیوب تاگیانی لەدەست دەدات و دەیخنکێنێ! ! (ئەسرینەکان، ل١٧)

لە کۆتایدا جارێکی تر بەو باوك و دایکانەی کە ناکۆکن و خەریکی جیابونەوەن دەڵێین: لەخوا غافڵ مەبن، ئەو منداڵە بێ تاوانە بابەهۆی هەڵەی ئێوەوە گرفتار نەبێ خەڵکی پێی بڵێ: دایکت تەڵاق دراوە! ئای ئەم منداڵە چەند پێی دەشکێتەوە.

ئەی باوك لەخوا غافڵ مەبە و بزانە: هیچ کەس ناتوانێ جێگای دایك بۆ منداڵەکەی بگرێتەوە.

ئەی دایك بزانە: هیچ کەس لە دنیادا ناتوانێ وەکو سێبەری باوك بێ بۆ منداڵەکەی. دەی لەبەر خوا و پاشان دوا ڕۆژی منداڵەکەتان لەیەکتری ببورن و لەیەکتری جیامەبنەوە.



## وانەی شەشەم :

# لە خوا غافڵ مەبە و بەڕێزبە لەگەڵ باوکت

## وانەی شەشەم

## بابەت: لە خوا غافڵ مەبە و بەڕێزبە لەگەڵ باوکت

۞ **قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى:** ﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ۚ إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴿٢٣﴾ وَٱخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ٱرْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِى صَغِيرًا ﴿٢٤﴾﴾ **الإسراء.**

۞ **عَنْ إبنِ مَسْعُودٍ قالَ: سَأَلْتُ النَبِيَّ ﷺ أيُّ العَمَلِ أَحَبُّ إلى اللهِ عَزَّوَجَلَّ؟ قالَ: الصَّلاةُ على وَقْتِها، قالَ ثُمَّ أيٌّ؟ قالَ: بِرُّ الوالِدَيْنِ. قالَ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قالَ: الجِهادُ في سَبيلِ اللهِ)** رَواهُ البُخاريُّ: (٥٩٧٠) و مُسْلِم: (٨٥).

۞ **قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (بِرُّوا آباءَكُمْ تَبَرُّكُمْ أَبْناؤُكُمْ، وَ عِفُّوا تَعِفَّ نِساؤُكُمْ).** ذكره الهيثمي في المجمع: (١٣٨/٨). قالَ المنذري في الترغيب رَواهُ الطَّبَراني بِإسْنادٍ حَسَنٍ.

۞ **عَنْ إِبْنِ عُمَرَ، قالَ: إِنَّ رَجُلاً مِنَ الأَعْرابِ لَقِيَهُ بِطَريقِ مَكَّةَ، فَسَلَّمَ عَلَيْهِ عَبْدُ اللهِ وَحَمَلَهُ عَلى حِمارٍ كانَ يَرْكَبُهُ وَ أَعْطاهُ عِمامَةً كانَتْ عَلى رَأْسِهِ، فَقالَ: إِبْنُ دينارٍ، فَقُلْنا لَهُ: أَصْلَحَكَ**

اللهُ إِنَّهُمُ الأَعْرابُ وَ إِنَّهُمْ يَرْضُونَ باليَسيرِ، قالَ عَبْدُالله: إِنَّ أَبا هذا كانَ وُدّاً لِعُمَرَ بْنِ الخَطّابِ، وَ إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: (إِنَّ أَبَرَّ البِرِّ صِلَةُ الوَلَدِ أَهْلَ وُدِّ أَبيهِ). رَواهُ مُسْلِم: (٢٥٥٢).

## سەرچاوەكان:


١) موسوعة نَظرَة النَّعيم، ج٣، ص٧٦٧.

٢) یاوەرێك بۆ سەركەوتن، هاژە شێروانی، ل٨، ل٤٩.

٣) ندم، هاني درار عُثمان، ص١٣٥.

٤) گۆڤاری (ژیار) ژمارە: ٨، ساڵی دووەم، ٢٠١٣، ل١٧.

٥) گۆڤاری (بڕیار) ژمارە: ٥٧، ئازاری ٢٠١٣، ل٣٨.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العالَمين وَ الصَّلاةُ وَ السَّلامُ عَلى سَيِّدِنا محمد وَ عَلى آلِهِ وَ صَحْبِهِ أجْمَعين:

بەڕێزان و خۆشەویستان: ئەگەر وتیان: کەسێك هەیە لەم ژیانەدا، کە لەناخەوە بە خۆزگەو مەمنونیەوە، حەزدەکات تۆ لەو بالأتر بی، چاکتر و پاکتر و بەختەوەرتر بی، بزانە ئەوە باوکە، باوك ئەو تێکۆشەرە ماندوو نەناسەیە کە بێوچان لە پێناوی خزمەت و بەختەوەری تۆ تاریکی شەو و ڕووناکی ڕۆژ بەیەکەوە گرێ دەدات، خۆشەویستی و دابین کردنی پێداویستیەکانی تۆ، داینەمۆی هێز و وزەی کار و هەوڵی ئەوە بۆ درێژەدان بە کار و خەبات و بەرگە گرتنی ئازار و تاڵیەکانی ژیان..

بۆیە ئەگەر بمانەوێ بە دەڤەری پێناسەی ووشەی باوکدا گوزەر بکەین، دەتوانین بڵێین: لە دڵسۆزی، لە خۆشەویستی، لە خەمخۆری و فیداکاری و پشتیوانیدا بۆ تۆ، باوك سنورەکان تێدەپەڕێنێ و ناتوانرێ پێوانە بکرێت، تۆ کە ئێستا لە بەهاری تەمەنتدای، وەك (شۆڕەبی) وەك نەمامێکی ناسك، کەمێك لە هزر و بیر و ئەزمونت لە خاکی ژیان چەسپیوە، بۆیە بەبەردەوام پێویستیت بە دڵسۆزێك، خۆشەویستێك، خەمخۆرێك، فیداکارێك، چاودێر و پشتیوانێکی بەردەوام هەیە تاوەکو بەسۆز و باوەشی

گەرمی لەزیان و مەترسیەکانی ڕەشەبای سەختی بێ ئاگای و لادان و هەڵخەڵەتاندن و ئارەزووبازی بتپارێزێ.

باوك خاوەنی سەروەتێکە کە تۆی گەنج و لاو پێی نەگەشتووی، ئەویش سەروەتی (ئەزمون)ە، بۆیە لە پێناو هەر ووشەیەك کە ئامۆژگاری تۆی پێدەکات چەندین باجی داوە، ئەو کە ئامۆژگاریت دەکات، دەیەوێ حەقیقەت گەلێك بەتۆ بگەیەنێت کە خۆی وەك مۆم بەهاری تەمەنی لەپێناو تێگەشتنیان تواندۆتەوە..

کەواتە: بێ سڵەمینەوە وە گوێی بۆ بگرە، ڕێزی بگرە، ڕێز لە ماندووبوون و دڵسۆزی و پەرۆشیەکانی بگرە، ڕێز لە موی سپی و حەز و خۆزگەکانی بگرە.

## نهێنی خۆشەویستی باوك!

جگە لەوەی باسمان کرد، کە خۆشەویستی باوك کارێکی خوا کردە، ڕاستیەکی تریش هەیە کە پێویستە باوکان نکوڵی لێنەکەن و منداڵەکانیشیان دەرکی پێ بکەن، دوای پەرۆشییە سروشتیەکان باوك بۆ منداڵ بە تایبەت لەناو کۆمەڵگەی ڕۆژهەلاتی، چۆن منداڵ هەڵگری ناو و شۆرەتی باوکە، بەهەمان شێوەش یەکێکە لە پێوەرە زۆر گرنگەکانی (لێهاتووی و نالەباری، باش و خراپی، سەرکەوتن و شکستی) باوك!!

کەواتە: جگە لەوەی باوك خۆشی دەوێی، بەرژەوەندیەکی زۆریشی لەوەدا هەیە کە تۆ ڕاستە ڕێ بیت و کەسێکی سەرکەوتوو

بیت لە ژیان، چونکە ڕاستەوخۆ سەرکەوتنی تۆ گوزارشتە لە لێهاتوویی و سەرکەوتنی ئەو، بائەم ڕاستیەش والەتۆی گەنج و لاو بکات دوو دڵ نەبیت بە گوێڕایەڵی باوك. گومانت نەبێت لەوەی کە ئەو تائەوپەڕی دڵسۆزی لە خەمی تۆدایە یان بە شێوازێکی تر بڵێین: لە خەمی خۆیدایە!!



## ٣٧ سەعات بەدوای منداڵەکەیدا گەڕا! ‹بەسەرهات›

دەگێڕنەوە لە ساڵی (١٩٨٩)دا، زەمین لەرزەیەکی وێرانکەر لە (ئەرمینیا)یدا، ئەوکات بە گەورەترین زەمین لەرزەکانی سەدەی بیست هەژمار کرا، کە قوربانیەکی زۆری لێکەوتەوە و بەلایەنی کەم (بیست و پێنج) هەزار کەس بوون بە قوربانی لەماوەی چەند خولەکێکدا، لە لایەکی ئەو ناوچەیەدا جوتیارێك خۆی و خانەوادەکەی لەخانوویەکدا دەژیان کەلەگەڵ زەمین لەرزەکەدا خانو و ماڵەکەیان هەژا، بەلآم نەڕوخا..

دوای ئەوەی کە جوتیارەکە دڵنیابوو لە سەلامەتی خێزانەکەی کەڕای کردبووە دەرەوەی ماڵ. یەکسەر بەرەو قوتابخانەی سەرەتاییەکە ڕۆیشت بۆ وەرگرتنی سۆراخی کوڕە تاقانەکەی کە کەوتبووە ناوەندی ناوچەکە، کاتێکیش کە گەیشت بینی کە قوتابخانەکە بەناو یەکا ڕماوە و هیچی نەماوە جگە لە وێرانەیەك،

بە بینینی یەکسەر تاسا و واقی وڕما، بەڵام هەرچەند چرکەیەك بوو کە بەبیری کەوتەوە هەموو کاتێك چی بە کوڕەکەی دەوت:

(لەیادت بێ هەموو کات لەوێ لەلای تۆم لەگەڵتام) و یەکسەر فرمێسك بە چاویدا هاتە خوارەوە و درێژەی نەدایە و فرمێسکەکانی سڕیەوە و بیری کردەوە کە تەپۆلکەترین شوێن کوێیە؟ پۆلی کوڕەکەی دەکەوێتە کوێیوە؟!

هەرچەند چرکەیەك بوو کە هاتەوە هۆش خۆی و زانی کە پۆلی کوڕەکەی دەکەوێتە لای ڕاستی پشتەوەی بینای قوتابخانەکە و بەبێ دوو دڵی ڕایکرد بۆ شوێنەکە و دەستی کرد بە هەڵکۆڵین و فڕێدانی پاشماوەی وێرانی بیناکە، لە کاتێکا کە زۆرێك لە خەڵکەکە بە واقوڕماوی سەیری یەکتریان دەکرد و نەیاندەزانی چی بکەن!!

خەڵکێك هاتن پەلکێشیان کرد و بەرەو دواوە کە بگەڕێتەوە و کەسیانە نەماون و هەموو مردوون، با لە خۆڕایی خۆی ماندوو نەکات، بەڵام ئەم وتی: یارمەتیم بدەن، ئەگەرنا لێم گەڕێن با کارەکەم بکەم، دوای ئەوان پیاوانی ئاگرکوژێنەوە هاتن و وتیان: بەم کارەت مەترسیەك بەرپا دەکەیت؟!

هاواری کرد: ئەگەر یارمەتیم نادەن لێم گەڕێن با کارەکەم بکەم! وتیان: لێی بگەڕێن دیارە شێت بووە، هەر بەردەوام بوو بۆماوەی (٣٧) کاتژمێر بە پچڕان و کاری هەڵکەندنی کرد و پاشماوەی فڕێدا!

دوای ئەوە کە پارچەیەك کۆنکریتی گەورەی لادا، بۆشاییەکی گەورەی بینی و هاواری کرد: (ئەرماند)!!

دەنگێك لە ژێرەوە هات و وتی: بابە ئەوەتا لێرەم، بە هاوڕێکانم وتووە بابەم هەر دێت و من و ئێوەش ڕزگار دەکات. چونکە بەڵێنی پێداوم، کە هەرچی ببێت لەلام دەبێت و لەگەڵم دەبێت، هەر لەم قوتابخانەیەدا (١٤) قوتابی مردن و (٣٣)شیان بە هۆی جوتیارەکەوە دەربازکران!! دواهەمینیان ئارمەند بوو!!

ئەگەر هاتوو چەند کاتژمێری تر دوابکەوتانایە ئەوا چی ڕووی دەدا؟! بێگومان هەموویان مردبوون..

لە دواییدا باوکەکە گەیەنرایە نەخۆشخانە و چەند هەفتەیەك خەوێنرا تیایدا تا چاك بۆوە. ئەمڕۆ ئەم باوکە لە ژیاندا ماوە و لەگەڵ خێزانەکەی و کوڕە ئەندازیارەکەی دەژی. کوڕەکەی هەموو ڕۆژێك بەباوکی دەڵێت: بابە لەبیرت بێت هەچی ببێت من لەگەڵ تۆم، لەلاتم!! (یاوەرێك بۆ سەرکەوتن، ل٨).



**ئەی كوڕ و كچەكان لە خوا غافڵ مەبن بەرامبەر باوكتان و بزانن:**

**یەكەم: خزمەتكردنی باوك (دایك و باوك) وەصیەتی خوایە بۆ بەندەكانی:**

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَـٰنًا ۚ إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴿٢٣﴾ وَٱخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ٱرْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِى صَغِيرًا ﴿٢٤﴾﴾ الإسراء.

واتە: ئەی ئینسان پەروەردگاری تۆ بڕیاری داوە، كە جگە لەو زاتە هیچ شتێكی تر نەپەرستن، هەروەها فەرمانیداوە كە چاك ڕەفتار و جوان كرداریش بن لەگەڵ دایك و باوكتاندا، خۆ ئەگەر یەكێكیان یان هەردووكیان لە تەمەنی پیریدا كەوتنە لای تۆ، ئەوە نابێت تۆ ڕۆژێك لە ڕۆژان ئۆفیان لەدەست بكەیت، هەروەها نابێت لە هیچ حاڵەتێكدا پیایاندا هەڵشاخێیت، بەڵكو هەمیشە و بەردەوام قسە و گوفتارت لەگەڵیاندا چاك و جوان و شیرین و سۆزدار بێت.. هەروەها تۆ بەردەوام باڵی میهر و سۆزیان بۆ نەوی بكە و بڵێ: پەروەردگارا داواكارم كە ڕەحمیان پێ بكەیت و میهرەبان بی

لەگەڵیان، هەروەکو چۆن ئەوان خاوەنی سۆز و میهر بوون بۆ من و منیان بە بچوکی و منداڵی پەروەردەکرد.. (تەفسیری ڕۆشن).

**فەرموودەیەکی پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ:**

عبدالله ی کوڕی مەسعود دەفەرمووێ: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ: ئایا چ کار و کردەوەیەك خۆشەویسترینە لەلای خوای گەورە؟ فەرمووی: نوێژکردن لە کاتی خۆیدا، وتم: دوای ئەوە چی تر؟ فەرمووی: چاکە کردن و خزمەتکردن و بێ دڵی نەکردنی دایك و باوك. وتم: دوای ئەوە چی تر؟ فەرمووی: تێکۆشان و هەوڵدان بۆ گەیاندن و بڵاوکردنەوەی ئاینی ئیسلام، تەنها لەبەر ڕەزامەندی خوا. ئەم فەرموودەیە: (رَواهُ البُخاريُّ: (٥٩٧٠) و مُسْلِم: (٨٥).

## دووەم: ئەی کوڕ و کچ ئاگاداربە و لەپەیامی باوکت تێبگە:

بزانە: زۆرجار پەرۆشی و دڵسۆزی باوك دەگاتە ئاستێك کە ڕەچاوی تەمەن و گۆڕانی بارودۆخ و سەردەم و جیاوازی ڕۆژگار لەبەرچاو ناگرێت. بۆیە کاتێك داواکاریەکی ئاڕاستە کردی کە بەلای تۆوە زەحمەت و ناواقعی بوو، بەدوای جوانترین شێوازی گفتوگۆ و هەڵبژاردنی ووشەی شایستەدا بگەڕێ بۆ ڕازیکردن و قایلکردنی، زۆرجار ئەو بۆشاییەی تەمەن خستویەتیە نێوان تۆ و باوکت دەبێتە

هۆی تێك نەگەیشتن، وەك جۆرێك لەبەر یەك کەوتنی نەوەکان. لەو کاتەدا باشترین ڕێگە بۆ سوود وەرگرتنی تۆ لە ئەزمونی ژیانی باوکت و دەرك کردنی ئەویش بەو بارودۆخەی کە تۆ تێی دا دەژیت، بریتیە لە گفتوگۆکردن بە شێوازێکی جوان و هێمن.

## گەنجێك پەلەی کرد تا لە پەیامی باوکی تێبگات

بەسەرهات

گەنجێك کە لە قۆناغی ئامادەییدا دەیخوێند، لە وەرزی یەکەمی خوێندندا نمرەکانی وەرگرتووە، کە کۆی نمرەکانی (٪٩٦) بوو، زۆر بە خۆشحاڵیەوە گەڕایەوە ماڵەوە و چووە لای باوکی و نمرەکانی نیشاندا و ئەویش پیرۆزبایی سەرکەوتن و دەرچونی لێکرد و لە ئامێزی گرت و بە کوڕەکەی وت: چیت دەوێ داوای بکە بۆت دەکڕم. یەکسەر کوڕەکە بە پەلە وەڵامی دایەوە و وتی: ئوتومبێلێکم دەوێ کە ئاوایە و ناو و مۆدیلی ئەوەیە.. باوکەکە بە زەردەخەنەیەکەوە وتی: بەسەرچاوان.

لەگەڵ ئوتومبێلەکەدا شتێکی گەلێ گرانبەهاترت لە ئوتومبێل پێشکەش دەکەم. بەڵام بە مەرجێك، ئەویش ئەوەیە: ئەمە وەرزی یەکەمە و کۆتایی ساڵت لەبەردەم ماوە. ئەگەر توانیت لە تاقیکردنەوەکانی کۆتایی ساڵدا نمرەی چاکتر و بەرزتر بەدەست بهێنی. ئەوا منیش بەڵێنەکەی خۆم دەبەمە سەر.. کوڕەکەش بە

ڕەزامەندیەوە بەڵێنی دا... بەڵێ ڕۆژ و هەفتە و مانگ تێپەڕین و کۆتایی ساڵ هات و کوڕەکە نمرەکەی بوو بە (٪٩٨). زۆر بە دڵخۆشی و ڕووگەشی و دەنگ بە گۆرانی و هەڵبەز و دابەز گەیشتەوە ماڵەوە و خێرا بانگی کرد: بابەگیان.. بابە گیان.. بابەگیان.. بەڵام دەنگی باوکی نەبیست، چوو دەست و سەری دایکی ماچ کرد و وتی: کوا باوکم دەڵێی لەماڵ نیە؟!

وتی: نا ڕۆڵەگیان لە نوسینگەکەیەتی ئێستا دێتەوە، کاتێ باوکی گەڕایەوە و نمرە بەرزەکانی کوڕەکەی بینی، وتی: هەی ئافەرم بەڕاستی تۆ بەڵێنی خۆت هێنایە جێ. ئێستا نۆرەی منە بەڵێنەکەم جێبەجێ بکەم. فەرموو: ئەمە ئەوەی بڕیارمدابوو پێشکەشتی بکەم.

کە کوڕەکە کردیەوە صندوقێکی ڕازاوە بوو، قورئانێکی چاپی زۆر جوانی تێدابوو.. کوڕەکەی واقی وڕما و وتی: دوای ئەو هەموو هەوڵ و ماندووبوونەم قورئانێکم پێدەبەخشی؟! خۆ مزگەوت پڕە لە قورئان!!

یەکسەر قورئانەکە کە لە صندوقەکەدا بوو هەڵیگرت و بە دەم و چاوی باوکی کێشا و بە توڕەییەوە ڕۆشت و وتی: شەرتبێ سەر بەو ماڵەدا نەکەمەوە، دوای چەند مانگێ کە ئەم کوڕە لە ماڵی پور و خزمانی بەسەری دەبرد، لەم کردارەی پەشیمان بۆوە، بەڵام دوای

ئەوەی باوکی لە ئەنجامی ئەو کردارە ناشرین و بێ ئەدەبیەی کوڕەکەی کردی تووشی نەخۆشیەکی سەخت بوو مرد!!

ئەمجا کوڕەکە زۆر پەشیمان بوو. چوو ئەو قورئانەی کە باوکی پێشکەشی کرد و ئەم کێشای بە دەم و چاویدا، لەسەر مێزی باوکی دانرابوو، چوو قورئانەکەی هەڵگرت و لە صندوقەکە دەری هێنا بۆ ئەوەی ماچی بکات و بیخوێنێ.. بەڵام تووشی سەرسوڕمان بوو! کە بینی سویچی ئوتومبێل و نامەیەکی لەژێردایە، کە نامەکەی خوێندەوە نوسرابوو:

کوڕی خۆشەویستم ئەمە سویچی ئەو ئوتومبێلەیە کە داوات کردبوو. لە فلان مەعرەزە بڕۆ وەری بگرە، بەڵام لە ئوتومبێلەکە و لە هەموو دونیا و هەموو بونەوەر بەنرختر ئەو قورئانەیە کە ئومێدەوارم لە خزمەتی دابی و بیخوێنی و کاری پێبکەی، ئەمجا سوود لە ئوتومبێلەکەت دەبینی. بەهیوای سەرکەوتنتم، باوکت (..).. کاتێ کوڕەکە ئەمەی خوێندەوە تووشی شۆك بوو، یەکسەر لەرزی گرت و کەوت بەلادا و شەلەل لێی دا و تەنها توانای گریانی هەبوو!! (ندم، هاني درار عُثمان ص١٣٥).

## سێهەم: کوڕ و کچی لاو بزانە باوکت پشتیوانت بوە:

تا بە ئەمڕۆ گەشتووی باوك وەك پشتیوان و دڵسۆزێك لە پشتت وەستاوە و بۆ زەحمەتی و نەهامەتیەکانی ژیان بە تەنها جێی

نەهێشتووی، ئەمڕۆش وائەو باوکە خەریکە دەکەوێتە بەردەستی تۆ! بەڵام چۆن؟! لەوەتەی تۆ گەورە بوویت و هەوڵی سەربەخۆیی دەدەیت و لە بڕیار و کردارەکانت ئیدی وەك کەسێکی گەورە حیسابت بۆ دەکرێ.

ئێستا تۆی قوتابی و گەنج کردارەکانت گوزارشت لەو پەروەردەیە دەکەن کە تۆ پیایدا تێپەڕیوی، ئێستا کردار و گوفتارە جوانەکانت باشترین شاخەڵاتی دەستی تۆن بۆ ئەندامانی خێزانەکەت بە گشتی و باوکت بە تایبەتی. ڕەزامەندی باوك ڕەزامەندی خوای گەورەشی بەدواوەیە. ڕەزامەندی خوای گەورەش ئەو ئامانجەیە کە بۆی هاتووینەبوون و بەم پایە گرنگەش ئێستا و داهاتوت لە هەردوو جیهانی دونیا و دواڕۆژ ڕۆشن و گەشاوە دەبێت. کەواتە: خۆت بەدوور بگرە لەهاوڕێی خراپ و ناشایستە کە دەبێتە هۆکاری لە ڕێ لادانت و دواکەوتنت لە خوێندن، ئێستا کەسایەتی باوکت کەوتۆتە بەردەستی تۆ. دەی کەوایە تۆش بێ بەزەیی مەبە لەبەرامبەر ئەو هەموو دڵسۆزی و خەمخۆریەی باوکت. بۆی ببە بە بەشێك لە شانازی و سەروەری و باری سوکی ژیانی، نەك ببی بە بارێکی زەحمەت و کوێرەوەری و هەموو چرکەیەك و لەگەڵ هەر هەناسەیەکدا داخ و حەسرەتی پێ بنۆشی..

باوك و هەوڵ و هەڵپەی بێ وچانی داوە لە پێناو پاراستنی کەسایەتی خۆی، ئەو کەسایەتیەی کە ئێستا هەیەتی و تۆ

دەبینی، سەروەتی ژیانی ئەوە، بەرهەمی تێکڕای تەمەن و خۆ پارێزی و دانبەخۆدا گرتن و خۆگرتنەوە لە حەز و ئارەزووەکانی نەفس. بێگومان ئەو کەسایەتیەی زۆر جار لەلایەن نەیارەکانیەوە هەوڵی تانە و تەشەر لێدانی کراوە، بەڵام شێلگیرانە هاتۆتە دەست و بەرگری لەخۆی کردووە و لە ڕێگای خۆ پاراستنیەوە بە سەلامەتی ڕزگاری بووە..

کەواتە زۆر حەیف و مەخابنە ئێستا تۆی جگەر سۆز و ڕووناکی چاوەکانی بابە هۆی هەندێ ڕەفتار و گوفتار و حەز و ئارەزووی کاتی و منالآنە و ناشایستە پاکی و گەورەیی ئەو کەسایەتیە لەکەدار بکەیت و ببیتە مایەی خەم و دڵتەنگی بۆی، هەرگیز دیمەنی خەمناکی ئەو باوکەم لەیاد ناچێت، کەوەك ئامۆژگاری کار و ڕێنوێنێك ناسرابوو، بەڵام لە بەرامبەر لۆمەی کاروڕەفتارە نەشیاوەکانی ڕۆڵەکەی ڕەنگی ڕەش هەڵگەڕابوو، هەستی بە شانازی نەدەکرد، لەو چرکە ساتانە پەشیمان بوو، کە بە هاتنە دونیای ئەو ڕۆڵەیە شاد و ڕوو بە خەندە بوو..

بۆیە لەبن لێوەوە بە ناچاری دەیگوت: ئەگەر لەبەر سەرپێچی ئاینەکەمان نەبوایە، خۆزگەم دەخواست ڕێگری پرۆسەی هاوسەرگیری بکرایە لەوانەی کە کاری بانگەوازی ئاینی و ئامۆژگاری و ڕێنوێنی دەکەن، تا بەم شێوەیە نەبوونایەتە ئەسیر و کۆیلەی هەڵە و پەڵە و هەوەسبازی منداڵەکانیان، تابەهۆی خراپەکاری

ئەوانەوە کەسایەتیان لەکەدار نەبوایە و ڕاستگۆییان نەکەوتایەتە ژێر پرسیارەوە، دەی کەواتە: ئێوەی تازە پێگەیشتوان، قوتابیان و خوێندکارانی ئازیز، دەرك بەم بەرپرسیاریەتیە مەزنە بکەن و ئاگاداری وورد و درشتی ئاکار و ڕەفتارەکانتان بن، هەمیشە لە خەمی ئەوەدابن ببنە مایەی شانازی بۆ خێزان و خانەوادە و ئاین و خاك و نیشتیمان و نەتەوەکەتان و بەڵکو مرۆڤایەتی بەگشتی... (گۆڤاری (ژیار) ژمارە: ٨).

بەڵێ باشترین پاداشت بۆ باوك بریتیە لەوەی کاروکردەوەیەك بکەی کە خەڵکی ڕەحمەتی بۆ بنێرن، چەند سەرفرازە ئەو باوکەی کە لە خوێندنگاکەدا لە کاتی کۆبونەوەی باوکاندا، مامۆستایان وەکو نمونەی ئەدەب و ڕەوشت بەرزی و زانست و زیرەکی ناوی دێنن، یان ئەو باوکە چەند هەست بە حەسانەوە دەکات کەکاتێ کوڕەکەی لە پلەیەکی فەرمانبەریدایە و ئەوەندە هاوکاری خەڵکی کردووە، کە هەزار ڕەحمەت بۆ باوکی دەنێرن..

## چوارەم: ئەی کوڕ و کچی لاو لە پیریدا، باوکت پشتگوێ مەخە:

لەو کاتەدا کە باوکت چۆتە تەمەنەوە و پیر بووە پشت گوێی مەخە، ئەو کەمتەرخەمی نەکرد، نەك کەمتەرخەمی، بەڵکو هەموو ژیانی هەموو لاوی و جوانی خۆی کردە قوربانی بۆ سەرفرازی تۆ،

بۆ خۆشبەختی تۆ.. بۆئەوەی تۆ چاو لە دەستی کەس نەبی، بۆئەوە تۆ نانی گەرم و باش و بەسوود بخۆی و بەپاك و خاوێنی بژی و لە ماڵی گەرم و گوڕدا ئاسودە بژی، دەی ئێستا تۆ بویتە گەنج و لاو و ئەو وەکو کاتی منداڵی تۆی لێهاتۆتەوە. مامۆستا هەژار لە وەرگێڕانی شعرێکی (د. عەلی شەریعەتی) دا، چەند جوان لە زمانی شیرینی خۆمان باسی حاڵی پیرەمێردێکی بەساڵاچوو دەکات، کە تەمەنی لاویەتی کۆتایی پێهاتووە و دەفەرمووێ:

ئێستا چی لەپاش سەد ساڵی چویتەوە دەقی منداڵی.
چاو نابینێ، گوێ ناژنەوێ دانت نەما شیرت دەوێ.
یەخسیری لەناو جێگادا مۆرەغەت زەوی بەرنادا.
لەوە ڕزیان ئاغڵەب خەوتووی بێهێز و پێز لەکار کەوتووی.
هەر سێ کارت ماوە لە ژیان خواردن و ڕینەوە و گریان.

(یەك لە پەنای خاڵ و سیفری بێ بڕانەوە، د. عەلی شەریعەتی، و: هەژار).

جا ئێستا نۆرەی تۆیە بە جوانی خزمەتی بکەی، لە خزمەتی دابی، لەم کاتەدا لەخوا غافڵ مەبە، بەهۆی ژن و منداڵت، ماڵ و مێردت، خوێندن و کاروبارت.. میوانی و سەردانت و سەیرانت.. ئەم باوکە بەساڵاچووەت لەیاد مەکە، بەتەنها لە ماڵەوە جێی مەهێڵە،

لە ژوورێکی تەنهادا، با هەموو پێداویستیەکانیشی تێدابێ جیای مەکەوە، ئەوە بزانە چەندە لایەنی ماددی و خۆراك و جل و بەرگ و جێگای خەوتنی باشی پێویستە، دەیان و سەدان ئەوەندە پێویستی بەوە هەیە کە قسەی خۆش و گفتی شیرین و بەیەکەوە دانیشتن و پرس و ڕا پێکردنیەتی..

جارێکیان برایەکی گەنجی مسوڵمان گێڕایەوە و وتی: باوکم تووشی نەخۆشی شێرپەنجە ببوو، لە جێگادا کەوتبوو، زۆر زەلیل بوو، هەژاریش بووین، بەڵام بۆ ئەوەی باوکم لەگەڵ ئازاری نەخۆشیەکەیدا هەست بە ئازاری هەژاری و دەستکورتی نەکا، وا هەست نەکا ئێمە ئەو بەخێو دەکەین. دەچووین پارەمان بە دزیەوە دەخستە گیرفانی باوکمەوە و ڕۆژانە بۆ پێداویستی ماڵ داوای پارەمان لەو دەکرد، تاوەکو هەست بکات کە هەروەکو جاران گەورەی ماڵە، هەتا کۆچی دوایی کرد هەر ئێمە پارەمان لە دەستی ئەو وەرگرت!!

فەرموودەیەك پێشەوا و سەروەرمان، کە ئاگادارمان دەکاتەوە و دەفەرمووێ: لەخوا غافڵ مەبە و بزانە چۆن بی لەگەڵ باوك و دایکتدا، منداڵەکانت لەدوا ڕۆژدا ئاوادەبن بەرامبەرت.

**قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (بِرُّوا آباءَكُمْ تَبَرُّكُمْ أَبْناؤُكُمْ، وَ عِفُّوا تَعِفَّ نِسَاؤُكُمْ). ذكره الهيثمي في المجمع: (١٣٨/٨). قالَ المنذري في الترغيب رَواهُ الطَّبَراني بِإسْنادٍ حَسَنٍ.**

## ژوورەکەی دایە و بابە !

وەك هەموو ڕۆژەکانی دی، دایکیان سەرقاڵی هاوکاری و یارمەتی دانی منداڵەکانی بوو، لە پێداچوونەوەی وانەکانیان و بەجێهێنانی ئەرکی قوتابخانەیان، لە هەمان کاتدا بە مەبەستی سەرقاڵکردنی منداڵە بچوکەکەی بۆ ئەوەی وانەکان لە منداڵەکانی دیکە تێك نەدات، پەڕاوێکی وێنەکێشانی دایە دەستی تا وێنەی تێدا بکێشێت، لەناکاو بیری هاتەوە کە نانی ئێوارەی نەبردووە بۆ باوکی هاوسەرەکەی، واتە (خەزوری). کە پیاوێکی بەساڵاچووبوو، لە ژوورێکی بچکۆلانەدا کە لە نێو حەوشەیماڵەکەدا بۆیان دروست کردبوو، ژیانی دەگوزەراند..

ئەم ئافرەتە بە پێی توانا خزمەتی دەکرد و هەموو ژەمێك خواردنی بۆ ئامادە دەکرد و پێشکەشی دەکرد، ئەو ئێوارەیە لەبیری کردبوو لە کاتی خۆیدا خواردنی بۆ ببات، کاتێك بیری هاتەوە بە منداڵەکانی گوت: ئێوە سەرقاڵی ئەرکەکانتان بن، تامن خواردن بۆ باپیرەتان ئامادە دەکەم، بەپەلە ڕۆشت و خواردنی ئێوارەی بۆ بردوو پێی گوت: هەر پێویستیەکت هەیە پێم بڵێ تابۆت جێبەجێ بکەم، دوای جێبەجێ کردنی داواکاریەکانی گەڕایەوە لای منداڵەکانی سەیری کرد، منداڵە بچوکەکەی وێنەی چەند بازنە و چوارگۆشەیەکی کێشاوە، پێی گوت: خۆشەویستەکەم ئەوە وێنەی چیت کێشاوە؟!

منداڵە بچکۆلانەکەش زۆر بەریئانە گوتی: من وێنەی ئەو خانوەم کێشاوە کە کاتێك گەورەبووم و ژنم هێنا پێکەوە لەو خانوەدا دەژین، دایکی گوتی: باشە کوا ژووری نوستنەکەتان؟!

منداڵەکەش دەستی خستە سەر چوارگۆشەیەك و گوتی: ئەوە ژووری نوستنەکەمانە، ئەو چوار گۆشەیەی دیکەش چێشتخانەیە، ئەوەی دیکە میوانە و ئەوی تریش هۆڵە، لە دووری ژوورەکانی خۆیان، واتە چوارگۆشەکان، چوارگۆشەیەکی کێشابوو، کە جیابوو لە ژوورەکانی دیکە، دایکی بە سەرسوڕمانەوە وتی: ئەی ئەو چوارگۆشەیە ژووری کێیە؟!

منداڵەکەش وتی: ئەوە ژووری تۆیە، چونکە دەبێت ژوورەکەی تۆ لەدەرەوەی ماڵەکەی ئێمە بێت، هەروەکو ئەو ژوورەی کە ئێستا باپیرەمی تێدا دەژی، دایکەکە بە بیستنی ئەم ووشەیە لە زاری منداڵێکی ئاوا بچوکەوە تاسا، بەسەرسامیەوە پرسی: ئایا دەتەوێت من لە نێوان چەند دیوارێکدا بە تەنها بژیم، دوور لە ئەندامانی خێزانەکەم؟! دایکەکە تێگەیشت کە ئەو ئاوەی ئەوان ڕشتویانە، سبەینێ منداڵەکانیان پێی لێ دەخشێنن، هەر بۆیە بەپەلە ڕۆشت و ژوورەکەی خەزووری گواستەوە بۆ نێو جوانترین ژووری ماڵەکەیان!!

کاتێك هاوسەرەکەی گەڕایەوە ماڵ و ئەو گۆڕانکاریە گەورەی بینی، پرسی: هۆکاری ئەم گۆڕانکاریە چیە؟ بە چاوی پڕ لە

فرمێسکەوە وتی: من جوانترین ژوورم هەڵبژاردووە، تا لە ئایندەدا و، لەو کاتەی خوای گەورە تەمەنی پێداین و بەساڵاچووین، پێکەوە لەو ژوورەدا ژیان بگوزەرێنین!! هاوسەرەکەی لە مەبەستی خێزانەکەی تێگەشت و زۆر سوپاسی کرد، دواتر منداڵەکەش بە پێکەنینەوە وێنەکەی سڕیەوە..

## پێنجەم: دوای مردنی باوکت لە یادی مەکە و هەمیشە دڵسۆزی بە..

بە دڵنیاییەوە هەموو ئەوانەی باوکیان لە ژیاندا نەماوە، ئێستا ئاواتەخواز و تامەزرۆی ئەوەن کە باوکیان لە ژیاندا بوایە و بچونایەتە خزمەتی و هەردوو دەستیان ماچ بکردایە، هیچ کات بێ فەرمانی باوکیان نەکردایە، بەڵام تازە ئەوە لە دەست چوو، بائەوانەی کە ئەو دەرفەتەیان لەبەردەستدا ماوە و باوکیان لە ژیاندایە سوودی لێوەربگرن، وە ئەوانەشی کە باوکیان کۆچی دوایی کردووە، دەتوانن ئێستاش چاکەکاربن لەگەڵ باوکیاندا، بەوەی کە هەمیشە دوعای خێری بۆ بکەن و بڵێن:

خوایە گیان لە باوکم خۆشبە، ئەو دوعا و پاڕانەوەیە هەمیشە بە باوکت دەگات و خوای گەورە لە گوناهی خۆش دەبێت و پلەی لە قیامەتدا بەرز دەکاتەوە. وە هەروەها لە خێر و خێرات بێ بەشی مەکە. لە هەر جێگایەك قوتابخانەیەك، مزگەوتێك، نەخۆشخانەیەك،

کرایەوە دروستکرا، بیرە ئاوێك لێدرا، ڕێگا و بانێك چاك کرا، تۆ ئەوەی لە تواناتدایە خێری باوکتی تێ بکە. دڵنیاش بە خوای گەورە ئەو خێر و پاداشتە بە باوکت دەگەیەنێ و لە خێر و پاداشتی تۆش کەم ناکاتەوە..

هەروەها ڕێزی ئەو کەسانە بگرە و هاوکارییان بکە و بەسەریان بکەوە لە کاتی خۆی دۆستی باوکت بوون، کە خۆشەویستی باوکت بوون، دۆستایەتیان مەپچڕێنە. بابزانین هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن بوون لەم بارەیەوە:

ڕۆژێکیان عەبدوڵڵای کوڕی ئیمامی عومەر، لە ڕێگادا بوو بەرەو مەککە دەهاتەوە، لە ڕێگادا تووشی پیاوێك بوو، کە بە پیادە دەڕۆشت و لەبەر هەژاری نەیتوانی بوو، مێزەر بکاتە سەری و لەگەرمای بیابانی عەرەبی بیپارێزێ.. بۆیە عبدالله کە ئەم پیاوەی بینی یەکسەر بە گوێدرێژەکەی دابەزی و بەزۆر کابرای سوار کرد و خۆی بە پێ ڕۆشت و مێزەرەکەی خۆی دانا و خستیە سەری پیاوەکە و پێی بەخشی..

لەو کاتەدا (إبن دینار) لە خزمەتیدا بوو، دەڵێ: عەرزمان کرد، قوربان، خوا چاکت بۆ بکا و بەخشندەتر و بە حورمەتترت بکات، قوربان ئەمانە عەرەبی بیابانن و بەکەمێك هاوکاری و یارمەتی ڕازین، بۆچی خۆت ماندوو کرد و ئەوت ئاوا خزمەت کرد؟!

عبدالله ی کوڕی ئیمامی عومەری کوڕی خطاب فەرمووی: بەڕاستی باوکی ئەم پیاوە یەکێ بوو لە دۆستە هەرە خۆشەویستەکانی باوکم وە منیش لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووە کە فەرمووی: (إِنَّ أَبَرَّ البِرِّ صِلَةُ الوَلَدِ أَهْلَ وُدِّ أَبيهِ). رَواهُ مُسْلِم: (٢٥٥٢).

## موژدەت لێبێت.. ‹بەسەرهات›

گەنجێك دەڵێت: من و خاڵم بە ئوتومبێلەکەمان ڕێگای گەڕانەوەمان گرتەبەر، دوای ئەوەی نوێژی هەینیمان لە شاری مەککە ئەنجام دا، دوای ماوەیەك مزگەوتێکی کۆن و کەلاوەمان کەوتە سەر ڕێگا، کە هەموو جارێك دەمانبینی لەگەڵ هەموو ئەوانەی بەم ڕێگایەدا تێپەڕدەبوون، بۆیە منیش بەرەولای مزگەوتەکە چووم و سەیرم کرد.. لەم کاتەدا سەرنجم بۆ شتێکی سەیر ڕاکێشرا، بینیم کە ئۆتۆمبێلێك لەوێ وەستاوە چەند چرکەیەك وەستام و سەیرم کرد ئەمە لێرە چی دەکات؟!

لە دوایدا بەپەلە بڕیارمدا و خێراییەکەم کەمکردەوە و چوومە سەر ڕێگا خۆڵەکە بەرەو مزگەوتەکە، لەناو سەرسوڕمانی خاڵمدا کە پرسیاری لێ دەکردم: چی بووە؟! چی ڕوویداوە؟! ئوتومبێلەکەمان ڕاگرت و چوینە ناو مزگەوتەکە و گوێبیستی دەنگ

خوێندنی قورئان و گریانێك بووین، کە سورەتی (الرحمن)ی دەخوێند..

لەم کاتەدا پێم باشبوو کە لە دەرەوە بوەستین و گوێی لێبگرین، بەڵام حەزکردنم بە زانینی ئەوەی کە لە مزگەوتەکە ڕوودەدات نەمتوانی چاوەڕێ بم و چوومە ژوورەوە بۆئەوەی بزانم چی ڕوودەدات لەم مزگەوتە وێرانەدا کە هەتا باڵندەیەکیش بەلایدا تێناپەڕێت.. بۆیە چوینە ژوورەوە و بینیمان گەنجێکە بەرماڵەکەی ڕاخستووە و قورئانێکی قەبارە بچوکی لەدەستدایە و دەیخوێندەوە، کەسیشی لێنەبوو جگە لەو، بەڵێ کەسی لێنەبوو جگە لەو.. بۆیە من سلاّوم لێکرد و ئەویش وەکو ئەوەی کە ترسابێت لێمان وەلاّمی سلاّوەکەی داینەوە، پرسیارم لێکرد ئایا نوێژی عەسرت کردووە؟ چونکە ئێستا کاتیەتی و دەمانەوێت نوێژەکەمان بکەین. وەلاّمی دایەوە: نەخێر..

کاتێکیش ویستمان دەستبکەین بە نوێژکردن بینیمان کە سەیرێکی قیبلەی کرد و زەردەخەنەیەکی کرد، بەڵام نەمزانی بۆ کێ و بۆچی؟ نەمزانی!! کتوپڕ گەنجەکە شتێکی وت کە تووشی شۆکی کردم!!

زۆر بەڕوونی وتی: مژدەت لێبێت.. نوێژی بە جەماعەتیش، بۆیە بەسەرسوڕمانەوە خاڵم سەیری کردم و منیش خۆمم لێی بێ ئاگاکرد، بۆیە دەستم کرد بە نوێژکردن و فکریشم سەرقاڵ بوو بەو

شتەی کەوتی: مژدەت لێبێت نوێژی جەماعەتیش!! باشە دەبێ لەگەڵ کێ قسە بکات کە جگە لە ئێمە کەسی تری لێ نیە؟ مزگەوتێکی چۆڵ و بێ خزمەتە، ئایا دەبێت شێت بێت؟

دوای نوێژەکەمان بە جەماعەت ڕوومکردە گەنجەکە و سەیرم کرد کە هێشتا خەریکە تەسبیحات و زیکرەکانی دوای نوێژ دەخوێنێت. پرسیم براکەم چۆنی؟ وەڵامی دایەوە: باشم سوپاس بۆ خوا، وتم: خوا لێت خۆش بێت، لە نوێژەکەم سەرقاڵت کردم. پرسی: بۆچی؟ وتم: کاتێك من ویستم دەستبکەم بە نوێژ کردن گوێم لێت بوو شتێکت وت!!

پێکەنی و وتی: باشە چی تێدایە؟ وتم: هیچ، بەڵام لەگەڵ کێ قسەت دەکرد؟ زەردەخەنەیەکی کرد و سەیرێکی زەویەکەی کرد، وەکو ئەوەی بیربکاتەوە... ئایا پێم دەڵێیت یان نا؟

بۆیە منیش بەردەوام بووم لەقسەکردن، وتم: شێوە و سیمات کەسێکی زۆر هێمن دیاریت لەوە ناچێت کە شێت بیت، لەگەڵ ئێمەش نوێژت کرد، ماشەڵات لێ بێت..

سەیرێکی کردم و وتی: لەگەڵ مزگەوتەکە قسەم کرد! ووشەکانی لەم کاتەدا وەکو بۆمبێك بوون بۆ من، وایکرد کەمێك بیربکەمەوە، ئایا دەبێت بەڕاستی شێت بێت!! وتم: بەڵێ، لەگەڵ مزگەوتەکە قسەت دەکرد، ئایا وەڵامی دایتەوە؟ زەردەخەنەیەکی کرد و وتی: وتم ئێستا تۆمەتبارم دەکەی بە شێتی، ئایا بەرد قسە

دەكات؟! ئەمە تەنها بەردە، بۆیە منیش زەردەخەنەیەكم بۆ كرد و وتم: ڕاستدەكەیت، مادام ئەو نە وەڵام دەداتەوە و نەقسەش دەكات بۆچی قسەی لەگەڵ دەكەیت؟

بۆ ماوەیەكی تریش بێ دەنگ بوو، سەیرێكی زەویەكەی كرد و بە قسە هاتەوە بێئەوەی سەری بەرز بكاتەوە، وتی: من كەسێكم مزگەوتم زۆر خۆشدەوێت، دەگەڕێم بەدوای مزگەوتێكی چۆڵ و وێراندا، كاتێكیش كە بیردەكەمەوە لەوكاتەی خەڵك نوێژی تێدا كردووە و لەگەڵ خۆمدا دەڵێم، خوایە گیان دەبێت ئێستا چەند بیری ئەو كەسانە بكات كە نوێژی تێدا دەكەن؟

دەبێت چەند بیری زیكری خوا بكات، هەستی پێ دەكەم كە بیری تەسبیحات و تەهلیلە و زیكركردنە، هەست دەكەم ئەم مزگەوتە هەست بە نامۆیی دەكات لەناو مزگەوتەكانی تر، بیری تەنها یەك سوژدە دەكاتەوە، كاتێكیش كە ڕێبوارێك ـ الله أكبر ـ دەڵێت، بەخۆم دەڵێم بەخوای دەبێت ئەم بیركردنەوەیەت بۆ پڕبكەمەوە، سوێند بە خوا دەبێت هەندێك لە ڕۆژەكانت بۆ بگێڕمەوە و بەم شێوەیە دێمە ناو مزگەوت و دوو ڕكات نوێژ دەكەم و یەك جوزئی تەواوی تێدا دەخوێنمەوە، پێم مەڵێ كارێكی سەیر دەكەیت، سوێند بە خوا من مزگەوتم خۆشدەوێت..

بە قسەكانی چاوەكانم پڕ فرمێسك بوون و سەیری زەویەكەم كرد بۆئەوەی فرمێسكەكانمی لێبشارمەوە، لەبەر كاریگەری

قسەکانی، هەستەکانی، شێواز و هەڵسوکەوتی، کارە نامۆییەکەی لەم پیاوەی کە دڵی پەیوەستە بە مزگەوتەوە لەم ساتەدا نەمزانی چی پێ بڵێم، تەنها توانیم کە بڵێم: خوای گەورە جەزای خێرتان بداتەوە. بەم جۆرە خواحافیزیم لێکرد و داواملێکرد لەدواعا و پاڕانەوەکانی لەبیرمان نەکات..

ئالەم ساتەدا سەرسوڕهێنەرترین شت ڕوویدا، لەوکاتەی کە دەمویست لە مزگەوتەکە دەربچم، گەنجەکە هێشتا سەیری زەوی دەکرد و، وتی: دەزانی چ دوعایەك دەکەم کاتێك لەم مزگەوتە دەردەچم؟ دوای ئەوەی کە نوێژم تێدا کرد؟!

منیش بە سەرسوڕمانەوە سەیرمکرد، ئەویش بەردەوام بوو لە قسەکردن، وتی: دەڵێم: خوایەگیان تۆ خۆت دەزانی من یاوەری یاد کردنەوەی ئەم مزگەوتەبووم، بە زیکری گەورەیی تۆ. بە قورئانە پیرۆزەکەت، بەتەنها لەبەرخاتری تۆ ئەی خوای بەڕەحم و بەزەیی، بۆیە تۆش یاوەری باوکم بکە لە گۆڕەکەی کە هەر خۆت بە ڕەحمترینی، لەم ساتەدا و بە بیستنی ئەم قسانەی هەستم بە تەزوویەك کرد کە سەراپای جەستەی داگرتم. وەکو منداڵێکی بچوك دەستم کرد بە گریان.

ئای ئەمە چ جۆرە وەفاداریەکی بەرز و بەڕێزە بەرامبەر بە باوك؟!. (یاوەرێك بۆ سەرکەوتن ل٤٩).

## وانەی حەوتەم :

ئاگاداری دڵی دایکت بە.

## وانەی حەوتەم

## بابەت: ئاگاداری دڵی دایکت بە

۞ قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وَ تَعالى: ﴿وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَـٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٤﴾﴾ لقمان.

۞ جاءَ رَجُلٌ إلى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقالَ: مَنْ أَحَقُّ النّاسِ بِحُسْنِ صَحابَتي؟ قالَ: أُمُّكَ، قالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قالَ: ثمَّ أُمُّكَ، قالَ ثُمَّ مَنْ؟ قالَ: ثُمَّ أُمُّكَ، قالَ: ثُمَّ مَنْ؟ قالَ: ثُمَّ أَبُوكَ) رَواهُ البُخاريُّ: (٥٩٧١) وَ مُسْلِم (٢٥٤٨).

۞ قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (إِنِّي لَأَدْخُلُ في الصَّلاةِ، وَأَنا أُريدُ إِطالَتُها فأَسْمَعُ بُكاءَ الصَبِيِّ، فَأَتَجَوَّزُ مِمّا أَعْلَمُ مِنْ شِدَّةِ وجدِ أُمِّهِ مِنْ بُكائِهِ). متفق عليه، بُخاري: ٧٠٩) و مُسْلِم: (٤٧٠).

## سەرچاوەکان:

١) جريدة (الأُفق الجَديد) الأُسْبُوعِيَّة، العَدَد: ٤٩٢، (٢٠١٣/٥/٧) ص١٠.
٢) ندم، هانی درار عُثمان، ص١٢١.
٣) ڕۆژنامەی یەککرتوو، ژ: ٩٣٤، ل٩.
٤) یاوەرێك بۆ سەرکەوتن، هاژە شێروانی، ل٦٣، ٧٣.
٥) گۆڤاری (بڕیار) ژ: ٦١، ل٣٩.
٦) گۆڤاری (بڕیار) ژ: ٦٠، ل٣٩.
٧) قِصَصٌ أَبْكَتْني، سالم مريشد، ص٢١.
٨) بالانس، ئەندازیار عُثمان، ل١١٦.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العالَمين. وَالصَّلاةُ وَ السَّلامُ عَلى سَيِّدِنا محمد وَ عَلى آلهِ وَ صَحْبِهِ أجْمَعينَ:

ووشەی (دایك) ئەو ووشە ناسك و خۆشەویستەیە، کە خۆشەویستی لەناو هەموو دڵێکی پاکدایە، ووشەی بەڕێزی (دایك) بۆنی خۆشترە لە بۆنی خۆشی یاسەمین و ڕەیحانە و میسك، وە لەهەموو بۆنێکی تری خۆش لە گوڵزاری لالەزاری بۆنەخۆشە دڵڕفێنەکان. ئای چەندە گوێمان لەم ووشە ناسکە جوانە دەبێت، چەندە زیاتر لە دووبارە ببێتەوە لە گوێماندا زیاتر هەست بە ئارامی و ئاسوودەیی دەکەین، هەست دەکەین دڵەکەمان دەبوژێتەوە لەگەڵ بیستنی ووشەی (دایك) دا..

ڕوح و خەیاڵ و ئەندێشەمان دەڕوات بۆ جیهانی پاکی و جوانی، جیهانی وەفا و وەفاداری، جیهانی خۆشەویستی و سۆز و قوربانی دان، خۆ بزرکردن و خۆتواندنەوە و خۆبەخت کردن و خۆبەخشی لە پێناوی کەسانی تردا.. بەڵێ ووشەی (دایك) مەرهەم و دەرمانی سارێژکەری هەموو برین و ئازارەکانە، ئەو ئاوازە ناوازەیە کە ژێی دڵەکان تەی دەکات..

ئێمە چەندە هەوڵ بدەین و بیروهۆشمان بخەینە کار و پێنوسمان وشەی ناسك ڕیز بکات، بۆئەوەی ستایشی دایکمان بکەین، وەچەندە هەوڵبدەین کە وەفاداری بنوێنین و سوپاسی

بکەین لەسەر ئەو هەموو قوربانیە گەورانەی کە دایکمان داویەتی لە پێناوی ئێمەدا، وەچەندە دوعای خێری بۆبکەین کە تەندروست و بێوەی و ئارام بژی و سەرفرازی دونیا و قیامەت بێ.

بە دڵنیاییەوە ناتوانین کە ئەدای حەقی وەفاداری بکەین بەرامبەر بە دایکمان، ئەگەر تەنها یەك کاتژمێری ژیانی دایکایەتی بێ، کە لە شەوگاری درێژی پایز و زستاندا بە دیارمانەوە بێداربووە و شەو نشینی کردووە بە دیار ڕاژەندنی بێشکەمانەوە، کە گریاوین لەبەر ئازارێکی جەستەمان ئەو کاتەی ئێمە لاشەمان ئازاری دەبوو، دایکمان ڕوحی ئازاری پێ دەگەیشت. ئۆقرەی لێ دەبڕا تا ئێمەی دەبینی کە باشین و بێ ئازارین..

بەڕاستی مرۆڤی ژیر و تێگەیشتوو دۆش دادەمێنێ و تووشی سەرسوڕمان دەبێت کاتێ بیردەکاتەوە لەسەر ئەو هەموو هێز و وزەیەی، ئەو هەموو خۆڕاگریە بێ کۆتایی یەی کە دایکی پێ وەصف دەکرێ لە پێناوی پەروەردە و چاودێری و تێگەیاندن و پێگەیاندنی جگەر گۆشەکانی، ڕۆڵەکانی، ڕۆشنای چاوەکانی، هێزی جەرگ و هەناوی، لەو کاتەی منداڵەکانی ساوا و بچکۆلەبون، چ ئەو کاتەی کە گەورە و گەنج و لاو بوون، ئەو کاتەی کە منداڵەکانی بچوك و مەلۆتکەی شیرە خۆرە بوون، دایك شەوگاری دوور و درێژی بەدیارەوە ڕۆژ کردونەتەوە بۆ ئەوەی ئەوان نەگرین و برسی و

سەرما و گەرما نەبن، وە ئەو کاتەشی کە گەورە بوون و گەیشتونەتە پێگەیشتن وبونەتە لاو، دەبینی ئەم دایکە چۆن لە جوڵە و هاتوچۆدایە، دێ و دەڕوات لە پێناوی ئاسودەیی ئەواندا، بەڵێ لە هەموو قۆناغەکانی بچوکی و گەورەیی منداڵ دا.

ئەوە دایکە هەمیشە لە جوڵەدایە لە پێناوی خزمەت کردن و دابین کردنی پێداویستی و داخوازی ڕۆڵەکانیدا، کە هەمەچەشن و هەمەجۆر داواکاریان هەیە..

بەڵێ منداڵان گەورە دەبن و لاشەیان لە لاوازیەوە بەرەو بەهێزی دەڕوات. ڕۆژ بە ڕۆژ توانای جەستەییان زیاد دەبێ و خۆراکی چەورتر و شیرین و خۆشتر دەخۆن. بەڵام ئەمە هەمووی لەسەر حیسابی تەندروستی دایك، بەڵێ دایك ساڵ بۆ ساڵ دەچێتە تەمەنەوە و تەندروستی تێك دەچێ، نەخۆشیەکان یەك لەدوای یەك هێرشی بۆ دێنن، هەروەکو هێرشی بێ بەزەییانەی گورگ بۆ سەر مەڕ، بەڵێ ساڵان تێدەپەڕن و منداڵان گەورە دەبن و خوێندن تەواو دەکەن و ژن دێنن و شوو دەکەن و ماڵ و حاڵی خۆیان دروست دەکەن و خەریکی سەردان و سەیرانن، ئالەم کاتەدا زۆربەی کات دایك بە تەنها بەجێ دەهێلرێ لە ماڵدا، بەدەگمەن کوڕ و کچەکانی لێی بپرسن لە ژیان و تەندروستی و پێداویستیەکانی.

دەی کوڕ و کچی بەڕێز، وەرە لە خوا غافڵ مەبە، خوا بناسە و بزانە و بیربکەوە، کە تۆ کاتێ لەدایك بووی ئەم گەنجە شۆخ و

شەنگە بەتوانایە، لێهاتووە، ڕۆشنبیرە نەبویت، ئەی کێ خزمەتی کردی، چاودێری کردی، بەخێوی کردی، بە شیری مەمکەکانی تێر و تێراوی کردی.. هەتا گەیاندیتیە ئائەم ڕۆژە؟

دەی بۆچی تۆش ئەمڕۆ قۆڵی مەردایەتی لێ هەڵنامالی و وەکو ئەو دوێنێ خزمەتی کردی، ئەمڕۆش تۆ خزمەتی بکەی؟!

یان لەبیرت چۆتەوە ئەو هەموو قوربانی دانەی کە دایکت لە پێناوی تۆدا پێشکەشی کرد.



## دایکێکی ماندو نەناس.. بەسەرهات

وەرن گوێ بگرن لەم بەسەرهاتە ڕاستەقینەیە کە بەسەر دایکێکی ماندوونەناسی بەساڵاچووی ئەم چەند ساڵەدا هاتووە، ئەو دایکە دوای پێگەیاندنی چەندین کوڕ وکچ، خۆی وزەی تیانەما و وەکو مۆم توایەوە و لە ناو جێگادا کەوت، یەکێ لە کچەکانی ڕۆژانە دەهات بۆلای و پاکی دەکردەوە، نانی بەدەمەوە دەکرد، جل و بەرگی بۆ دەگۆڕی و ژوورەکەی بۆ پاك دەکردەوە، ئەمجا دەڕۆشتەوە بۆ ماڵ و مێردی خۆی.

ئەم دایکە جگە لەم کچەی کە تاقە کچی بوو، کۆمەڵە کوڕێکیشی هەبوو. کە هەموویان خاوەن ژن و ماڵی خۆیان بوون و خاوەن کاری باش و پلە و پایە بوون. هیچیان غیرەتی ئەوەیان

نەبوو بیبەنە ماڵی خۆیان و بەتەنها جێی نەهێڵن، تەنها جار و بار سەردانیان دەکرد و لە دەرگاوە هەواڵیان دەپرسی..

تەنانەت ڕۆژێکیان کوڕێکیان کە سەردانی دایکی کردبوو، ژنەکەشی لەگەڵ بوو، کونەلوتی خۆی گرتبوو، وتبووی ئەمە چیە ئەم بۆگەنە پیسە لەم ژوورە دێ؟!

لەو کاتەدا دایکەکە ژێر خۆی تەڕ کردبوو!!

سبحان الله ئەی کوڕی باش، خۆزگە بیرت بکردایەتەوە ئەو کاتەی کە تۆ منداڵ بووی نەك جارێ، سەدان جار حاڵەتی ئاوات لێ بەسەرهاتووە، دایکت هەر خێرا پاکی کردوویتەوە و لوتی خۆشی نەگرتووە و نەشی وتووە ئەم بۆنە چیە؟

خۆبەخوا پاشەڕۆی تۆش بۆگەنی لێهاتووە. بەڵام دایکت ئەو بۆگەنەی بەلاوە لە میسك و عەنبەر بووە لە خۆشەویستی دا بۆ تۆ.. دەی ئەمە پاداشتت بوو بۆ دایکت؟!

بەڵێ ئەی کچ و کوڕە لاوەکان: هەرکات کەسێکی ئازا و لێهاتوو، زانا و هەڵکەوتوت بینی، وە ویستت زیاتر لەبارەیەوە شارەزا بی، ئەوە لەدایکی بپرسە. بزانە دایکی چ شێرە ژنێك بووە، چونکە ئەم پاڵەوانە لە ئامێزی ئەو دایکە پێگەشتووە و بە شیری ئەو گۆش کراوە. دەی هەزاران سڵاو و ڕێز و حورمەت و وەفا بۆ هەموو دایکان کە قوربانیان داوە بۆ پێگەیاندنی نەوەی داهاتوو. پاداشتی

ئەوان تەنها بەخوای دادپەروەری بەبەزەیی دەدرێتەوە. (جريدة الأُفق الجَديد، العَدد ٤٩٢) .

لە خەسڵەتە هەرە تایبەتەکانی دایك سێ شتە:

یەکەم: سۆز و ئەڤینی بۆ ڕۆڵەکەی بێ سنورە.

دووەم: ئارامگرتنی لەسەر ئازاری ڕۆڵەکەی بێ سنورە.

سێهەم: خزمەتی بۆ ڕۆڵەکەی بێ بەرامبەرە.

بۆیە ووشەی دایك لە زمانی عەرەبیدا بە (الأُم) هاتووە. کە بەمانای ئەوەی هەموو شت لە ئامێز دەگرێ، هەروەکو بە سورەتی (الفاتحة) دەوترێ: أُمُّ الكِتاب. دایکی هەموو قورئان. چونکە سورەتی (الفاتحة) تەواوی مانا و مەبەستی قورئانی لەخۆیدا هەڵگرتووە. یان لە قورئاندا بە شاری (مەککە) دەوترێ (الأُمُّ القرى) دایکی هەموو شار و گوندەکان وە بە نیشیمان دەوترێ: (دایك) چونکە ئامێز بۆ هەمووان دەکاتەوە، بە زیندوویی و بە مردوویی.

## سۆز و خۆشەویستی و قوربانی دایك بۆ ڕۆڵەکانی:

بەسەرهات

یەکێك لە پیاوانی پۆلیسی بەرگری شارستانی (ئاگرکوژێنەوە) دەڵێ: جارێکیان ئاگادارکراینەوە کە ماڵێك، ئاگری گرتووە و خێزانەکەیان هەموو لە ژوورەوەن، ئێمەش بەپەل گەیشتینە شوێنی

ڕووداوەکە، بینیمان ئاگر لە ماڵەکەدا بەرزبۆتەوە. لەناو ماڵەکەدا دایکێك و سێ منداڵی تیابوو، باوکیان لە ماڵ نەبوو. ئاگرەکە سەرەتا لە ژوورێکەوە دەستی پێکردبوو، دایکەکە ویستبووی لە دەرگای مەدخەلەکەوە ڕابکاتە دەرەوە و منداڵەکانی دەربکات، بەڵام بەهۆی داخرانی دەرگاکە و پاڵەپەستۆی دوکەڵ و ئاگرەکەوە سەرکەوتوو نەبوو، پاشان بەخێرایی خۆی و سێ منداڵەکەی بەرەو هەورەبانی ماڵەکەیان بردبوو، کە بڕواتە سەربان. بەڵام بە داخەوە دەرگاکە بە کلیل داخرابوو کلیلەکەشی لانەبوو! !

ناچار بەرەو یەکێ لە هۆدەکان کە ئاگر هێشتا نەیگەیشتبویە ڕایکردبوو، بەڵام دوکەڵ و ئاگرەکە هەناسەی لێبڕیبوون و مردبوون. تا ئێمە دەرگامان شکاند و چوینە ژوورەوە بەداخەوە گیانیان لە دەست دابوو..

ئەوەی جێگەی تێڕامان و سەرنجی هەموو تیمی ئاگرکوژێنەوەکە و هەموو ئامادەبوان بوو. ئەو دیمەنە دڵهەژێنەبوو کە هەرگیز بیرمان ناچێتەوە، ئەویش ئەوەبوو. کە بینیمان دایکەکە هەرسێ منداڵەکەی خستبووە ژێر خۆیەوە و خۆی بەسەردا دابوون هەروەکو دیمەنی ئەو باڵندەیەی کە خۆی دەخاتە سەر بەچکەکانی و لەژێر باڵەکانیدا دەیانشارێتەوە ئەو دایکەش ئاوا خۆی بەسەر منداڵەکانی دا دابوو. بە ئومێدی ئەوەی کە ئەگەر ئاگر گەیشتە ژوورەکە ئەو بسوتێ و منداڵەکانی ئاگریان بەرنەکەوێ! !

ئەو پۆلیسە دەڵێ: سوێند بە خوا بینیمان کە هەموو دەستەکانی داخ بووبوون. نینۆکەکانی هەڵوەری بوون کە ئەوەندە پەلاماری دەرگا و پەنجەرە داخراوە داخبوەکانی دابوو، پاشان ڕای کردبۆوە بۆلای منداڵەکانی و کە زانیبوی دەرچونیان مەحاڵە، ویستبوی خۆی بسوتێ و مەرگی منداڵەکانی نەبینێ. کە هەموویان بەیەکەوە مردن!! (النَّدم، هانی درار عثمان، ص١٢١).

فەرموودەیەکی پێغەمبەری دڵسۆزمان سەبارەت بە سۆزی دڵی دایك بۆ کۆرپەکەی: **عَنْ أَنَسَ، أَنَّ النَبِيَّ ﷺ قالَ: (إِنِّي لَأَدْخُلُ فِي الصَّلاةِ، وَأَنا أُريدُ إِطالَتَها فأَسْمَعُ بُكاءَ الصَبِيِّ، فَأَتَجَوَّزُ مِمّا أَعْلَمُ مِنْ شِدَّةِ وجدِ أُمِّهِ مِنْ بُكائِهِ)**. متفق علیه، بُخاري: ٧٠٩، و مُسْلِم: ٤٧٠.

واتە: من ئەچمە ناو نوێژەوە و زۆر حەزدەکەم کە درێژە بە نوێژەکەم بدەم و قورئانی زۆری تێدا بخوێنم لەو کاتەدا گوێم لە دەنگی گریانی منداڵێکی ساوا دەبێت ـ کە دایکی لە مزگەوتا نوێژی بەجەماعەت ـ دەکات. نوێژەکەم کورت و پوخت دەکەمەوە، لەبەرئەوەی دەزانم کە دڵی ئەو دایکە چەندە مەحزون و خەمناکە کاتێ گوێی لە دەنگی گریانی کۆرپەکەی دەبێ و ناتوانێ بڕوات بە دەمیەوە!!



## لە خوا غافڵ مەبە و ئاگاداری دڵی دایکت بە:

### یەکەم: سوپاسگوزاری دایکت بە

خوای گەورە لە قورئاندا فەرموویەتی: ﴿وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَـٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٤﴾﴾ لقمان.

واتە: خوای گەورە دەفەرمووێ: (لەو کتێبانەدا کە ناردوومە بۆ پێغەمبەرەکانم) فەرمانم داوە بە ئادەمیزاد کە بە جوانی بە نەرم و نیانی و لوتفەوە لەگەڵ و باوك و دایکیدا بجوڵێتەوە و بەچاکی دڵیان ڕاگیر بکات..

کاتێك دایك سکی پڕدەبێت، ڕۆژ بە ڕۆژ (تاکاتی لەدایك بوونی منداڵەکە بێهێزی و لاوازی ڕووی تێدەکات، کاتێکیش کە لەدایك دەبێت، دایکەکە پاش دووساڵ، ئینجا لە شیر خواردن دەیبڕێتەوە، پاش ئەمە خودا دەفەرمووێ: فەرمانمان داوە بە ئادەمیزاد کە سوپاسی من و دایك و باوکت بکە، پاش مردنت هەر بۆلای من دەگەڕێیتەوە و دەخرێیتە ژێر حیساب و لێپرسینەوەیەکی وردەوە... (تەفسیری گوڵشەن، نیظام الدین عبدالحمید، ب٣، ل٣١٦).

فەرموودەیەك:

پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ عەرزی کرد: چ کەسێ شایانترین کەسە لە خزمەتیدابم و گوێڕایەڵی بکەم و هیچ کات پشت گوێی نەخەم و لەیادی نەکەم؟

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دایکت..

پیاوەکە وتی: دوای ئەو کێی تر شایانی ڕێز و خزمەتە؟

فەرمووی: دایکت..

دیسانەوە پیاوەکە پرسیەوە: دوای دایکم کێی تر؟

فەرمووی: دایکت. کابرا بۆ جاری چوارەم پرسیەوە: ئەی کێ لەدوای دایکم شایەنی ئەوەیە هەمیشە لە خزمەتیدا بم و لە گوێڕایەڵی دەرنەچم؟ فەرمووی: پاشان باوکت..

(رَواهُ البُخاريُّ: (٥٩٧١) وَ مُسْلِم: (٢٥٤٨)..

❁❁❁

## دووەم: ئاگاداربە.. خۆشەویسترین کەسی لای دایکت

ئاگاداربە بە منداڵی و گەورەیی دایکت لە هەموو کەس زیاتر تۆی خۆشویستووە، دەی تۆش دایکت زۆر خۆشبوێ، تا لای خەڵکیش خۆشەویست بیت..

## بەدوعای دایکی خۆشەویست بوو لای خەڵکی!

بەسەرهات

زانایەکی ناودار و بەناوبانگ، مامۆستا لە زانکۆی ئەزهەر، بینەران و بیسەرانی زۆر خۆشیان دەویێت. ڕۆژێکیان یەکێك لەو کەسانەی کە لە کۆڕەکەیدا دانیشتبوو، گوێی بۆ وتە شیرینەکانی مامۆستاکەی ڕادێرابوو، ئەم پرسیارەی ئاڕاستە کردوو گوتی: مامۆستا گیان نهێنی ئەو هەموو خۆشەویستی یە چیە کە خەڵکی هەیانە بۆ تۆ؟ واتە: بۆچی خەڵك بەو شێوەیە تۆیان خۆشدەوێت؟ ڕوونتر بڵێین: ئایا چاکەیەك هەیە وابکات مرۆڤەکان هێندە خۆشەویست بن لای خەڵکی؟

مامۆستا وەڵامی دایەوە و وتی: ڕەنگە هۆکاری ئەو نهێنیە بگەڕێتەوە بۆئەو پەیوەندیەی کە لە نێوان من و دایکمدا هەبوو، حەزدەکەم بۆتان باس بکەم. چونکە لەو باوەڕەدام ئەوە تاکە هۆکارە کەبووەتە هۆی ئەوەی پەیوەندی من و خەڵکی بەو شێوەیە بێت و خۆشەویستیان بۆمن گەیشتبێتە ئەو ئاستەی کە ئێوە پێی سەرسامن، بەو هیوایەی ئێوەش سودی لێببینن..

ئەو کاتەی من خوێندکار بووم لە زانکۆی ئەزهەر، دایکم نەخۆشبوو، لەسەر جێگا کەوتبوو، بە درێژای ئەو کاتانەی لە ماڵەوە بووم لە خزمەتیدا دەبووم و لە نزیکیەوە دادەنیشتم و خزمەتم دەکرد و پێداویستیەکانم بۆ جێبەجێ دەکرد. لە شەودا لە

نزیکی جێگەکەی دایکم دەخەوتم، بۆئەوەی ئەگەر لە نیوەشەودا هەڵسا و پێویستی بە چوونە دەرەوە هەبوو لە خزمەتیدا بڕۆم و یارمەتی بدەم..

شەوێکیان لەسەر کورسیەکەم خەوم لێکەوت، لە نیوەشەودا دایکم هەڵسابوو بڕواتە دەرەوە، هەستم پێ نەکردبوو، کاتێك بەخەبەر هاتم سەیرم کرد دایکم وا دەستی بە دیوارەکەوە گرتووە هەوڵ دەدات وردە وردە بڕواتە دەرەوە، بەپەلە هەستام و دەستم گرت و لە خزمەتیدا ڕۆشتمە دەرەوە، دواتر بیرم کردەوە کەچی بکەم بۆئەوەی هەر کات دایکم بەخەبەر هات، منیش خەبەرم بێتەوە؟! بیرۆکەیەك هات بە خەیاڵمدا..

ئەویش ئەوە بوو لە خوار قەرەوێڵەکەی دایکمەوە جێگەکەم دابخەم، بە شێوەیەك هەرکات دایکم ویستی هەڵسێ و بڕواتە دەرەوە قاچەکانی بکەوێتە سەر سنگم، ئیدی لەو شەوە بە دواوە ئەو پلانەم جێبەجێ کرد. هەر کات دایکم هەڵدەستا، قاچەکانی دەکەوتنە سەر سنگم، منیش بەخەبەر دەهاتم و لە خزمەتیدا دەڕۆشتمە دەرەوە، شەوێکیان گوێم لێبوو دایکم دەستەکانی بۆ ئاسمان بەرز کردبۆوە و دەیگوت: خودایە داوات لێدەکەم کە خەڵکی ئەم کوڕەی منیان خۆشبوێت).. تەنها شتێك کە من هەستی پێ بکەم بۆ بەدەست هێنانی خۆشەویستی خەڵکی نزاکانی دایکمە!!

بەڵێ كوڕ و كچی گەنج و لاو: گەر دەتەوێت لە دنیا و دوا ڕۆژدا بەختەوەر بیت، بەردەوام لەگەڵ دایك و باوكتدا چاكە بكە، بەختەوەریان بكە، بەختەوەر دەبیت.. هەرگیز ئاخ و ئۆف بەرامبەریان دەرمەبڕە، بەوتەی شیرین و جوان بانگیان بكە، هەرگیز قسەیان پێ مەبڕە، بە جوانی گوێ بۆ قسەكانیان ڕادێرە، دەنگیان بەسەردا بەرز مەكەوە، بەردەوام هەوڵبدە پێویستیەكانیان بۆ جێبەجێ بكەیت، بەوپەڕی خۆشحاڵیەوە داواكانیان جێبەجێ بكە. ئەوان كلیلی بەختەوەری تۆن، وریابە كلیلەكانت ون نەكەیت.. (گۆڤاری بڕیار، ژمارە: ٦١، ل٣٩).



## سێهەم: گوێڕایەڵی فەرمانی دایكت بە:

هەرچەندە ناوداربوی، پایەدار و پلەداربوی، لە ئاستی داواكری و بانگ كردنی دایكتدا، مەڵێ بۆچی، بەڵكو تەنها: بەڵێ بەسەرچاو بزانە... چونكە یەكێك لەو ئەركانەی پێویستە ئێمە بەرامبەر دایك و باوكمان ئەنجامی بدەین، گوێڕایەڵی تەواوە بۆ فەرمانەكانیان، بەبێ بۆڵە بۆڵ و دواخستن و دەربڕینی ئاخ و ئۆف. كەسی ژیر بە هیچ بیانویەك و پاساوێك فەرمانەكانی دایك و باوكی دواناخات و ڕەتی ناكاتەوە..

## بۆ فەرمانی دایکی، وانە وتنەوەکەی جێهێشت!

بەسەرهات

زانایەك لەکاتی وانە وتنەوەدا، لەوکاتەی زیاتر لە (١٠٠) قوتابی بەوپەڕی ئەدەب و هێمنیەوە لە خزمەتیدا دانیشتبوون و بە تامەزرۆییەوە گوێیان بۆ قسەکانی مامۆستاکەیان ڕادێرابوو، هەر قسەیەکی دەکرد دەیان نوسیەوە. لەو ساتەدا دایکی دێتە ژوورەوە و پێی دەڵێت:

خواردن بدە بە مریشکەکان!!

بەوردی سەرنج لەو کارە بچوکە بدە، لەو کارەی کە بە منداڵێك ئەنجام دەدرێت!!

بەڵام ئەگەر چی کارەکە بچوك و کەم بایەخە، لە سینە و زارێکی مرۆڤێکی گەورەوە دەرچووە، لە سینەی ئەو مرۆڤەوە دەرچووە کە مافی زۆری بەسەریەوە هەیە، دەزانن لەبەرامبەردا زاناکە چی وت؟! ڕەنگە هەموان بڵێین: بێگومان وتویەتی ئەوە کاری من نیە، خۆ بە منداڵێکیش ئەو کارە ئەنجام دەدرێ، یاخود گوتویەتی: من کاتم نیە و بەسەدان کەس لە کۆڕ و مەجلیسی مندا دانیشتوون و چاوەڕوانی قسەکانی من دەکەن. یان گوتویەتی پاش کەمێکی تر وانەکەم تەواو دەکەم و ئەو کارە ئەنجام دەدەم.. یان هەر شتێك تۆ بە خەیاڵتدا دێت..

باشە ئەگەر تۆ لەو پلە و پایەدا بیت، دایکت بۆ وەها کارێك بانگت بکات، کاردانەوەت چی دەبێت؟!

وەڵامەکەی لای خۆتە ئێستا با پێکەوە وەڵام و کاردانەوەی ئەم زانایە ببیستین، زانای پایە بەرز، پێشەنگی هەموو کارێکی چاك، بە خەندەوە گوتی: بەچاوان دایە گیان. دەست بەجێ کتێبەکەی داخست و داوای یارمەتی لە قوتابیەکانی کرد و ڕۆیشت بۆئەوەی خواردن بە مریشکەکان بدات و فەرمانەکەی دایکی بەجێ بهێنێت.. پاشان گەڕایەوە بۆلای قوتابیەکانی و وانەکەی بۆ تەواوکردن.. ڕەنگە بڵێی بۆچی ئەم دایکە بۆ وەها کارێکی بچوك لە ساتێکدا کە پتر لە سەد قوتابی گوێ بیستی قسە و وتەکانی بوون، ئەم زانایە ڕادەسپێرێت؟!

لە وەڵامدا دەڵێین: بۆئەوەی هەزاران کەسی وەکو من و تۆ فێر بکات کە لە هەر پۆست و پلە و پایەیەکدا بین، پەیڕەوی لە فەرمانی دایك و باوکمان بکەین، دایکەکە بەو هەڵوێستەی وانەیەکی فێری قوتابیەکان کرد، کە دەبێت بە وێنەی مامۆستاکەیان گوێڕایەڵی دایك و باوکیان بن، زانای پایە بەرزیش بە کردەوە قوتابیەکانی فێرکرد کە چۆن فەرمانی دایکیان جێبەجێ بکەن.. ئەم زانایەش پێشەوا (ئەبو حەنیفە) ڕەحمەتی خوای لێبێت.

گەنج و لاوی بەڕێز: ئەگەر هەڵوێستی ئەم زانایەت بەلاوە جوان و ناوازەیە، چاوی لێبکە، خۆ ئەگەر وادەزانی ئەو داوایەی دایکی زاناکە داوایەکی نادروستە بە تایبەت لەو ساتەدا، ئەوا بەبیری خۆت بهێنەرەوە کە دایك بۆ ماوەی ڕۆژێك دوان نا، بەڵکو بە درێژایی نۆ مانگ تۆی لە سکی خۆیدا هەڵگرت. لە تەواوی ئەو ماوەیەدا نەیدەتوانی وەکو کەسێکی ئاسایی بخەوێت. نان بخوات، پشوو بدات، پاشان دوو ساڵی تەواو لانی کەم شەوانە پێنج جار بەخەبەرت هێناوە، نەدەخەوت تا تۆ دەخەوتی، دەگریا ئەو کاتەی تۆ دەگریایت، پێدەکەنی ئەو ساتەی تۆ پێدەکەنی.. (گۆڤاری: بڕیار، ژمارە: ٦٠، ل٣٩).



## چوارەم: دایك.. دوای مردنیشی دڵی لاتە!!

دایك ئەوەندە بەسۆز و میهرەبانە بۆ ڕۆڵەکەی کە لەدوای مردنیش هەر دڵی لای منداڵەکەیەتی، مردنیش ناتوانێ پەیوەندی ڕوحی نێوانیان لەناوببات.

### دڵی لای منداڵەکەی بوو.. تا مرد! ‹بەسەرهات›

ئەم چیرۆکە ڕاستەقینەمان لە ساتی لە دایك بونی کۆرپەیەکی چاوگەشەوە دەست پێدەکات. کە هەر لەو ڕۆژەدا کە ئەم هاتە دونیاوە و هەناسەی سەر زەوی هەڵمژی و چاوەکانی کردەوە، ڕێك

لەو ساتەدا، دایکی ئەم منداڵە کۆچی دوایی کرد و هەناسەی وەستا و چاوەکانی بۆ دواجار لێك نان.. کۆرپە ساواکەی لە ئامێز نەگرت و بەتەنها جێی هێشت، باوکی ئەم منداڵە نەیدەزانی چی لەم مەلۆتەکە ساوایە بکات. بۆیە تەکلیفی لە خوشکەکەی خێزانی، ژن خوشکەکەی، پوری منداڵەکە کرد کە ماوەیەك ئەم منداڵە ساوایە بەخێو بکات.

بەڵام ئەم پورەش بە هۆکاری منداڵی خۆی و دەوام و دائیرەوە نەیتوانی بەردەوام بێت، لە بەخێوکردنی ئەم منداڵەدا، بۆیە بە هەموو خزم و کەس و کار پێشنیاری ئەوەیان بۆ کرد کە هاوسەرگیری بکاتەوە، هەم خۆی بێ خێزان نابێ و ماڵ و حاڵی چۆڵ نابێ، هەم ئەم منداڵە ساوایەش لەلایەن باجیەکەیەوە بەخێو دەکرێ.. بەڵێ دوای حەوت مانگ لە وەفاتی ژنەکەی ئەم پیاوە هاوسەرگیری کردەوە و ئەو ژنەی کە هێنای قبوڵی بوو کە کۆرپەکەی بۆ بەخێوبکات..

سەرەتا باش بوو لەگەڵی پاشان یەك لەدوای یەك دوو منداڵی بوو، کچێك و کوڕێك. لەم کاتەدا کۆرپەی دایك مردوو تەمەنی گەیشتە چوار ساڵان، ئیتر باجیەکەی بە تەواوی ئەم منداڵەی پشت گوێ خستبوو، تەنانەت لە حەوشەی ماڵەکەیاندا ژوورێکی بچکۆلانەیان بۆ دروست کردبوو، نەیاندەهێشت لەگەڵ دوو منداڵە بچوکەکەدا یاری بکات!! ڕۆژێکیان لە یادی لەدایك بوونی

منداڵەکەدا. (عید المیلاد)، باجیەکەی هەموو کەس و کاری خۆی بانگ کرد بۆ ماڵی خۆیان و خواردنی خۆش و شیرینی و هەموو شتێکی ئامادە کردبوو، باوکی منداڵەکە بەهۆی کارێکی زۆر پێویستەوە نەیتوانی ئێوارە ئامادە بێت، هەمووان بە کۆمەڵ لە دەوری سفرە و خوان کۆبونەوە و تەنها یەك کەس ئامادەی سفرەی خواردن نەبوو. کە ئەو منداڵە چوار ساڵە بوو. کە دایکی ئازیزی نەمابوو. غەیری ـ الله ـ کەس نەبوو خەمی بۆ بخوات!!

لەم کاتەدا منداڵەکە چووە بەر پەنجەرەکە و تەماشای پێکەنین و شادمانی و کێك و مۆمی یادی لە دایك بونەکەی دەکرد ناودەمی پڕ دەبوو لەئاو و حەزی دەکرد بەشداریان بێ! بەڵام باجیەکەی بۆئەوەی دووری بخاتەوە. تەنها برنجی بۆ کردە قاپێکەوە و دایە دەستی و لێی تورە بوو وە پێی وت:

بڕۆ بۆ ژوورەکەی خۆت بیخۆ و نەیەیتە دەرەوە!!

منداڵەکەش قاپە خواردنەکەی وەرگرت و بەدڵی شکاو و پڕ لە گریان و چاوی بە فرمێسکەوە هات لە حەوشەی ماڵەکەیاندا لە ژێر قادرمەکاندا دەستی کرد بە خواردنی. هەموو تا درەنگانی شەو خەریکی ئاهەنگ و قسەی خۆش و پێکەنین بوون..

هیچ کەس بیری بەلای منداڵەکەدا نەدەچوو. کە چەندە پێویستی بە سۆز و ئەوین هەبوو. هەموویان لە خوا غافڵ بوون،

ئەینا بیری ئەو منداڵەیان دەکردەوە. کە بێ دایکی چی لێ بەسەرهێناوە..

بەڵێ هەمووان ڕۆشتن و باوکی منداڵەکە هاتەوە و لە منداڵەکەی پرسی، ژنەکەی وتی: تێری خواردووە و لەگەڵمان بوە و ئێستا لە ژوورەکەی خۆی خەوتووە.. منداڵەکەش لەو سەرما و سۆڵە سەختەدا، لە ژێر قادرمەکاندا دانیشتبوو، خەوی لێکەوتبوو وە نەچووبوە ژوورەکەی خۆی.

بەڵێ ژن و پیاو بەیەکەوە خەوتن و پیاوەکە خەونی بینی و لە خەویدا خێزانی یەکەمی بینی، بینی خێزانی کۆچکردووی زۆر پەشێوحاڵە و بە مێردەکەی وت: تکایە هەستە ئاگات لە کوڕەکەم بێ!! پیاوەکە بە شڵەژاوی لەخەو ڕاپەڕی و خەوەکەی بۆ ژنەکەی گێڕایەوە، ژنەکە وتی: هیچ نیە، خەونی درۆیە.. منداڵەکە لە ژووری خۆی خەوتووە. دەی بخەوە..

بۆجاری دووەم باوکی منداڵەکە خەوتەوە. بەڵام هەمان خەونی بینیەوە و ژنە مردووەکەی هاتەوە خەونی و دیسان پێی وت: پیاوەکە تکایە هەستە و ئاگات لە کوڕەکەم بێ، وەزعی خراپە.!

ئەمجارەشیان پیاوەکە لەخەو ڕاپەڕی و ژنەکەی خەبەر کردەوە و خەوەکەی بۆ گێڕایەوە و لە هەواڵی کوڕەکەی پرسی. ژنەکەی خۆی تورەکرد و بە خەواڵیەوە بۆڵاندی و وتی: ئەمە چیە ئەوەندە شت گەورە دەکەی. ئەمە خەونی هاشە و بێ بنەمایە و کوڕت

عەیبی نیە و بخەوە و بێڵە ئێمەش تۆزێ بخەوین. لێی ڕاکشایەوە و بێ خەم خەوتەوە، باوکەکەش بەهەمان شێوە خەوتەوە. سێ بارە باوکی منداڵەکە خەونی بینیەوە و ئەمجارەیان ژنە کۆچکردوەکەی هاتەوە خەوی و پێی وت: ئێستا کوڕەکەم ڕزگاری بوو. ئێستا هات بۆ لام!!

ئەمجارە پیاوەکە زۆر بە ترس و لەرزەوە لەخەو ڕاپەڕی و ڕایکرد بۆ ژووری کوڕەکەی بەڵام بینی لەوێ نیە. وەکو شێت و هار بە حەوشە و ماڵەکەدا ڕای دەکرد و بانگی کوڕەکەی دەکرد. بەڵام وەختێ بینی لە ژێر قادرمەکاندا قاپە برنجەکەی لە باوەشدایە و دەستە بچکۆلە ناسکەکانی تازە گەرمیان لێ بڕاوە و سەری بە سنگیا شۆڕبۆتەوە و لە سەرمان ڕەق بۆتەوە و گیانی تیانەماوە و مردووە و هەموو لەشی لە سەرمان شین هەڵگەڕاوە!!

هەر ئەو ساتەی دایکی وتی: ئێستا کوڕەکەم ڕزگاری بوو. گەیشتە لام. هەر لەو کاتەدا ئەم کوڕە جوانە بێ نازە چوار ساڵە گیانی سپاردبوو!! (قصص أبكتني، سالم مرشيد، ص٢١).



## چۆن پاداشتی دایکتت دایەوە؟!

- وەختێ تەمەنتساڵێك بوو، دەیشۆردیت و خۆراکی دەکرد بە دەمتەوە، تۆ بە گریان تا نزیکەی دەمەو بەیان پاداشتەکەت دەدایەوە..

- وەختێ تەمەنت سێ ساڵ بوو، خواردنی خۆش و بەتامی بۆ لێدەنای، تۆ قاپەکەت هەڵدەدا بەسەروچاویا، بەو شێوەیە سوپاست دەکرد.

- وەختێ تەمەنت بوو بە چوار ساڵ، پێنوسێکی دایە دەستت تاکو وێنەی پێ بکێشی، تۆ دیواری ژوورەکەت هەمووی نوسی و ناشیرینت کرد و بویتە مایەی ماندووبوون بۆ دایکت! ئەمە بوو گشت سوپاسەکەت!.

- وەختێ تەمەنت بوو بە پێنج ساڵ، جوانترین جلی جەژنانەی بۆ دەکڕیت و بەزۆر لەبەری دەکردی، تۆ لەبری سوپاسکردن، دەچووی جلەکانت پیس دەکرد و لە قوڕت هەڵدەکێشان!.

- وەختێ تەمەنت بوو بە شەش ساڵ، دەستی گرتی و بردیە بەرخوێندن، تۆ بە گریان و ناز و نوز و داواکاری نابەجێ و ناڕێم و ناڕێم پاداشتەکەت دایەوە..

- وەختێ تەمەنت بوو بە (١٠) ساڵ، تا لە قوتابخانە دەهاتیتەوە لەبەردەرگا دەوەستا بۆئەوەی لە باوەشت بگرێ.

تۆش ڕێك و ڕاست بەبێ ئەوەی تەنانەت سەیریشی بکەی ڕاست دەڕۆشتی بۆ ژوورەوە. ئەمە بوو سوپاسەکەت!!

- وەختێ بویتە پانزە ساڵان، کە لە قۆناغێکی خوێندن بە پلەی بەرز دەردەچوی، لە خۆشیاندا دەگریا، کەچی تۆ داوای دیاریت لێدەکرد. ئەوە بوو سوپاسگوزاریت!.

- وەختێ تەمەنت بوو بە بیست ساڵ، حەزی دەکرد لەگەڵیدا بچیتە سەردانی خزمان کەچی تۆ دەچوی بۆلای برادەر و دۆستانت، ئەمەبوو گشت سوپاسەکەت!.

کە عومرت بوو بە (بیست و پێنج) ساڵ، دایکت هەموو هەوڵی خۆی خستەکار و هەموو لاشەی بوو بە چاو بۆ دۆزینەوەی هاوسەری ژیانت. هەر کچێکی جوانی ببینایە وای وێنا دەکرد ئەوە بوکی داهاتوویەتی بەڵام تۆ کە هاوسەرگیریت کرد، سوپاسگوزاریت بۆ دایکت ئەوە بوو، دەستی هاوسەرەکەت گرت و لە شوێنێکی زۆر دوور لە ئەو، خانوویەکت بە کرێ گرت و دانیشتی..

- وەختێ تەمەنت بوو بە (سی) ساڵ، هەندێ ئامۆژگاری کردی، دەربارەی پەروەردەی منداڵ. تۆ قسەی خۆشت ئەوە بوو، پێویست ناکات خۆتمان لەگەڵ ماندوو بکەی، خۆمان دەزانین چی دەکەین.

ـ کە تەمەنت بوو بە (سی و پێنج) ساڵ، دایکت تەلەفۆنی بۆ دەکردی، کوڕم وەرە ئەم نیوەڕۆیە نانێکم لا بخۆ، سۆپاسەکەی تۆ ئەوەبوو: دایە گیان ناتوانم، چونکە زۆر سەرقاڵم! !

ـ وەختێ تەمەنت بوو بە (چل) ساڵ. هەواڵی پێدای کە نەخۆشە و پێویستی پێت هەیە، کەمێ ئاگات لێی بێت، سوپاسەکەی تۆ ئەوەبوو، لەبەرخۆتەوە دەتبۆڵاند و دەتگوت: خوایە زەلیلیان نەکەی. ئەم دایکەم نەبێ بەبار بەسەر شانی ماڵ و منداڵمەوە ! !

ـ ڕۆژێکیش لە ڕۆژەکانی خوا ئەم دایکە بەجێت دەهێڵێ، بەڵام هێشتا خۆشەویستیت دڵی ئەوی بەجێ نەهێشتووە..

دەی ئەگەر ئێستا دایکت لەلاماوە، تو خوا هەرگیز جێی مەهێڵە و خۆشەویستی لەبیر مەکە و تاپێت دەکرێ دڵی گەورەی بەدەست بهێنە، چونکە لەم دونیایەدا تەنها یەك دایکت هەیە و تەواو، وەختێکیش لە دنیا دەڕوا، فریشتەکان بانگت دەکەن: ئەوا ئەو کەسەش لە دونیا دەرچوو، کە بەهۆی ئەوەوە، خواوەند سۆزی خۆی دەڕژاند بەسەرتدا.. ئەمەی وترا پەیامێکە بۆ هەر کەسێ کە دایکی خۆی خۆشدەوێت.. (ئاو و ئاور، هێمن خورشید، ل١٠٣).



## لەدوای مردنی دایکت لەیادی مەکە و سەردانی گۆڕەکەی بکە و خێری بۆ بکە

ئەبی هورەیرە دەفەرمووێ: (زَارَ النَبِيُّ ﷺ قَبْرَ أُمِّه، فَبَكَى، وَ أَبْكَى مَنْ حَوْلَهُ) رَوَاهُ مُسْلِم: ٢٢٥٥.

واتە: پێغەمبەر ﷺ ڕۆشت بۆ سەردانی گۆڕی دایکی، لەوێ گریا و ئەو کەسانەش کە لەدەوری بوون هێنانیە گریان...

تێبینی: پێغەمبەری خوا ﷺ تەمەنی (٦) ساڵ بوو کە دایکی وەفاتی کرد. ئەم سەردانەی گۆڕی دایکی کە هاوەڵان لە خزمەتیدا بوون و خۆشەویستمان ﷺ ئەوەندە بەکوڵ بۆ دایکی گریاوە وەکو ئەوەی ئێستا تەرمەکەی بەخاك سپێردرابێ، تەنانەت هەموو هاوەڵانیش بە مەحزونی گریانی پێغەمبەر ﷺ دەستیان کرد بە گریان. لەدوای فەتحی مەککەوە بووە. کە نزیکی (پەنجا) ساڵ بەسەر وەفاتی دایکی پێغەمبەردا ﷺ تێپەڕیوە!! ئەمەیە وەفاداری بۆ دایك، کە بەڕاستی بێ وێنەیە.

### هەمیشە دایکت لەیاد بێ ودوای مردنی خێری بۆ بکە:

دایکی هەموو ئیمانداران. خاتوو عائیشە خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا و عەرزی کرد، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دایکم کت و پڕ و لەناکاو مرد،

فریانەکەوت ڕاسپێری و وەصیەت بکات تاخێر و صەدەقەیەکی بۆ بکەین. من وادەزانم ئەگەر دایکم لەسەرە مەرگدا مەودای قسەکردنی ببوایە، خێرێکی بڕیار دەدا بۆ خۆی (**أَفَلَها أَجْرٌ إِنْ تصَدَّقْتُ عَنْها**؟!) جا ئایا خێری دەگات ئەگەر من لە جیاتی خۆی خێری بۆ بکەم؟! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (**نَعَمْ**) بەڵێ خێری دەگا. ئەم فەرموودەیە: رَواهُ البُخاريُّ: (٥٩٧٩) وَ مُسلم: (٢٣٢٣).

لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە: سەعدی کوڕی عوبادە کاتێ دایکی دەمرێ، خۆی لە دیاری نابێ. جا کەهاتەوەو دایکی مردبوو، زۆر خەمناك بوو.. هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە دایکم مرد خۆم بەدیاریەوە نەبوم، جا ئایا ئەگەر ئێستا من شتێکی بۆ بکەم بە خێر سوودی دەبێ بۆی؟ (**أَيَنْفَعُها شئٌإن تَصَدَّقتُ بهِ عَنها؟قالَ: نَعَم، قالَ: فَإنِّي أُشهِدُكَ أَنَّ حائِطي المِخْرافَ صَدَقَةٌ عَنْها**) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ، سەعدی کوڕی عوبادە فەرمووی: دەتۆ شایەتبە کەوا ئەو باخەم کرد بە خێر بۆی. (رَواهُ البُخاريُّ: ٢٧٦٢).

وەلە هەندێ فەرموودەشدا هاتووە، کەکاتێ پرسیار کراوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ کە دایکم مردووە و (**فَأَيُّ الصَّدَقَة أَفْضَلُ**؟!) کام خێرە لە هەموو خێرێ خێرترە تابۆی بکەم؟! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (**الماء**) ئاو، بیرە ئاوێك لێبدە و بیکە بەخێراو هەرکەس

پێویستی پێی بوو باسوودی لێ وەربگرێ. یان بەڕادێکی ئاو لە قوتابخانەیەك مزگەوتێك دابنێی و لە هاویناندا خەڵکی ئاوی ساردی لێ بخواتەوە... هەموو ئەجر و پاداشتەکەی بەدایکت دەگات.. (التاج الجامع للأصول في الأحاديث الرَّسُولَ ﷺ منصور علي ناصِف. وەرگێڕانی: مامۆستا نوری فارس حمه خان. ب١، ل٥٨٠).



## سزای ئەو کەسانەی لەخوا غافڵن و بۆ دایکیان خراپن:

هەموو ئەو کەسانەی کە لە ژیانی دونیادا بێ حورمەتی بە دایکیان دەکەن، بە گوفتار بێ یان بە ڕەفتار، ئازارێکی دڵ و ڕوح و جەستەیان دەدەن، ئەوە دەبێ بزانن خوای دادگەر هەر لە دنیادا پێش قیامەت سزایان دەدات. بەوەی کە هەمیشە ویژدانیان ئازاریان دەدات، دائیمە دڵ بەخەمن، منداڵی خراپیان دەبێت. گیروگرفتیان بۆ دێتە پێش. هەندێ جاریش لەسەرە مەرگ و کاتی مردن و دوای مردندا، سزای سەختیان پێوە دەبینرێ.. نمونە:

بەسەرهات

کابرایەکی مردوو شۆر، بەناوی: (عەبباس بەتاوی) کە تەمەنی لە حەفتاکاندایە و خەڵکی وڵاتی سعودیەیە، لە یادەوەریەکانیدا دەڵێ: من سی و شەش ساڵ فەرمانبەر بووم لە فرۆکەخانە و کاری ئیداریم

دەکرد. بەهۆی ڕووداوێکەوە لە ساڵی (١٩٨٩)دا، کە لە نێوان من و خوای گەورە خۆیدایە، بڕیارم دا واز لە کارەکەم بهێنم و مردوو بشۆم لەبەر خوا. لەم ماوە دوور و درێژەدا مردوویەکی یەکجار زۆرم شتوە، بەنەوەت و شەش حاڵەتیان زۆر کاریگەر بووم. لە شەش حاڵەتیاندا تووشی ئینهاری عەصەبی بووم و لە نەخۆشخانە چەند ڕۆژ چارەسەریان بۆ کردم. چونکە حاڵەتەکان ئەوەندە ناخۆشبوون و دەهاتنەوە بەرچاوم.. هەندێ حاڵەتیان بەبێ هیچ ناو هێنانی کەس و ماڵێك باس دەکەم بۆ پەند و وانە لێوەرگرتن:

بەسەرهات

جارێکیان بانگیان کردم بۆ ماڵێك بۆ شتنی کابرایەکی زۆر دەوڵەمەندی حەفتا ساڵ، کە چووم بینیم لەسەر جێگاکەیەتی و سەعاتێکە مردووە و کاشی ماڵەکەشیان ئەتوت ئاوێنەیە و سێ خزمەتکار خزمەتی دەکرد. کوڕەزاکەیشم لەگەڵ بوو، ئەوەی سەیر بوو، بینیم مێرووله لە دەمیەوە دێتە دەرێ و دەچێتە گوێیەوە. زۆرم پێ سەیر بوو، تەلەفۆنم کرد بۆ زانایەك کەچی بکەم؟!

چونکە هەرگیز شتی وام نەدیبوو..

وتی: خۆت چی بەچاك دەزانی وابکە.. بەهەرحاڵ لەگەڵ کوڕەزاکەیدا بەچەرچەفەکەی ژێرەوە هەڵمانگرت و چەند جار لە ئاوی ناو بانوێیەکمان هەڵکێشا تا مێروولەکان سەرئاو بکەون. دواتر هەرچۆنی بوو شتمان و کفنمان کرد و نوێژمان لەسەر کرد و

ناشتمان.. بە کوڕەزاکەیم وت: تۆش ئەوەت بینی کە من بینیم؟!
پێم بڵێ بزانم باپیرت چۆن بووە؟!

وتی: لەدایکم بیستووە کە کاتی خۆی زۆر عەزیەتی دایکی داوە و تەنانەت زۆر بە خراپی لێی داوە، تەنانەت براکانی جارێك دایکیان دەبەن شکاتی لێبکات، دایکیان لەلای پۆلیس دەڵێت: خۆم کەوتووم و کوڕەکەم وای لێنەکردووم..

ئەم ڕووداوە ئەوەندە کاری تێکردم، سێ چوار شەو خەوم لێنەکەوت. ئای ئەجری دایك و باوك چەندە گەورەیە، واوەیلا بە حاڵی ئەوەی خراپە لەگەڵ دایك و باوکیا دەکات و خۆی تووشی ئەو گوناهە گەورە دەکات، کە ڕیسوایی دونیا و قیامەتی پێوەیە. (بالانس، ئەندازیار عثمان، ل١١٦).

نزای کۆتایی: خوایە گیان تۆ دەیبینیت: ئەگەر دایکم گوناهبارە لە گوناهەکانی خۆشبە، ئەگەر دایکم خەمبارە، خوایە گیان دڵی خۆش بکە، ئەگەریش دڵخۆشە، خوایەگیان خۆشیەکەی تا سەر بێت، خوایە گیان ئەگەر نەخۆشە شیفای بدە، ئەگەر خەفەتی هەیە لێی دوربخەرەوە. خوایە گیان ئەگەر گەڕایەوە بۆلای تۆ، ڕەحمی پێبکە و بیکە بە یەکێك لە ئافرەتەکانی بەهەشت. خوایە گیان بەقەد ترپەکانی دڵم لەبەرت دەپاڕێمەوە کە دایکم یەکێك بێت لە ئافرەتەکانی بەهەشت. ئامین. ئامین. ئامین.

## وانەی هەشتەم

## بابەت: منداڵ مردن

۞ قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى: ﴿وَأَمَّا ٱلْغُلَٰمُ فَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤْمِنَيْنِ فَخَشِينَآ أَن يُرْهِقَهُمَا طُغْيَٰنًا وَكُفْرًا ﴿٨٠﴾ فَأَرَدْنَآ أَن يُبْدِلَهُمَا رَبُّهُمَا خَيْرًا مِّنْهُ زَكَوٰةً وَأَقْرَبَ رُحْمًا ﴿٨١﴾﴾ الكهف.

۞ وقالَ الحَق ـ سُبحانَهُ ـ حكايَةً عَنْ يعقوب ـ عليه السَّلام ـ: ﴿وَتَوَلَّىٰ عَنْهُمْ وَقَالَ يَٰٓأَسَفَىٰ عَلَىٰ يُوسُفَ وَٱبْيَضَّتْ عَيْنَاهُ مِنَ ٱلْحُزْنِ فَهُوَ كَظِيمٌ ﴿٨٤﴾﴾ يوسف.

۞ وَنَجِدُ رَسولنا ﷺ يَبْكي، وَ تذرف (صَبَّ الدمُوعَ) عَيْناهُ حُزْناً عَلى مَوْتِ إِبْنِه إِبْراهيم، وَقالَ: (إِنَّ العَيْنَ تَدْمَع، و القَلْبَ يحزن، ولا نَقُولُ إلاّ ما يُرضي رَبُّنا، وَ إِنّا بِفِراقِكَ يا إِبْراهيمُ لَمَحْزُونونَ). رَواهُ البُخاريُّ: (١٣٠٣) وَ مُسْلِم: (٢٣١٥).

۞ قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (إذا ماتَ وَلَدُ العَبْدِ، قالَ اللهُ تَعالى لِمَلائكَته: قَبَضْتُمْ وَلَدَ عَبْدي؟ فَيَقُولونَ: نَعَمْ، فَيَقول: قَبَضْتُمْ ثَمَرَةَ فُؤادِهِ؟ فَيَقُولونَ: نَعَمْ، فَيَقُولُ: ماذا قالَ عَبْدي؟ فَيَقُولونَ: حَمْدِكَ وَاسْتَرْجَعَ فَيَقُولُ اللهُ تَعالى: (ابْنُوا لِعَبْدي بَيْتاً في الجَنَّةِ،

وَ سَمُّوهُ بَيْتَ الحَمْدِ) حَديثٌ حَسَنٌ، رَواهُ الترمذي: (١٠٢١) و حَسَّنَهُ الألْباني في صَحيحِ الجامعِ: (٧٩٥).

۞ قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (أَيُّما إِمْرَأَةٍ ماتَ لَها ثلاثة مِنَ الوَلَدِ، كانُوا لَهُ حِجاباً مِنَ النّار، قالَتْ إِمْرَأَةٌ: وَ إِثْنانِ؟ قالَ وَ إِثْنانِ). متفق عليه، (بُخاري: ١٠٢) و مُسْلِم: (٢٦٣٤).

۞ قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (مامِنَ النّاسِ مِنْ مُسْلِمٍ يُتَوَفّى لَهُ ثلاثٌ، لَمْ يَبْلُغُوا الحِنْثَ، إلاّ أَدْخَلَهُ اللهُ الجَنَّةَ بِفَضْلِ رَحْمَتِهِ إِيّاهُمْ) رواهُ البُخاريُّ: (١٢٤٨).

۞ عَنْ بَرّاء قالَ: (لَمّا تُوفِّيَ إِبْراهيم - عَلَيهِ السَّلام - قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (إِنَّ لَهُ مُرْضِعاً في الجَنَّةِ). رَواهُ البُخاري: (١٣٨٢).

۞ وَقالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (إِنَّ إِبْراهيم ابْني، وَ إِنَّهُ ماتَ في الثدي وَ إِنَّ لَهُ لظئرينِ يكملانِ رضاعته في الجَنَّةِ). رَواهُ مُسْلِم: (٥٩٨٠).

۞ وَقالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (أَطْفالُ المُؤمِنينَ في جَبَلٍ مِنَ الجَنَّةِ يكفلهم إِبراهيم وَ ساره، حَتَّى يَردهم إِلى آبائِهِمْ يَوم القِيامَةِ). صَحيحٌ، رَواهُ أَحْمَد: (٢/٣٢٦) وَ صَحَّحَهُ الألْباني في صَحيحِ الجامعِ: (١٠٢٣).

۞ قالَ الإمام إِبْنُ عَطاءُ اللهِ السكندري: (رُبَّما أَعْطاكَ فَمَنَعَكَ، وَ رُبَّما مَنَعَكَ فأَعْطاكَ).

۞ شاعیری ناودار و خاوەن دیوانی کورد (گۆران)، کاتێ کە (هیوا)ی کوڕی دەمرێ، لە جیاتی گریان شاکارێکی نەخشاندووە، کە بۆ (بێکەس)ی شاعیری دەخوێنێتەوە، ئەوەندە بێکەس بەلایەوە جوان دەبێ. دەڵێ: دڵم نەهات بڵێم: خۆزگە منداڵێکی تریشت بمردایە، تاهۆنراوەیەکی تری ئاوات بوتایە!! هۆنراوەکە لە لاپەڕە (٢٠٩) هاتوە..

## سەرچاوەکان:


١) يَوْمٌ في الجَنَّة، محمود المصري، ص٤٧٠، ص٤٧٩، ص٣٥٩.

٢) لا تَحْزَنْ، محمد متولى الشّعراوي، ص١٧٥.

٣) لا تَحْزَنْ، محمد متولى الشّعراوي، ص٢٣٧.

٤) مردن و ژیانی ناو گۆڕ، محمد ملا فایەق شارەزووری، ل١٢٧.

٥) پایزە برا، مەلا ئەحمەدی شەریعە، ب١، ل١٥.

٦) گۆڤاری: (ڕێگای کۆمەڵایەتی) ژمارە: ١، ٢٠/٥/٢٠١٢، ل٧٨. بابەتی: (ڕاستە مۆم بە فرمێسك دەکوژێتەوە) لە نوسینی: خەسرەو عبدالکریم.

٧) بەهاری دڵان، ئەندازیار عوسمان، ل٢٦٩.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحَمْدُ لله رَبِّ العالَمينَ وَ الصَّلاةُ وَ السَّلامُ عَلى سَيِّدِنا محمد وَ عَلى آلِهِ وَ صَحْبِهِ أجْمَعِين:

وانەی ئەم جارەمان لە زنجیرە باسی (لەخوا غافڵ مەبە) بۆ چین و توێژێکی ناو کۆمەڵگایە، بۆ ئەو دایك و باوکانەیە کەلە ژیانی دونیادا، خوای پەروەردگار بەسەریان دەکاتەوە بەوەی کەوا منداڵیان دەمرێ.. ڕۆژانە لە جیهاندا بە هەزاران منداڵ دەمرن، لە کوردستانی ئازیزی خۆشماندا، لە شار و شارۆچکە و گوند و گەڕەکی خۆشماندا، ئەبینین منداڵ دەمرێ، گریان و شیوەن و فرمێسك بە دایك و باوکانی جەرگ سوتاوەوە دەبینرێ، ئەم وتارە وانەیە پەیامێکە دڵخۆشی دانەوەیەکە بۆئەوانەی کە منداڵیان مردووە، بە ئومێدی خوا صەبوری دەبەخشێ بە دڵیان. چونکە مرۆڤی موسڵمان بە پەیامی خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ هەمیشە دڵ ئارام دەبێ.

ڕاستیەکی حاشا هەڵنەگر: هەموو ئەو کارەساتە بە ئازارانەی مرۆڤ توشی خەمناکی و بێتاقەتی و دڵناڕەحەتی دەکەن. وەکو زەرەی ماڵی و دارایی لە بواری معامەلە و کڕین و فرۆشتن و کشتوکاڵ و ئاژەڵداری و خوێندن و پلە و پایە، هەموویان ئەگەڕی پڕبونەوە و لەبیرچونەوەیان هەیە. تەنها یەك شت هەرگیز لەبیر

ناچێتەوە و برینی سارێژ نابێ، ئەویش منداڵ مردن و جەرگ سوتانە، ئەگەر منداڵێکت بمرێ و سەد منداڵی ترت هەبێ، شوێنی ئەو هەر دیارە و هەرگیز دایك و باوك ئەو ڕۆڵە کۆچکردوەی لەبیرناچێتەوە، هەمیشەی وێنەی لەبەرچاوە. بەڵام قەرەبوی ئەم خەمە گەورە بێ وێنەیە، بەوە دەکرێتەوە کە خوای گەورە چ پاداشتێکی گەورەی بۆ ئەو بەندەیە داناوە. بۆ ئەو دایك و باوکە جگەر سوتاوە داناوە.

## موژدەیەکی گەلێ دڵخۆشکەر لە پێغەمبەرەوە ﷺ:

خۆشەویستمان ﷺ دەفەرموێ: هەرکاتێ دایك و باوکی مسوڵمان ڕۆڵەی جگەر گۆشەیان مردوو، بەرەو گۆڕستان بەڕێیان کرد و ماڵی ڕوناکیان لێ تاریك بوو، چاوی گەشیان بە فرمێسك ڕشتن بۆ کۆرپە جوانەکەیان لێڵ بوو. ئالەم کاتەدا خوای گەورە بە فریشتەکانی خۆی دەفەرمووێ: (قَبَضْتُمْ وَلَدَ عَبْدِي؟) کۆرپە جوانەکەی بەندەکەمتان لەباوەشی دایك و باوکی وەرگرت؟ دەڵێن: بەڵێ، ئەمجا خوای گەورە دەفەرمووێ: (قَبَضْتُمْ ثَمَرَةَ فُؤادِهِ؟) بەرهەمی ئەو دایك و باوکەتان چنی و لێتان کردەوە؟

سبحان الله، جاری یەکەم خوای گەورە بە فریشتەکانی فەرموو منداڵەکەمتان لێ وەرگرتەوە و منداڵەکەی مرد؟

جاری دووەم خوا فەرمووی: ئەی فریشتەکانم، بەرهەمی ئەو دایك و باوکەتان لێ کردەوە؟ واتە: منداڵ مردن ئەوەندە ناڕەحەتە پارچەیەك لە دڵی دایك و باوك لێ دەبێتەوە، ڕەگ و بوندی دڵی دەپچڕێ.

کەواتە: هەر ڕەحمی خوایە ژیان دەبێ هەر بەردەوام بێ و هەر کەس کاتی مردنی خۆی هەیە ئەینا ئەبوایە ئەو کەسەی کە منداڵی دەمرێ. یەکسەر بۆ خۆشی دڵی بوەستایە و بمردایە!! بەڵێ، ئەمجارەشیان فریشتەکان دەڵێن: بەڵێ ئەی خوای گەورە..

ئەمجارە خوای گەورە لە فریشتەکانی دەپرسێتەوە ـ خۆشی زانایە بە هەموو شتێ ـ دەفەرمووێ: (ماذا قالَ عَبْدي؟) ئەی بەندەکەم، دایك و باوکی منداڵەکە چیان وت: لەو کاتەدا کە منداڵەکەی مرد؟ فریشتەکان دەفەرموون: (حَمِدَكَ وَاسْتَرْجَعَ). یەکسەر حەمد و سەنای تۆی کرد، یەکسەر وتی: خوایە گیان سوپاس و ستایش هەر بۆتۆیە، هیچ ناشکوری و دەرنەبڕی، وە وتی: (إِنَّا للهِ وَ إِنَّا إِلَيْهِ راجِعُون) خوایە گیان پەروەردگارم.. من خۆم و ژن و ئەو منداڵەم و سەروەت و داراییم و نانم و پلە و پایەم. ئەوەی دیارە و نادیارە، هەمووی هی تۆیە و هەر بۆلای تۆش دەگەڕێینەوە..

خوایە گیان ئەو منداڵە تۆ پێت بەخشیم، ئازایەتی من نەبوو. یەك زەڕە دەسەلآت و توانای منی تێدا نەبوو، تۆ بە هەدیە و دیاری

پێت بەخشیم و دڵشادت کردم. ﴿يَهَبُ لِمَن يَشَآءُ إِنَٰثٗا وَيَهَبُ لِمَن يَشَآءُ ٱلذُّكُورَ﴾ منداڵ دیاری و هەدیەی خوایە و چ کچ بێ چ کوڕ. خوا خۆی دەیبەخشێ. دەی هەر تۆش بە حیکمەتی خۆت لێت وەرگرتینەوە. بە ڕەحمەت پێت بەخشین و بە حیکمەت لێت وەرگرتینەوە. دەی خوایە لەهەموو بارێکا حەمد و سەنا و سوپاس هەر بۆتۆیە..

ئەمجا خوای پەروەردگار دەفەرمووێ: (**ابْنوا لِعَبْدي بَيْتاً في الجَنَّةِ، وَ سَمُّوهُ بَيْتَ الحَمْدِ**). دەی فریشتەکان لە ئێستەوە دەست بەکاربن، بڕۆن لەناو بەهەشتا. خانویەکی یەگجار خۆش و ناوازەی بۆ دروست بکەن. وەناویشی لێ بنێن: خانوو کۆشکی سوپاسگوزاری. ئەم فەرموودەیە: (حَديثٌ حَسَن، رَواهُ الترمذي: (١٠٢١) وَحَسَّنَهُ الألباني في صَحيحِ الجامِع: (٧٩٥)..

## ١٢ کوڕی خۆی ناشتوە.. نەگریاوە!! ‹بەسەرهات›

مامۆستای بەڕێز و نوسەر (مەلا ئەحمەدی شەریعە) دەفەرمووێ: چووم بۆ پرسەی دۆستێکی خۆشەویستم، لە کۆڕی پرسە و ماتەمینیەکەدا، لەسەر داوای خەڵکەکە وتارێکم پێشکەش کرد و ئەو فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ (کەپێشتر باسمان کرد) خوێندمەوە و بەزمانی شیرینی کوردی بۆ دانیشتوانی پرسەکەم

شی کردەوە. لەدوای وتارەکەی من، پیاوێکی باڵابەرزی، بە هەیبەت و شان و شکۆ، وتی:

دەی مامۆستا با منیش بەسەرهاتێکی خۆمت بۆ بگێڕمەوە، کە حەوت کەس لە دانیشتوانی ئەم مەجلیسە ئاگاداری ڕاست و درۆی ئەم بەسەرهاتەن، هەناسەیەکی هەڵکێشا و وتی:

لە تەمەنی گەنجیەتیمدا مامۆستایەك ئەو فەرموودەیەی ـ کە پێشتر باسمان کرد ـ بۆی گێڕامەوە، ئەو دەمی تازە ژنم هێنابوو، ئەو فەرموودەیە کاری تێکردم و لە دڵمدا جێگیر بوو، لە دەروونمدا ڕیشەی داکوتا و تێکەڵی خوێنم بوو. بە درێژایی چەند ساڵەی ژیانم لەبیرم نەچۆتەوە و هەرگیز لە بیریشم ناچێتەوە و بە کرداریش وەکو مسوڵمان جێبەجێم کردووە..

وتمان: چۆن جێبەجێت کردووە؟!

وتی: لەماوەی ژیانمدا لەدوای بیستنی ئەو فەرموودەیە، بەدەستی خۆم تەرمی (١٢) دوانزە کوڕی خۆم یەك لەدوای یەك لە ماوەی چەند ساڵێکدا خستۆتە گۆڕ و لەناو گۆڕیچکەدا ڕامکێشاون و بەخوام سپاردون.. بۆ هیچیشیان نەگریاوم..

لە ترسی ئەوەی نەبادا خێرەکەم کەم بێتەوە و کۆشکەکەم بچوك بێتەوە و شەرمەزاری لای خوا بم. دەی خوا دوانزە کۆشکی ناوازەی بەهەشت بەخۆت و هاوسەرەکەت ببەخشێت..

(پایزە برا، مەلا ئەحمەدی شەریعە، ب١ ل١٧ ).

**موژدەیەکی تایبەت لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بۆ دایکانی جەرگ سوتاو:**

(**أَيُّما إمْرَأَةٍ ماتَ لَها ثلاثة مِنَ الوَلَدِ، كانُوا لَهُ حِجاباً مِنَ النّارِ، قالَتْ إمْرَأَةٌ: وَ إِثْنانِ؟ قالَ وَ إِثْنانِ**). متفق عليه، (بُخاري: ١٠٢) و مُسْلِم: (٢٦٣٤).

واتە: هەر دایکێك سێ منداڵی بمرێ. ئەوا بۆی دەبنە بەربەست و ناهێڵن بچێتە دۆزەخەوە و ئەو دایکە لە ئاگری جەهەنم پارێزراو دەبێ، ژنێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەی ئەگەر دایکێك دوو ڕۆڵەی مردبێ ئایا ئەویش بەر ئەو موژدەیە دەکەوێ؟ فەرمووی بەڵێ، هەر دایکێك دوو ڕۆڵەشی مردبێ. ئەوا بۆی دەبنە پەردە و بەربەست و لە ئاگری دۆزەخ دەیپارێزن.

لە فەرموودەیەکی ئارامبەخشی تردا، پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ فەرموویەتی: (**مامِنَ النّاسِ مِنْ مُسْلِمٍ يُتَوَفَّى لَهُ ثَلاثٌ، لَمْ يَبْلُغُوا الحِنْثَ، إلاّ أَدْخَلَهُ اللهُ الجَنَّةَ بِفَضْلِ رَحْمَتِهِ إِيّاهُمْ**) رَواهُ البُخاريُّ:(١٢٤٨).

واتە: هەر کەسێ لە خەڵکی مسوڵمان سێ منداڵی نابالغی مردبێ. ئەوە خوای گەورە بەهۆی ئەو جەرگ سوتان و ئازاری منداڵ مردنەوە، بە ڕەحمەتی خۆی دەیخاتە بەهەشتەوە.

## مردنی منداڵ حیکمەتی تێدایە!

کاتێ منداڵێك دەمرێ. دەبێ مرۆڤی مسوڵمان قەناعەتی تەواوی بە حیکمەتی خوای گەورە هەبێت، کە ئەم ڕووداوە دڵتەزێنە، پشت شکێنە، ناخ هەژێنە، لە بەرژەوەندی باوك و دایکەکە و منداڵەکەشە. بەلاَم زانستی کەم بینی ئێمە ئێستە بە ئازاری دەزانێ:

**یەکەم:** بۆ دایك و باوکەکە، ڕەنگە ئەم منداڵە لە دوا ڕۆژدا ببوایە بە مایەی فیتنە و ئاشوب و لەکەدارکردنی دین و ئابڕوو کەسایەتیان. چەند کەسی زۆر بەڕێز هەیە، ئاواتە خوازە منداڵەکەی، کوڕەکەی، کچەکەی، کە ئێستا گەورەیە. هەر بە منداڵی بمردایە و ئەمڕۆ تووشی ئەو بەدبەختی و نەهامەتیەی نەکردایە.. خوای گەورە لە قورئاندا لە باسی گەشتە زانستیەکەی (موسا) پێغەمبەردا. سەلامی خوای لێ بێ. لەگەڵ بەندە چاکەکەدا - خدر - لە سورەتی کەهف دا، لەباسی کوشتنی منداڵەکەدا (کەئەم کوشتنە و لێدانە کوشندەی خدر بۆ ئەو مێرد منداڵە، بەمانای ڕووداوە دڵتەزێنەکانی ئەمڕۆن، لە ڕووداوی هاتوچۆ، خنکان، سوتان، مین و تەقەمەنی، جەڵتەی دڵ و دەماغ و کت و پڕ مردن.) خوای گەورە لەسەر زوبانی ئەو بەندە چاکەکارە، حیکمەتی ئەم کارە ڕوون دەکاتەوە و دەفەرمووێ:

﴿وَأَمَّا ٱلۡغُلَٰمُ فَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤۡمِنَيۡنِ فَخَشِينَآ أَن يُرۡهِقَهُمَا طُغۡيَٰنٗا وَكُفۡرٗا ﴿٨٠﴾ فَأَرَدۡنَآ أَن يُبۡدِلَهُمَا رَبُّهُمَا خَيۡرٗا مِّنۡهُ زَكَوٰةٗ وَأَقۡرَبَ رُحۡمٗا ﴿٨١﴾﴾ الكهف.

واتە: خدر فەرمووی: ئەی موسا بزانە تازە لاوەکەش کە کوشتم دەمزانی کە سروشتی لەسەر بێ بڕوایی و خوانەناسی ئەڕوا و باوك و دایکیشی ئیماندار و مسوڵمان بوون، جا ئێمەش ترساین بەسەرکەشی خۆی هەردوو لە خشتە بەرێ و ناچاریان بکات و هەڵیان بنێ بەرەو سەرکەشی و بێ بڕوایی، ویستمان بەو کارەیە، پەروەردگاریان بۆیان بگۆڕێ بە منداڵێکی چاکتر و پاکتر و میهرەبانتر.. (تەفسیری ڕامان، أحمد کاکە محمود).

کەواتە: بە مردنی ئەو مێرد منداڵە. خوای گەورە دایك و باوکەکەی لە شەڕ و خراپەی داهاتووی تەمەن بەدوور گرت وە هەروەها لە قەرەبوشدا لە شوێنی ئەو منداڵی صالح و چاك و میهرەبانیان پێ دەبەخشێ. دەی کەواتە: ئەمە لە قازانجی دایك و باوکەکە بوو..

**دووەم:** مردنی ئەم منداڵە لە قازانجی خۆیەتی. چونکە لای کەسێك پەروەردە و بەخێو دەکرێ کە زۆر لەباوك و دایکی بەرزتر و بەڕێزتر و بەسۆزترن بۆی. کە باوکە ئیبراهیم و دایکە سارا خاتونە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

**(أَطْفالُ المُؤمِنِينَ فِي جَبَلٍ مِنَ الجَنَّةِ يكفُلهُم إِبراهيم وَ سارَة، حَتَّى يردهُم إِلى آبائِهِمْ يَوم القِيامَةِ)**. صَحيحٌ، رَواهُ أَحْمَد: (٣٢٦/٢) وَ صَحَّحَهُ الأَلْباني فِي صَحيح الجامع: (١٠٢٣).

واتە: منداڵەکانی خاوەن باوەڕان لە شاخێکدان لە بەهەشتدا، ئیبراهیم و سارە ئەو منداڵانە دەگرنە ئەستۆی خۆیان، تاکو دەیگێڕنەوە بۆ باوانی خۆیان لە ڕۆژی قیامەتدا.. لەفەرموودەیەکی تریشدا: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ڕۆیشتین تا گەیشتین بە کچان و کوڕانێکی منداڵ یاریان دەکرد لەنێوان دوو ڕووباردا، وتم: ئەوانە کێن؟

وتیان: ئەوانە کۆرپەی خاوەن باوەڕەکانە، ئیبراهیم پێغەمبەر ـ علیە سلام ـ دەیانگرێتە باوەش و پەروەردە و سەرپەرشتیان دەکات. (رَواهُ الطَّبراني، وَ صَحَّحَهُ الألباني فِي (صَحيح الترغيب: ٩٩٥).

ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر ﷺ تەمەنی ساڵ و نیوێك بوو کەمرد، کە هێشتا نیو ساڵی شیر خواردنی مابوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: **(إِنَّ إِبْراهيم ابْني، وَ إِنَّهُ ماتَ فِي الثَدي وَ إِنَّ لَهُ لَظِئرَينِ يكملانِ رضاعته فِي الجَنَّةِ)**. رَواهُ مُسْلِم: (٥٩٨٠).

واتە: بەڕاستی ئیبراهیم کوڕی خۆشەویستی من بوو، لەماوەی شیرخواردنیدا مردووە، خوای گەورە دوو شیردەری بۆ ئامادە کردووە، کە شیردانەکەی بۆ تەواو دەکەن لە بەهەشتدا.

لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە: کاتێ ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد و منداڵێکی شیرە خۆرە بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (إِنَّ لَهُ مُرْضِعاً فِي الجَنَّةِ). رَواهُ البُخاريُّ: (١٣٨٢). واتە: دایەنێك و شیردەرێکی هەیە لە بەهەشتدا.. ئەمە تایبەتە بە کوڕەکەی پێغەمبەرەوە ﷺ (ئیبراهیمی کوڕی).

بەڵام بەخێوکردن و شیردانی سەرجەم جگەرگۆشە و کۆرپەی موسڵمانان کە لە منداڵیدا مردوون، ئەو ئەرکە باوە گەورەمان (ئیبراهیم) و (سارە) خانی هاوسەری گرتویانەتە ئەستۆ لە بەهەشتدا، تا ئەو جگەر گۆشانە دەگەڕێنەوە بۆلای دایك و باوکانی بەڕێزی خۆیان لە دوای چوونە بەهەشتیان.(مردن و ژیانی ناو گۆڕ، محمد ملا فائق، ل١٢٧).

کەواتە: هەرچی دێتە ڕێگەمان هەمووی بە قازانجی خۆمانە و خوای میهرەبان هەر بە قازانجی بەندەکانی دەدوێ چەندە بەهێز و جوانە ئەو وتە زێڕینەی زانا و پێشەوای گەورە: (إبنُ عَطاءُ الله السكندري) کە فەرموویەتی: (رُبَّما أَعْطاكَ فَمَنَعَكَ، وَ رُبَّما مَنَعَكَ فأَعطاكَ).



## شاعیرێکی گەورەی کورد.. بەمردنی منداڵەکەی..

### شاکارێکی شیعری دانا !

شاعیری ناودار و خاوەن دیوانی کورد (گۆران) کاتێ کە (هیوا)ی کوڕی دەمرێ، لەجیاتی گریان شاکارێکی نەخشاندووە، کەبۆ (بێکەس)ی شاعیری دەخوێنێتەوە، ئەوەندە بێکەس بەلایەوە جوان دەبێ، دەڵێ: دڵم نەهات بڵێم: خۆزگە منداڵێکی تریشت بمردایە، تا هۆنراوەیەکی تری ئاوات بوتایە ! !

هۆنراوەکەش بەناوی: (لەسەرە مەرگی هیوا)دا، لەلاپەڕە: (٩٣)ی دیوانەکەیدا دەڵێ:

ڕۆڵەی تاقانەم، هیوای ژیانم.
ئەستێرە گەشی بەر بەیانم.

ڕۆژی نەورۆزی پرشنگ زێڕینم.
تریفەی سپی مانگی هاوینم.

شنەی شەماڵی کەلی بەهارم.
لەرەی ئاونگی مێرگی ئاودارم.

جریوە و جوکەی شادیی هێلانەم.
شەوبۆی پەخشانی ئەم گشت هەردانەم.

خونچەی پشکوتوی باغی جوانیم.
ڕۆڵەی شیرینم ئەی گیانی گیانم.

تو خوا بەو جوتە چاوە شینانە.
ئاخر نیگاتە، تیر بۆم بڕوانە.

بابە کلۆڵی بە ڕۆڵە ڕۆیی.
کە دانیشتم کز وەختی بێ تۆیی.

بەیادی دوو گۆم، دوو گۆمی بێ بن.
کە هۆگریان بوو، ماسی ڕۆحی من.

هۆن هۆن فرمێسکم بڕژێتە داوێن.
فرمێسکی تاسەر جەرگ و دڵ تاوێن.

هیوا ئەو لێوەی بە زەردەخەنە.
گزنگی ڕۆژی گۆڵانی منە.

بۆ زەردەخەنەی ئێستاتێ نازێ.
بۆ لەژێر هەوری مەرگا ئەلەرزێ.

هەی هاوار، هەی داد هیوای شیرینم.
گیان ئەدەی، ئەمری، ئیتر ناتبینم.

ئیتر ئاخ ئیتر، ناتبینم هەرگیز.
لە خەوا نەبێ شەو شەوی پایز.

جار جار وەك بەرقی ئاو بۆ زۆر تینوو.
دێیت و ناشکێنی تاسەو ئارەزوو.

سا بۆم بڕوانە تێر بەو چاوانە.

ڕۆڵە مردنە، فرمێسك بارانە.

هیوا ڕۆڵە ڕۆ، کۆرپەم ڕۆڵە ڕۆ.

ئەو کولمە ئاڵە نەرم و نۆڵە ڕۆ.

ئەو قژە زەردە ئەو چاوانە ڕۆ.

ئەو نەغمەی (دایە) و (بابە) ڕۆ.

تا دەممان لە گۆ ئەکەوێ وەك تۆ.

هیوای دایە ڕۆ، هیوای بابە ڕۆ..



## خۆڕاگری و ئیمان بەهێزی مەردێکی کورد

مامۆستای زانا و ناودار (مامۆستا مەلا عبدالله ی ئارمردی، ناسراو بە مەلا عبدالله ی چوارتا، بەسەرهاتێکی شیرینمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێ:

لە حەفتاکاندا لە گوندی (واژە)ی شاربازێڕ پێش نوێژ و وتار خوێنبووم، کەسانێکم دەبینین زۆر عەشقی خواو پێغەمبەری خوا و بەهەشتبوون. زۆر خۆپارێزبوون لە دۆزەخ. بەڕاستی لەخواترس بوون، ئاواتیان پێ دەخوازرا، شەوێکیان دوای نوێژی عیشا، پیاوێکی گوندەکە لێی پرسیم: ئەرێ مامۆستا ڕاستە دەڵێن: هەر

کەسێك منداڵێکی نابالّغ (ساوا)ی مردبێت، لەو دونیا دەرگایەکی دۆزەخی لێ دەگرێت؟ منیش وتم: بەڵێ ڕاستە و فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ کابراش هەناسەیەکی خۆشی هەڵمژی. وتی: ئۆخەی، وەڵلاّ شەشم مردوون. کەواتە: یەك دەرگام ماوە!!

من ڕۆشتم و ئەویش ڕۆشت... هەمان شەو بۆ بەیانی بۆ نوێژی بەیانی دەهاتم، کابرام بینی و سەلامی لێکردم و بە کەیفێکی خۆشەوە وتی: مامۆستا شوکر بۆ خوا دەرگاکەی تری دۆزەخی لێ گرتم: ئەم شەو منداڵەکەی تریشمان مرد!!. (پایزە برا، مەلا ئەحمەدی شەریعە ب١، ل١٦).

## البُكاء لا يَتَعارَضُ مَعَ الرِّضا بالقَضاء

هەر کاتێ کەسێك جگەر گۆشەکەی مرد، لەو کاتەدا دەریای ڕەحم و ئەڤینی جولاّ و فرمێسکی ناخی هاتە سەر ڕووی لەچاوەکانیەوە جۆگەلەی بەست. بەلاّم بەزمان هەر سوپاس و یادی خوای دەکرد. ئەمە هیچ خراپەیەکی تێدا نیە لە ئەجر و پاداشتەکەی کەم ناکاتەوە. بەم بەڵگانە:

یەکەم: لە قورئاندا خوای گەورە باسی پێغەمبەری بەڕێز و گەورە و خۆڕاگر (یعقوب)مان بۆ دەکات. کاتێ هەواڵی نەمانی (یوسف)ی پێ دەگەیەنن، بزانە چەند مەحزوون بوە و چۆن

گریاوە. دەفەرمووێ: ﴿وَتَوَلَّىٰ عَنْهُمْ وَقَالَ يَٰأَسَفَىٰ عَلَىٰ يُوسُفَ وَٱبْيَضَّتْ عَيْنَاهُ مِنَ ٱلْحُزْنِ فَهُوَ كَظِيمٌ ۝٨٤﴾ یوسف.

واتە: دوای چەندین ساڵ لە دیارنەمانی یوسف و ئەمجارەش نەگێڕانەوەی (بنیامین)ی کوڕی، یەعقوب لەتاو خەفەتدا لە کوڕەکان ڕووی وەرچەرخاند، وتی: ئای، ئۆف و ئەسەف، غەم و خەفەت، ئەی داخم بۆ یوسف، ئەوا زامەکەی ئەویشم کولایەوە، جالە سۆز و خەم و خەفەتدا (تانە) ئاوی سپی پەڕیە سەر هەردوو چاوی، ئیتر بێدەنگ بۆخۆی دانیشت و چاوەڕوانی خوا بوو، دەروی خێری لێبکاتەوە.. (تەفسیری ڕامان، ئەحمەد کاکە محمود).

**دووەم:** کاتێ تەماشای سیرەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەین، دەبینین کاتێ ئیبراهیمی کوڕی دەمرێ. چۆن فرمێسك خوڕ خوڕ بە چاوی پیرۆزیدا دێتە خوارەوە و دەفەرمووێ: (**إِنَّ العَيْنَ تَدْمَع، وَ القَلْبَ يحزن، ولا نَقُولُ إلاّ ما يُرضي رَبُّنا، وَ إِنَّا بِفِراقِكَ يا إبْراهيمُ لَمَحْزونُون**). رَواهُ البُخاريُّ: (١٣٠٣) وَ مُسْلِم: (٢٣١٥).

واتە: بەڕاستی چاو فرمێسك دەبارێنێ و وەکو کانی فرمێسکی لێهەڵدەقوڵێ، دڵیش دەکوڵێ و خەمبارە، بەڵام بە زمان تەنها ئەوە دەڵێین کە خوای گەورە پێی ڕازیە. بەڕاستی ئەی ئیبراهیمی جگەرگۆشە و خۆشەویستم بە مردنی تۆ و جیابونەوەت لێمان زۆر مەحزون و خەمناکین..

کەواتە: خەمباری و مەحزونی و گریان و فرمێسك باراندنی چاو، هیچ لە ئەجر و پاداشت کەم ناکاتەوە و بگرە لەڕووی دەرونی یەوە گریان ئاسودەیی بە دەرونی کەسی خەمناك دەبەخشیّ.



## ڕاستە مۆم بە فرمێسك دەکوژێتەوە ⟨بەسەرهات⟩

کەسێك ئەم بەسەرهاتە واقعیەمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەڵیّ: ڕۆژێك پێش جەژنی ڕەمەزانی ساڵی (٢٠٠٩) لە شاری سلێمانی بووم. جوتێك پێڵاوی زۆر ناشرینم لە پێدابوو، دایکم گلەیی لیّ دەکردم، هەر دەیوت: ڕۆڵە دەڵێی لە لادێوە گەڕاویتەوە دەبڕۆ جوتێك پێڵاو بکڕە، بیکەرە پێت بۆ ئەم جەژنە..

هەرچەندە پێڵاوەکان بە تێڕوانینی خۆم زۆر جوان بوو، چونکە لە ئەوروپا بە پارەیەکی زۆر کڕیبوم، بەلاّم لەبەر چاوی دایکم زۆر ناشرین بوو، بەهەر حالّ بەقسەم کرد چووم بۆ دوکانێکی پێڵاو فرۆش، لە جامخانەکەیدا هەر وورد دەبوومەوە بۆئەوەی جوتێك پێڵاوی جوان هەڵبژێرم. لە تەنیشتمەوە پیاوێکی زۆر مەعقول ڕاوەستابوو، جوتێك جزمەی لەپێدابوو، وام زانی کرێکاری خەباتە و سەقف تێکەرە، چونکە ئەو کەسانەی کە ئەو کارە دەکەن جزمە دەکەنە پێیان. لای هەموان ئاشکرایە کە ڕەمەزانیش لەو ساڵەدا

زۆر گەرم بوو، چونکە ئەگەر خەڵك بەسەر پێوە (نەعل) بهاتایەتە دەرەوە هەر ئاسایی بوو..

کابرا لە تەنیشتمەوە ئاهێکی زۆر قوڵی هەڵکێشا. منیش زانیم کە زۆر شت لە دڵیدایە، بۆیە وتم: ئەرێ بێ زەحمەت ئەم پێڵاوانە کامیانت بەلاوە جوانە؟ ئەو پیاوە بەڕێزە فەرمووی: جلەکانت ــ کە بۆ جەژنت ئامادە کردووە ڕەنگی چۆنە و چیە؟!

بەمەدا زانیم کە زەوقی سەلیمە و خاوەنی سەلیقەیە، وتم: عادەتەن من پانتۆڵ لە پێدەکەم، دەست نیشانی جوتێك پێڵاوی بۆ کردم، منیش هەر دەمویست بزانم نهێنی ئەو ئاهە قوڵە چی بوو کە هەڵیکێشا. من هەر خۆم دەمویست وەك ڕۆژنامەنوسێك لە ژیانی ئەو خەڵکەی کوردستان بزانم. بۆئەوەی وتەی دڵی پێ بدرکێنم عەرزم کرد ئەوە بۆ بەم گەرما ئەو جزمانەت لەپێدایە؟! ئایا کرێکاری؟ وتی: نەخێر، بەلام بەشەرمەوە.

پرسیم: ئەی هەژاریت و توانات نیە پێڵاو بکڕیت؟

وتی: ئێستا هەندێك باری ئابوریم باش نیە، بەلام پێشتر بار و زروفم زۆر باشبوو، بەلام بەداخەوە هەموو پارەکەم لە کچە (١٢) ساڵەکەمدا سەرف کرد، چونکە تووشی نەخۆشیەکی کوشندە ببوو.. پرسیم: نەخۆشی کچەکەت چی بوو؟

وتی: تووشی نەخۆشی وەرەم بوو بوو، هەموو پارەکەم لەودا خەرج کرد. بەلام ئێستا مانای ئەوە نیە کە من سواڵ بکەم. بەڵکو

زۆر بێزارم لەخۆم. ئەوە بۆ ماوەی چەند مانگێکە نەهاتوومەتە دەرەوە. پارەشم ئەوەندە پێ نیە تا جوتێك پێڵاوی باش بکڕم، بەڵام دەست نەخشینم زۆرێك لە خەڵکی پێویستیان پێمە بۆ کارکردن، لە هەر جێگایەك کار بکەم پارەی باش وەردەگرم.

منیش کە ئەمەم زانی پرسیم: ئەی بۆ شل و شێواوی، هەناسەیەکی قوڵ هەڵدەکێشی؟! قورگی پڕبوو لە گریان، دیسان باسی کچەکەی کردەوە.

وتی: لەدوای ئەوەی کە هەموو توانایەکی خۆم بەکارهێنا بۆئەو کچەم. بۆئەوەی چارەسەری بکەم. بەڵام خوای گەورە بردیەوە بۆلای خۆی. منیش زۆرم خۆشدەویست، دەرگام لەسەر خۆم داخست لەماڵەوە، هەر بۆئەو کچەم دەگریام.. تا پێری شەو کە شەوی قەدری پیرۆز بوو، چومە مزگەوت، لەدوای نوێژی بەیانی گەڕامەوە بۆ ماڵەوە خەوتم..

لە خەونمدا کچەکەی خۆمم بینی لە بەهەشت، لەگەڵ کۆمەڵێك منداڵ، هەریەکە لەو منداڵانە مۆمێکیان پێ بوو، کچەکەی خۆم لەناویاندا بوو، بەڵام مۆمی کچەکەی من کوژابۆوە!

پێم وت: کچی خۆم بۆ مۆمەکەت کوژاوەتەوە؟

کچەکەم وتی: بابە گیان ئاخر هەرچەندە تۆ دەگریت بە فرمێسك مۆمەکەی من دەکوژێنیتەوە. من هەر دایدەگیرسێنمەوە تۆ هەر بە فرمێسك دەیکوژێنیتەوە. ئیتر بەئاگاهاتم، چاوم هەمووی فرمێسك

بوو، فرمێسکەکانم سڕی، بڕیارمدا ژیانم وەکو جاران ئاسایی بێتەوە، چیتر بە فرمێسکەکانم ئازاری کچەکەم نەدەم و مۆمەکەی نەکوژێنمەوە، لەمەودوا بەدوای ژیاندا وێڵ بم..

کە گوێم لە وتەکانی بوو. منیش چاوم پڕ بوو لە فرمێسك، بەڵام باوکەکە هەر نەدەگریا لەبەر خۆشەویستی بۆ کچەکەی، منیش و ئەویش بەیەکەوە پێڵاومان کڕی لەیەك و داوام لێکرد کە یەکتر بناسین. زۆر خۆشحاڵی خۆی دەربڕی، منیش باسی حاڵی خۆمم بۆ کرد، زۆر دوعای خێری بۆ کردم. پاشان وتی: تکایە بۆ کەسی باس مەکە.. منیش وەعدم دایە کەباسی نەکەم بۆ هیچ کەس.

کەچی لەم ڕۆژانەدا لە گۆڤارێك لە کوردستان وێنەی من و نوسینێکی منی بینی بوو، پەیوەندی کردبوو بە گۆڤارەکەوە، ئەوانیش تەلەفونی منیان دابوویە. پەیوەندی لەگەڵ گرتم. هەرچەندە نەمناسی یەکەمجار، بەڵام زۆر مەمنونی دەربڕی. کەهەر حەزی کردووە هەواڵم بزانێت و لەبار و گوزەرانم بپرسێت. منیش وامزانی پێویستی بە هاوکاری ماددی هەیە. بەڵام باسی بۆ کردم کە ئێستا سوپاس بۆ خوا کاردەکات و گوزەرانی زۆر باشە.. منیش تەکلیفم لێکرد کە ئەو بەسەرهاتەی و خەونەکەی بەکچەکەیەوە بگێڕمەوە. ئەویش ڕازی بوو، ئیتر منیش نوسیم بە ئومێدی ئەوەی سودی لێوەربگرن.... (گۆڤاری: ڕێگای کۆمەڵایەتی، ژمارە: ١، ٢٠/٥/٢٠١٢، ل٧٨ لە نوسینی: خەسرەو عبدالکریم).

**لەكۆتایدا:**

ئەی ئەو دایك و باوكانەی كە جگەر گۆشەكەت كۆچی دوایی كردووە، هەمیشە یادی خوا بكە و زیكری زوبانت (**إِنَّا لِلّهِ وَ إِنَّا إِلَيه راجِعُون**) بێت. لەخوا غافڵ مەبە و لەداوی شەیتان بەدووربە كە ناشوكریەك و ڕەخنەیەك لەكاری پڕ حیكمەتی خوا بە زوبان و دڵ و ناختدا بێت. خوای گەورەش صەبوری هەموو ئەوانە بدات كە مەحزونن بە لەدەستدانی كۆرپەكەیان آمین.

# وانەی نۆیەم

## بابەت: منداڵ نەبوون.

**- بەشی یەکەم -**

۞ **قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى:** ﴿لِّلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۚ يَهَبُ لِمَن يَشَآءُ إِنَٰثًا وَيَهَبُ لِمَن يَشَآءُ ٱلذُّكُورَ ﴿٤٩﴾ أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَانًا وَإِنَٰثًا ۖ وَيَجْعَلُ مَن يَشَآءُ عَقِيمًا ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌ قَدِيرٌ ﴿٥٠﴾﴾ **الشورى.**

۞ **قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (إذا دَخَلَ أَهْلُ الجَنَّةِ الجَنَّةَ، يُنادي مُنادٍ إِنَّ لَكُمْ أَنْ تَحْيَوْا فَلا تَمُوتُوا أَبداً، إنَّ لَكُمْ أَنْ تَصِحُّوا فَلا تَسْقَموا أَبَداً، وَ إِنَّ لَكُمْ أَنْ تَشِبُّوا فَلا تَهْرَمُوا أَبداً، وَ إِنَّ لَكُمْ أَنْ تَنْعَمُوا فَلا تَبْأَسُوا أَبَداً) رَواهُ مُسْلِم: (٧١٧٥).**

### سەرچاوەکان:


١) تەفسیری ڕۆشن، م. بورهان محمد أمین، پێداچوونەوەی: د. سید أحمد پێنجوێنی.

٢) ریاضُ الصّالِحین به کوردی، وەرگێڕانی: مامۆستا نوری فارس ب٤، ل٢٣٧، ل٢٢٧.

٣) ئایندەی هەسارەکەمان، مامۆستا شەماڵ موفتی، ل٦٤.

٤) ڕووداوەکانی ڕۆژگار، عبداللطیف کەم ئەندام ـ خوا لێی خۆشبێت ـ ب١، ل١٢٢.

٥) آياتُ الله في الآفاق. د. محمد راتب نابلُسی، ص٦١.

٦) ئەسرینەکانی سەدەی (٢٠/٢١) ئاوات أبو بکر أحمد، ل٢٥٣.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمين. وَالصَّلاةُ وَ السَّلامُ عَلى سَيِّدِنا محمد وَ عَلى آلِهِ وَ صَحْبِهِ أجْمَعين:

بۆ ئاوەدان کردنەوەی سەر زەوی بە مرۆڤ، خوای کاربەجێ زەواجی شەرعی داناوە، کە کوڕ و کچ ـ کە ڕێگری زەواج لەبەردەمیاندا نەبێ ـ بە شەرعی خوا بە حەلاڵی بەیەك بگەن. بەرهەمی ئەم هاوسەرگیریەش، ئەم خێزانە نوێیەش، بونی منداڵێکە، ئەم منداڵەش گەورە دەبێ و هاوسەرگیری دەکات و نەوەی تری لێدەبێتەوە. ئەم شێوەیە خوای پەروەردگار لە ڕێگای ئەم زەواج و هاوسەرگیریە جوانەوە، وە لە ڕێگەی بەهرە و خەلاتی بەخشینی منداڵەوە، ئاوەدانی بەسەر زەوی بەخشیوە، بۆئەوەی زەوی هەمیشە و بەردەوام ئاوەدان بێ بە مرۆڤ، کە بێگومان ساڵ لەدوای ساڵ مرۆڤ زیاتر دەبێ و بە ملیۆنەها زیاد دەکات.

## دانیشتوانی سەر زەوی لە ماوەی (هەشت) هەزار ساڵدا:

ساڵی (٦٠٠٠)ی پێش زاین، دانیشتوانی هەموو سەر زەوی (٥) ملیۆن کەس بووە.

ساڵی (٤٥٠٠)ی پێش زاین، واتە لەماوەی (١٥٠٠) ساڵدا، دانیشتوانی سەر زەوی بونەتە (١٠) ملیۆن کەس.

ساڵی (١٦٥٠)ی پێش زاین، ژمارەی دانیشتوانی سەر زەوی بۆتە (٥٤٥) ملیۆن کەس.

ساڵی (١٨٠٠)ی زاینی دانیشتوانی سەر زەوی بۆتە (یەك ملیار و سەد و حەفتا یەك ملیۆن) مرۆڤ.

ساڵی (١٩٣٥)ی زاینی بۆتە (٢) دوو ملیار مرۆڤ.

ساڵی (١٩٧٥)ی زاینی، دانیشتوانی سەر زەوی بۆتە (٤) ملیار مرۆڤ.

ساڵی (٢٠٠٧)ی زاینی، دانیشتوانی سەر زەوی بۆتە (٦) شەش ملیار و شەش سەد و حەوت ملیۆن کەس.

ساڵی (٢٠٠٨) لەبەرواری ٢٠٠٨/٣/٢٩ کاتژمێر (یەك)ی بەیانی بەکاتی عێراق دانیشتوانی هەسارەکەمان بوو بە (٦٦٥٢٩٥٧٤٠٠) کەس واتە: (شەش ملیار و شەش سەد و پەنجا و دوو ملیۆن و نۆسەد و پەنجا و حەوت هەزار و چوارسەد) کەس.

یاخود سەرنجی ئەم خشتەیە بدە کە زۆربوونی دانشتوان نیشان دەدات لە ساڵی (١٩٥٠) تا ساڵی (٢٠٠٧)ی زاینی:

| ساڵ | ژمارەی دانشتوانی سەر زەوی |
|---|---|
| ١٩٥٠ | دوو ملیار و پیێنج سەد و پەنجا و پێنج ملیۆن٢٥٥٥. |
| ١٩٦٠ | سێ ملیار و سی و نۆ ملیۆن ٣٠٣٩. |

| ١٩٧٠ | سێ ملیار و حەوت سەد و حەوت ملیۆن ٣٧٠٧. |
|---|---|
| ١٩٨٠ | چوار ملیار و چوارسەد و پەنجا ملیۆن ٤٤٥٤. |
| ١٩٩٠ | پێنج ملیار و دووسەد و هەشتا و سێ ملیۆن ٥٢٨٣. |
| ٢٠٠٠ | شەش ملیار و هەشتا ملیۆن ٦٠٨٠. |
| ٢٠٠٢ | شەش ملیار و دوو سەد و سی و چوار ملیۆن ٦٢٣٤. |
| ٢٠٠٤ | شەش ملیار و سێ سەد و هەشتا و شەش ملیۆن ٦٣٨٦. |
| ٢٠٠٧ | شەش ملیار و شەش سەد و حەوت ملیۆن ٦٦٠٧. |

(ئایندەی هەسارەکەمان، مامۆستا شەماڵ موفتی ل٦٤).

بەڵێ هەریەك لە ئێمە ژمارەیەکە لەو ملیار و ملیۆن، مرۆڤەی سەر زەوی و سوپاسی خوای لەسەر دەکەین کە ئێمەش لە ئاوەدان کردنەوەی سەر زەویدا خوای گەورە دەرفەتی ئامادەبوونی پێداوین. وە بەبێ گومان هەموو کەسیش حەزدەکات کە لەدوای خۆی کەسێك بەجێ بهێڵێ جێگرەوەی بێ. کە ئەمەش منداڵ و جگەر گۆشەکەیەتی، ئەوەی فیطرەتی مرۆڤایەتی نەشێوابێ حەزدەکات ڕۆژێ بەچکەی خۆی لە ئامێز بگرێ و باوك و دایك بێ..

منداڵ ئەوەندە خۆشەویستە لە قورئاندا بە سۆماری دیدە ﴿قُرَّتُ عَيْنٍ﴾ هاتووە. بەلابەری خەم و پەژارە هاتووە ﴿كَيْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ﴾.

نەك تەنها مرۆڤ، بەڵكو سەرنج بدە، ئاژەڵەکان، دڕندەکان، کە مرۆڤ لێیان دەترسیٚ و سامناکن و دڕندەن، کەچی سەرنجیان بدە، چەندە میهرەبانن بەرامبەر بەچکەکانیان، نابینی پڵنگێك، شێرێك، پشیلەیەك.. بەو کەڵبە تیژانەی چەندە بە میهرەبانی و سۆز و خۆشەویستیەوە، ئەو بەچکە تازە نەرم و شلەی هەڵدەگریٚ بەبیٚ ئەوەی پێستی ناسکی ئازاری پیٚ بگات لەکاتی گواستنەوەیدا!!

تەنانەت باڵندەکان ئەوەندە بەچکەی خۆیان خۆشدەوێت، کەلەدووری بەچکەکانیان قەرار و ئۆقرە ناگرن، کە خۆراکی دەم و چیکڵدانەی خۆیان دەکەنە دەمی بەچکەکانیانەوە و خۆیان برسی دەکەن بۆئەوەی بەچکەکانیان تێربن!.

### بەسەرهاتێکی سەرنج ڕاکێش:

کەسێکی خەڵکی گوندی (شیوە کەل) بەناوی (حسن) دەڵیٚ: جارێك تووشی پۆلێك کەوباڕ بووم، دایکەکەیان هەڵفڕی، منیش هەموو بەچکەکانیم گرت. هەر لەو شوێنەدا دانیشتم پاش ماوەیەك دایکەکەیان هاتەوە ئەو نزیکە و زۆر خوێندی بۆ بەچکەکانی، بەڵام

من هەموویانم گرتبوو، هیچ نەمابوو جوابی بداتەوە، کەزۆر خوێندی و وەڵامیان نەبوو، دوایی چووە سەر بەردێك هەڵنیشت بێ دەنگ بوو.. لەپاش دوو سێ دەقیقە کەوتە خوارەوە، کەڕام کرد بۆلای سەیرم کرد گیانی تیا نەماوە، لە غەم و سوتانی بۆ بەچکەکانی گیانی دەرچوو!! (ڕووداوەکانی ڕۆژگار، عبداللطیف کەم ئەندام، ب١، ل١٢٢).

بەڵێ لەگەڵ ئەوەدا کە منداڵ ئەوەندە خۆشەویست و شیرینە. بەڵام خوای گەورە و کار بەجێ و حەکیم، هەندێ لە بەندەکانی تاقیدەکاتەوە بەوەی کە ماوەیەکی دوور و درێژ منداڵیان ناداتێ یان هەیە هەر منداڵی نابێ و بەو حەسرەتەوە دەچێتە ژێر گڵ.. پەیامی ئەم جارەمان، ئەم وتارەمان لە زنجیرە باسی (لەخوا غافڵ مەبە) بۆئەو کەسانەیە کە تا ئێستا منداڵیان نیە و چاوەڕێی لوتف و کەرەمی خوای بەخشندەن کە منداڵێکی صاڵحیان پێ ببەخشێ.



## دوو پەیام بۆ ئەوانەی منداڵیان نابێت:

### پەیامی یەکەم: دونیا شوێنی تاقیکردنەوەیە.. نەك پاداشت:

ئێمە هەموومان لە دنیادا دەژین، دەبێ ئەو ڕاستیەمان قبوڵ بێ کە ئێرە، ئەم ژیانەمان لەسەر هەسارەی زەوی، پێی دەوترێ ژیانی

دونیا، ئێرە ئەم تەمەنە شوێنی تاقیکردنەوەی بەندەکانە، ئێرە شوێنی پاداشت نیە کە بەهەشتە بۆ خواناسان و خۆڕاگران، خۆ هەمووشمان ئەو حەقیقەت و ڕاستیە زۆر باش دەزانین کە: ژیانی تاقیکردنەوە ناخۆشی و مەینەتی زۆری تێدایە..

هەروەکو خوێندکارێك تا لە هۆڵی خوێندن و تاقیکردنەوەدایە، بەڕاستی ئاسوودەیی زۆر کەم دەبینێ. بەڵام کە نمرەی وەرگرتەوە بە پلەی بەرز و نایاب دەرچوو بوو. ماندووبوونی دەحەسێتەوە. بەهەمان شێوەش، ئێمەی مرۆڤ، لەم هۆڵی تاقیکردنەوە دونیایەدا، کەژیانمان، تەمەنمان، بەتاقیکردنەوە باسکراوە لە قورئاندا، هەروەکو دەفەرمووێ: ﴿ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡمَوۡتَ وَٱلۡحَيَوٰةَ لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗاۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡغَفُورُ ۝٢﴾ الملك.

## کەس هەیە کەم و کوڕیەکی نەبێت؟

جاوەرە سەیری ژیانی مرۆڤ بکە لەسەر زەویدا بزانە کەسێك دەبینی کە کەم و کوڕی نەبێ؟ بێگومان نەخێر. سەرنج بدە و ڕابمێنە:

- کەسی واهەیە زۆر دەوڵەمەند و سامانداره، پارەدارێکی ناودارە، لەخانووی جوان و بازاڕ و دوکانی بەکرێ دراو، ئوتومبێلی گرانبەها و جێی تێڕامان و زۆری هەیە. بەڵام منداڵی نیە. هەر خۆی و خێزانی بەیەکەوە دەژین و ئەم هەموو دەوڵەمەندی و پارە و

سامانە نەك هەر دڵخۆشی نەکردووە. بەڵکو بۆتە خەم و مەراق و مەینەت بۆی، کە بیردەکاتەوە کە مرد منداڵێکی لە شوێن جێ نەماوە، کە ئەم ماڵ و موڵکەی بۆ جێ بێڵێ (ئەمە بە تایبەت ئەگەر کەسێکی تێگەیشتوو لە دینی ئیسلام نەبێ، هەر زۆر خەمناك دەردەکەوێ)..

- لە بەرامبەردا کەسێکمان هەیە منداڵێکی زۆری هەیە، هی واهەیە (١٠ تا ١٥) منداڵی هەیە. هەرچەند خۆدەپارێزێ لە منداڵبوون هەر زیاتر منداڵی دەبێ. بەڵام لەبواری ئابوریدا زۆر وەزعی خراپە و هەژارە، بۆیە ئەمیش هەمیشە لە خەم و مەراقی ئەوەدایە کەچۆن بەخێویان بکات. چۆن جل و پۆشاکیان بۆ بکات. تایەکیان پۆشتە دەکاتەوە، یەکیان ڕوت و ڕەجاڵە، بێ بەرگ و بێ پێڵاوە.. تا ژەمێکی باش دەخۆن، چەن ژەم برسین. ئەمیش تەرازوەکەی لاسەنگە (منداڵی زۆر و دەرامەتی کەم) بۆیە ئەمیش خەمناکە!.

- کەسی واهەیە کۆئەندامی هەرس و گەدەی زۆر چاکە و کورد وتەنی: بەرد دەهارێ. کەچی خواردنێکی بەدڵی خۆی دەست ناکەوێت بیخوات. فەلافل بخوات وا دەزانێ کەبابە!. بەڵام هەمیشە برسیەتی و خەیاڵ بە خواردن و سفرەیەکی چەور و ڕازاوەوە لێدەدات!.

- لەبەرامبەر ئەمیشدا کەسی واهەیە. هەموو ڕۆژێك و ژەمێك سفرە و خوانی وەکو ڕۆژی جەژن وایە. لەسەر سفرە جۆری خواردنەکانی بۆ ناژمێردرێ، بەڵام مەگەر هەر بە مەراقەوە تێی ڕابمێنێ، چونکە ناتوانێ لێی بخوات، لەبەرئەوەی چەندین نەخۆشی لێی کۆبۆتەوە. فشاری خوێنی بەرزە، شەکرەیەتی، چەوری خوێنی زۆرە، برینی گەدەی هەیە.. کۆڵۆنیەتی مایەسیریەتی، خوێنی خەستە.. بە کورتی هەزار و یەك دەردت بۆ دەژمێرێ! ئەو صەمونی جۆ و تۆزە ئاوەش کە دەیخوات بە ترسەوە دەیخوات ئەمیش خەمی زۆرە. کە خەمی هەرە گەورەیە. چونکە ئەگەر جەستەی ساغ و گەورەترین خەڵات بێ. نەخۆشی و پارێزی لە هەموو خواردنێ، گەورەترین نەدامەتی و دەرونی پڕ لە ئازارە..

- لەو لاوە کەسی واهەیە، هەموو شتێکی چاکی هەیە، لە هیچی کەم نیە، لەشی ساغە، پارەی چاکی هەیە. کار و کەسابەتی باشی هەیە، ژنی چاکی هەیە.. بەڵام منداڵی نەگبەت و ناصاڵح هەمووی لێ تێك داوە. منداڵە خراپەکانی ماڵەکەیان لێ کردووە بە دۆزەخ و نانیان لێ کردووە بە زەهر. ئەمیش گیرۆدەی دەستی منداڵی خراپە.

- کەسی واش هەیە هەموو شتێکی چاکی هەیە، منداڵەکانیشی صاڵح و چاکن، بەڵام پەنا بەخوا هەمیشە دڵی تەنگە، بەردەوام قەلەقە و ئەو دڵەی ئاسودە نەبێ، زۆربەی کات خەمناکە ! !

بەم شێوەیە سەرنج بدە کەس لەم دنیایەدا نابینی خەم و خەفەت و کەم و کورتیەکی نەبێ، جا لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێ: باشە بۆچی دەبێ ژیانی ئەم دونیایە بەم شێوەیە بێ؟! بۆ دەبێ هەریەکەی کەم و کورتیەکی هەبێ؟

بۆ نابێ کەسێ هەبێ لە دنیادا هەرچی خەمە نەیبێ؟!

لە وەڵامدا دەڵێین: بۆئەوەی پەروەردگار نیشانمان بدات کە ئەی مرۆڤ، ئێرە دونیایە، ئێرە بەهەشت نیە. دەی ئەگەر دەتەوێ بەهەموو ئاواتەکانت بگەی وەرە هەوڵی بەهەشت بدە. تەنها لە بەهەشتدا هەموو حەز و خەون و خولیاکانت بە واقیعی دەبینی و هەرچی کەم و کورتی بێ نیە و بە خەیاڵیشتدا نایەت. ئەمەش بەڵێنی پەروەردگارە بۆ بەندە چاکەکانی وەکو لە فەرموودەیەکی قودسیدا فەرموویەتی:

(أَعْدَدْتُ لِعِبادِيَ الصّالحينَ مالا عَيْنٌ رَأَتْ، وَلا أُذُنٌ سَمِعَتْ، وَلا خَطَرَ عَلى قَلْبِ بَشَرٍ، وَاقْرَأُوا إِنْ شِئْتُمْ: ﴿فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِىَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾﴾ السجدة ).

متفق عليه: (بُخاري: ٣٢٤٤) وَ مُسلم: (٧١٣٢).

واتە: خوای گەورە دەفەرمووێ: ئەو بەهرە و خۆشی و خەڵاتە کە خۆم ئامادەم کردووە و هەڵم گرتووە بۆ بەندە باش و چاکەکانی خۆم. ئەوەندە باش و نایابن، نە بەچاو بینراون و نەبە گوێ

بیستراون و نەبەدڵی کەسدا هاتوون و نەبە خەیاڵی ڕابوردون، ئەوە جگە لەوەیش کە خۆتان ئاگادارینی و لە قورئان و حەدیسا باس کراوە بۆتان، ئەگەر حەزیش دەکەن بۆ پشتگیری ئەم فەرموودەیە، ئەم ئایەتە بخوێننەوە کە دەفەرمووێ: (کەس نازانێ کە چ خێر و خۆشی و خەلاتێکم لە پشت پەردەی غەیبەوە بۆ ئەو خودا پێداوانە ئامادەکردووە. کە دەبێ بە مایەی ڕۆشنی چاو و دڵ و دەرونیان، ئەوەش لە پاداشتی باوەڕی ساغ و کردەوەی باشیاندا.. ((رِياض الصّالِحِينَ) وەرگێڕانی: م. نوری فارس، ب٤، ل٢٢٧).

لە فەرموودەیەکی تردا، پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ دەفەرمووێ: (**إِذا دَخَلَ أَهْلُ الجَنَّةِ الجَنَّةَ، يُنادي مُنادٍ إِنَّ لَكُمْ أَنْ تَحْيَوْا فَلا تَمُوتُوا أَبَداً، إِنَّ لَكُمْ أَنْ تَصِحُّوا فَلا تَسْقَمُوا أَبَداً، وَ إِنَّ لَكُمْ أَنْ تَشِبُّوا فَلا تَهْرَمُوا أَبَداً، وَ إِنَّ لَكُمْ أَنْ تَنْعَموا فَلا تَبْأَسُوا أَبَداً**) رواهُ مُسْلِم: (٧١٧٥).

واتە: کاتێ بەهەشتیەکان سەرجەم چوونە ناو بەهەشتەوە، ئیتر جارچی جاڕ هەڵدەدا و ئەم موژدە خۆشەیان بۆ پەخش دەکاتەوە: ئەی دانیشتوانی بەهەشت، ژیانی نەبڕاوەی پڕ خێر و خۆشی تاپۆیە لەسەرتان، ئیتر هەتا هەتایە لەم خۆشیەدا دەژین و هەرگیز نامرن، هەتا هەتایە هەر لەش ساغ و بەبێ دەرد و ئازار و خۆشی بە ئاسودەیی بۆخۆتان دەژین، هەمیشە گەنج و لاو دەبن و هەرگیزاو

هەرگیز پیر و ئیختیار و کەفتەکار نابن، بەردەوامیش لەخۆشی و لەزەت وەرگرتندا دەبن و هەرگیز فەقیر و هەژار و کەساس ناکەون.

بەڵێ ئەوەی مرۆڤ لە ژیاندا لێی دەترسێ و ژیانی لێ تاڵ دەکات، ئەگەر هەرسێکیشیان بەیەکەوە بن، ئەوە پەنا بەخوا دەبێ هەر دوعاکەی (مەولەوی) شاعیری گەورەی کورد بکەن کە دەفەرمووێ: (پیری و هەژاری و کەساسی هەرسێ.. نەبن بە باری شانی هیچ کەسێ). ئەمە لە بەهەشتا نامێنێ و ئیتر خۆشی نەبڕاوە تەنها و تەنها لە بەهەشتدایە، دەی خوای گەورە بەهەشتمان پێ خەڵات بفەرمووێ. آمین. (ریاض الصّالحین، وەرگێڕانی: م. نوری فارس، ب٤، لا:٢٣٧).

ئەی ئەو کەسەی کە ساڵانێکی زۆرە لە چاوەڕوانی منداڵدای، وەرە دنیا لە خۆت تەنگ مەکە، هیچی تر دڵت بە خەم مەکە، دڵنیابە ئەگەر تۆ خەم و گرفتی منداڵیت هەیە، لە چەندین لایەنی ترەوە ئاسودەی، خەڵکی تر کە منداڵی هەیە. لە چەند لای ترەوە گرفتارە، دڵنیاش بە ژیانی دونیا زوو تێدەپەڕێ و بەهەشت هەیە. وەرە چاوت لە بەهەشت بێ کە هەموو هیواو خۆزگەکانتی تێدا دێتەدی. یەکسەر خەمی دڵت لادەچێ و قەناعەتت بۆ دێ.



## پەیامی دووەم: منداڵ نەبون.. جۆرێکە لەبەخشین!

ئەی ئەو کەسەی کە منداڵت نیە لەخوا غافڵ مەبە و بزانە، دەسەلاتی خوای پەروەردگار بێ سنورە و هیچ شتێ لە دەسەلاتی ئەودا مەحاڵ نیە. ئەگەر پێت ببەخشێ بە ڕەحمەتی خۆیەتی و ئەگەر پێت نەبەخشێ بە حیکمەتی خۆیەتی. دڵنیابە نەبەخشینی منداڵ پێت هەر جۆرێکە لە بەخشین. سەرنجی قورئان بدەن، دەفەرمووێ: ﴿لِّلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۚ يَهَبُ لِمَن يَشَآءُ إِنَٰثًا وَيَهَبُ لِمَن يَشَآءُ ٱلذُّكُورَ ﴿٤٩﴾ أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَانًا وَإِنَٰثًا ۖ وَيَجْعَلُ مَن يَشَآءُ عَقِيمًا ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌ قَدِيرٌ ﴿٥٠﴾﴾ الشورى.

واتە: خەڵکینە دڵنیابن کە خاوەنی ئاسمانەکان و زەوی هەر خوای گەورە خۆیەتی هەرچی بوێت دروستی دەکات، بە هەندێك خێزان ویستی وایە کە هەر کچ ببەخشێت، بە هەندێکی تریش ویستی وایە کە هەر کوڕیان پێ ببەخشێت. یاخود لە هەردوو ڕەگەز بە هەندێ خێزان دەبەخشێت لە کوڕان و لە کچان، هەیشە ویستی ئەو زاتە وایە کە هیچیان نەبێت و نەزۆرك بن، بەڕاستی ئەو زاتە تەواو زانایە (لە ڕێکخشستنی ژمارە و پێداویستی نەوەکاندا) تەواویش بە توانایەلە (بەخشین و نەبەخشیندا). (تەفسیری ڕۆشن، بورهان محمد أمین).

بەڵێ ئەم قورئانە پڕ بەخشش و بەرەکەتە، کە باسی بوونی منداڵ دەکات، سەرەتا باسی ئەوە دەکات کە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دایە موڵکی خوای گەورەیە..

لێرەدا خوای گەورە سەرنجی مرۆڤ ڕادەکێشێ بۆ سەرنجدان و ورد بوونەوە لە ئاسمانەکان و زەوی، جا ئێمەی مرۆڤ تا ئێستا زانستمان تەنها لە بەشێکی زۆر کەمی ئاسمانی دونیادا یە. کەلە ناویشیدا مەجەڕە (گەلە ئەستێرە) هێی کاکێشان پەی پێدەبەین و وەکو هێڵێکی سپی لەشەوانی ساماڵی هاویندا دەی بینین. کە زانایان دەڵێن، نزیکەی (سی) ملیۆن ئەستێرەی تێدایە. کە دەڵێین ئەستێرە مەبەست لەو ئەستێرە بچکۆلانە نیە کە چاومان دەیبینێ. کە لەدوریانەوە لە زەوی ئاوا دێتە بەرچاو.. بەڵکو خۆر و مانگ و زەوی و هەموو کۆمەڵەی خۆر بە گشتی تەنها یەك دانە ئەستێرەیە لەو سی ملیۆن ئەستێرەیەی کە لە هێڵی کاکێشاندایە هەیە. کە زانایان دەڵێن زیاتر لە یەك ملیار گەلە ئەستێرەی (مەجەڕەی) ئاوا تەنها لە ئاسمانی یەکەمدا هەیە!! (آياتُ الله في الآفاق. د. محمد راتب نابلوسي ص٦١).

جا خوای گەورە دەفەرموێ، ئەمە لە ئاسمانی یەکەم و هەر حەوت ئاسمانەکە و ئەوەی لە زەوی و سەر زەوی و ناخی زەویدایە، هەمووی هی خوایە. ئائەو خوایەیە کە دروستکەری ئەم

گەردونەیە.. هەر ئەو خوایەیە کە منداڵ دروست دەکات و بە دیاری دەیبەخشێت بە دایك و باوکەکان..

کەواتە: ئەی مرۆڤ لە خوا غافڵ مەبە و بزانە کە دروستکردنی مرۆڤ لە چاو ئەو کەونە، ئەو هەموو گەلە ئەستێرە و ملیارەهای ئاوا و ئەم هەموو زەویە، زۆر ئاسانترە. جا کە هەندێ کەس منداڵی نابێ بابزانێ کە ئەوە حیکمەتی خوایی تێدایە. ئەینا بۆ خوا زۆر ئاسانە، بۆیە لە کۆتایی ئایەتەکە دا فەرمووی: ﴿إِنَّهُۥ عَلِيمٌ قَدِيرٌ﴾.

باسی دوو صفەتی بەرز و باڵای خوای کرد:

یەکەم: ﴿عَلِيمٌ﴾ بەڕاستی خوا زانایە بەوەی چی بۆ بەندەکەی باشە، ئایا خێری تێدایە بۆی منداڵی ببێ یان نەیبێ، هەر خوا دەزانێ.

دووەم: ﴿قَدِيرٌ﴾ بەڕاستی خوا بە توانایە بە فەرمانی (ببە) هەموو شتێ دەبێ.

جا ئەی ئەو کەسەی کە تا ئێستا منداڵت نیە، بیر لە گەورەیی خوا بکەوە، دڵنیابە کە خوا خۆشی بەندەکانی دەوێ. ئێمە ڕواڵەتی شتەکان دەبینین، بەڵام خوای پەروەردگار ئاگادارە بەوەی کە لە داهاتوودا چی ڕوودەدات و دێتە پێش تۆ. بۆیە کە منداڵت نەبوو، نەچی لە خوا غافڵ بیت و شەیتان ڕێنمایت بکات کە تۆ هێندە خراپی بۆیە منداڵت نیە، خوا لێت تورەیە! نەخێر، ڕوو لە خوا بکە

و دڵنیابە خوا خۆشی تۆی دەوێ، پاراستوی لە منداڵێك کە ژیانت لێ تاڵ دەکات.

نابینی ڕۆژانە لەبەردەم دەرگا و گرتوخانە و بنکەی پۆلیسدا، چەند دایك و باوکی بەڕێز و بە حورمەت دەبینی کە بەهۆی ئەولادێکی لار و لەوێر و نەگبەتەوە توشی ئەو شوێنە بووە، ئەینا هەرگیز ئەوێی نەدەبینی، ئەو منداڵە خراپە ئەو دایك و باوکەی هێنایە بەردەم مەحکەمە و سجن و پۆلیس و مەمنونی و دەست ماچکردنی خەڵکانی کردن..

دەی تۆ لەم کاتەدا بڵێ: خوایە هەزاران سوپاس بۆ تۆ کە منداڵێکی ئاوا لاسار و سەر لارم نیە، کە هەموو ڕۆژێ تووشی بەردەم حاکم و پۆلیسم بکا و ناوم بەدبێ و لە هیچ گەڕەك و کۆڵانێکدا جێم نەبێتەوە، سوپاس بۆ تۆ کە منداڵێکی ئاوا خراپم نیە کە خەڵك لە جیاتی ڕەحمەت بڵێن: هەی ڕووی باوکی ڕەش بێ و دایکی ڕاست نەبێتەوە بۆ منداڵێ بەرهەمی هێناوە.. دەی نەبەخشینی ئەم جۆرە منداڵە خراپە بۆ خۆی بەشێکە لە بەخشین. لە ڕەحمەت، لە میهرەبانی و ڕەحمی خوا بەرامبەر تۆ.

جا منداڵ هەر بوونی مەرج نیە، منداڵ بۆ ئاسودەیی دڵ و دەرونە، بۆ گەشی چاو و ناخە. لەو کەسانە دەپرسین کە منداڵیان نیە: ئایا منداڵ هەر بۆئەوە نیە کە دڵت پێی ڕۆشن بێ؟ ماڵت پێی

ئاوەدان بێ؟! دەی هەموو منداڵێك وانیە. منداڵی واهەیە ژیانت لێدەکات بە ژان.



## گەر خودا نەیدا بەزۆر نیە.. ﴿بەسەرهات﴾

ئەم پیاوە بەم شێوەیە باسی خۆی دەکات و دەڵێت: ژیان و گوزەرانم تا بڵێی زۆر باش بوو، خۆم و خێزانم ماوەی (پێنج) ساڵ بوو هاوسەرگیریم لەگەڵ ئافرەتێکی دامەزراوی فەرمانبەردا ئەنجام دابوو، تائەو کاتەش خوای بەخشندە بە هاتنە دنیای زارۆڵەیەك بەسەری نەکردبووینەوە، کاری ڕۆژانەی خۆم دوای دەوامی قوتابخانە، دوکانداری بوو، خوای کاربەجێ حەز و ئارەزووی مرۆڤەکانی وا دروست کردووە دوای چەند مانگ و تەنها یەك دوو ساڵ دوای هاوسەرگیری ئیتر چاوەڕوانی منداڵ دەکرێت..

ئێمەش زۆر حەزمان لە منداڵ بوو، بە تایبەتی هاوسەرەکەم، زۆر سەردانی دکتۆرمان کرد، زۆر گژ و گیا و دەرمانی کوردەواریشمان تاقی کردبۆوە. زۆر دوعای خێرمان کردبوو، زۆر زۆرمان پەلەبوو، بەڵام بێخود بوو.

ساڵی (١٩٩٢)ی زاینی بوو، لە مانگی پیرۆزی ڕەمەزاندا بەیەکەوە زۆر پاڕاینەوە لە خوا لە بیستی ڕەمەزاندا خەونم بینی، لە خەونەکەمدا موژدەی گیرابوونی دوعاو نزاکانم درایەوە، بەڵام ئەو

کەسەی کە موژدەکەی پێدام جار جار ڕووی گرژ دەبوو! ! لەدوای تەواو بوونی مانگی شەوال (شەشەڵان) خێزانم هەواڵی دامێ کە هەست دەکات دووگیانە، لەلای پزیشکی تایبەت بە ئافرەتان خۆی خستە ژێر چاودێریەوە، لە نزیکەوە چاودێری دەکرا، تا کات وای لێهات منداڵەکەمان هاتەبوون، لەگەڵ چاو ڕۆشنی، کوڕمان بوو. هەردووکمان زۆر دڵخۆش بووین، ڕەنجی چەند ساڵەشمان هاتە بەرهەم..

بەڵام (ئەوەی لەلای بەندە خەیاڵە، لای خوا بەتاڵە) منداڵەکەمان تا شەش مانگی تەواو کرد.. بە نەخۆشی و ناسۆرەوە گەشەیەکی کەمی کرد، بەبەردەوامی دەگریا، وامان لێهات زۆر بە دەستیەوە هەراسان بووین. لەگەڵ دایکی بەنۆرە ئێشکمان لێ دەگرت. ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەو لاوازی و نالەباری تەندروستی دەڕۆشت، دکتۆری منداڵان هیچیان بۆ ساغ نەبۆوە، موچەی کەمی مانگانەم بووە خۆراکی عیادەی ئێواران، بەڵام بێئاکام بوو! ..

خەمێکی زۆرمان لێدەخوارد، زۆرجار دەموت: خوایە گیان هیچ کارێکت بێ هۆ نیە، خۆزگە ئەمەشمان نەبوایە.. ڕۆژێك لە عیادەی دکتۆرێك بووین و کاغەزێکی پێدایین کە بچنە بەغداد لەوێ دکتۆر و کەرەستەی باش هەیە. چارەسەری نەخۆشی ئاسانترە، لەگەڵ نەبوونی و بارگرانی هەندێك پارەم لە خزم و کەس و کار و هاوڕێیانم بە مەرجی قەرز بۆ ماوەی تا سەری مانگ وەرگرت. نەبوونی و

بارگرانی بوو، کەم کەس پارەی هەبوو بیداتە قەرز، بەڵام گوزەرانی من جیاواز بوو. پاش چەند ڕۆژێکی تاڵ کە زۆر بە زەحمەت گوزەریان کرد، گەیشتینە (بەغداد) و لەو نزیکەوە منداڵەکەمان بردە لای پزیشکی تایبەت..

ئەویش زۆر دڵسۆزانە پشکنینی بۆ کرد، پاشان داوای لە دایکی کرد، کە ئەویش پشکنین بۆ شیرەکەی بکرێت!! لە ئاکامدا وتی: کاکە شیری ئەم دایکە ماددەی (کلسی) تێدایە کەچووە ناو گەدەی ئەم منداڵەوە، دەبێتە ڕەمڵ و لە گورچیلەدا دەبێتە بەرد، وتم: جا دکتۆر گیان چارەسەر چیە؟!

دکتۆر وتی: دەبێ لەمەولا ئەو دایکە شیری خۆی بەو منداڵەی نەدات، لە هەزار ئافرەتدا یەك ئافرەت بەو شێوەیە دەردەچێت و بەختی خۆتان قەدەر ئەمەی بە ئێوە بەخشیوە! بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە وتم: ئەی چ چارەسەرێکی هەنووکەیی هەیە بۆ چاك بوونەوەی منداڵەکەم؟!

دکتۆر وتی: چارەسەری ئەمەیە: (نەشتەرگەری بۆ بکرێت، گورچیلەکانی بشۆرێتەوە و ئەگەر باش بوو ئەوە زۆر چاکە و ئەگەرنا دەبێت تا تەمەنی (١٢) ساڵان دوو سۆندەی بۆ دابنرێت و بەبەردەوامی ئاوی موقەتەری بکرێتە سەر، ئەم نەشتەرگەریەش (١٠) دەهەزاری سویسری تێدەچێت، ئەگەر ئەمەش ناکەن

تاماوەیەکی تر دەژی و پاشان ئەمرێ، ئەگەر چی مردن و ژیان هەر بەدەستی پەروەردگارە !).

وەکو کوتەکێك بدەن بە پشتی سەرمدا کاس بووم و زۆری نەمابوو لەهۆش خۆم بچم، زۆر خەمناك بووم. بە پەژارەوە گەڕاینەوە بۆ سلێمانی..

سەرمایەی دەستمان خانووەکە بوو، بەبرێکی باش فرۆشتمان، پارەی سپی بۆ ڕۆژی ڕەش، وردە وردە کارەکەمان بۆ ئەنجام درا و ڕۆژێك باش و دەڕۆژ خراپ. هەموو سەروەت و سامانمان لەپێناو منداڵەکەماندا خەرج کرد و کوڕ هەر نەبوو بە کوڕ، بەلاَم هیواو ئاواتمان هەر بە خودا قایم بوو، کە بە داهاتوودا قەرەبووی خێرمان بۆ دەکاتەوە.. ئەوە چەند ساڵێکە بە کوێرەوەری و چاوی پڕ لە گریانەوە من و دایکی بەخێوی دەکەین و نەشبووین بە خاوەنی هیچ منداڵی تر. بەلاَم ئازیزان هیچ کارێکی پەروەردگار بەبێ حیکمەت نیە. خەزێنەی پڕ لە ڕەحمەتی زۆر زۆرە و هیواداریین ئەم بەم منداڵە خاوەنی پاداشت بین..

(ئەسرینەکانی سەدەی ٢١/٢٠، ئاوات أبو بکر أحمد ل٢٥٣).

بەڵێ ئەی خوشك و برای بەڕێز، تۆش کە منداڵت نیە. زۆر ڕێی تێدەچێ شیرەکەی تۆش خوشکەکەم یەکێك بێ لەو شیرانەی کە ئاوا بەرد لە گورچیلەی منداڵدا دروست بکات، کێ دەڵێ کە ئێستا

هەمیشەی دوعادەکەی و لەخوا داوادەکەی (کەئەوە بۆ خۆی عیبادەتە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (الدُّعاءُ هُوَ العِبادة). ئەو کاتە لەبەر منداڵێکی ناساغی لەش بە ئازاری نەخۆش ئاهی دوعا و پاڕانەوە و نوێژ و ڕۆژوەکەشت دەمێنێ؟! دەی دڵنیابە کە خوای پەروەردگار تا ئێستا منداڵی پێ نەبەخشیوی ئەوە تۆی خۆشویستووە. هەر ئەوەش باشە کە خوای تاك و تەنهای زانای بەتوانا و حەکیم و کاربەجێ. بڕیار لەسەر بدات.

# وانەی دەیەم

## بابەت: منداڵ نەبوون

- بەشی دووەم -

﴿ قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وَ تَعالى: ﴿ٱلْمَالُ وَٱلْبَنُونَ زِينَةُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَٱلْبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيْرٌ أَمَلًا ﴿٤٦﴾﴾ الكهف.

﴿ قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (إِنَّ الوَلَدَ مَبخَلَةٌ مَجْبَنَةٌ). رَواهُ إِبْنُ ماجَّة: (٣٦٦٦) وَ إسْنادهُ صَحيحٌ.

### سەرچاوەکان:


١) تەفسیری ڕۆشن، بورهان محمد أمین، پێداچوونەوەی: د. سید أحمد پێنجوێنی.

٢) نَظْرَةُ النَّعيم، ج٩، ص٤٣٢٣.

٣) آياتُ اللهِ في الآفاق. د. محمد راتب نابلوسي، ص٤١.

٤) زەردەخەنەی هیوا، ئەندازیار عثمان، ل١١.

٥) پایزە برا، مەلا ئەحمەدی شەریعە ب١، ل٢١.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العالَمين. وَ الصَّلاةُ وَ السَّلامُ عَلى سَيِّدِنا محمد وَ عَلى آلِهِ وَ صَحْبِهِ أجْمَعين:

ئەم وانەیەشمان لە زنجیرە باسی لە خوا غافڵ مەبە، تەواوکەری وانەی ڕابردوو، پەیامێکە بۆ دڵی ئەو کەسانەی کە ڕۆژانە و شەوانە دڵ بەخەمن بەهۆی ئەوەی منداڵێکیان نیە، چاویان لەو هەموو جوانیەی سەر زەوی تەنها منداڵ دەبینێ، کە ئەمە خۆی لە خۆیدا تاوان نیە. چونکە کەسێ لە شوێنی درێژە پێدەری ژیانی بێ، لەدوای مردنی خۆی لە ماڵی هەر ئاوەدان بێ، بە دوعای منداڵی صالحی لە خێر و چاکە بێبەش نەبێ، لە پیری و کەنەفتیدا گۆچانی دەستی بێ، لە مەحزونی و خەم و مەینەتی ژیانتدا بەچکەکەی بگرێ بە باوەشەوە بە بۆن کردنی خەمی برەوێ و چاوی ڕۆشن و ڕۆشنا بێ ﴿كَيْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ﴾.

## هەر یەکەمان خەمێکمان هەیە..

هەروەکو لە وتاری ڕابردوودا باسمان کرد، هیچ کەس نیە لەو سەرزەویەدا کەکەم و کوڕی و کورتیەکی نەبێ، هەریەکەی لە بوارێکەوە خەمی هەیە، ئەو کەسانەش کە منداڵیان نیە، خوای گەورە لەم بوارەدا تاقیکردونەتەوە، دنیاش هەمووی هۆڵی تاقیکردنەوەیە..

جا خوای گەورە لە قورئاندا لەگەڵ باسکردنی ئەو حەقیقەت و ڕاستی یە کە ژیانی دونیا تاقیکردنەوەیە، سەرنجمان بۆ شتێکی زۆر گەورە ڕادەکێشێ، ئەویش ئەوەیە کە دەفەرمووێ: وەرن لەسەر زەویەوە سەر بەرز بکەنەوە و سەیرێکی ئاسمان بکەن. ئەی ئەو مرۆڤەی کە سەرت نزم کردووە وەکو کەسێ شتێکی بچکۆلەی لێ بزر بووبێ. چۆن سەری نزم دەکا و تەنها سەیری بەردەمی خۆی دەکات و چاوی لەسەر هیچی تر نیە دڵی خەمی هیچی تری تێدانیە. مرۆڤیش بە گشتی ئاوا سەری خۆی نزم کردۆتەوە هەریەکەی عەوداڵی گەڕان و وردبوونەوەیە بەدوای ئەوەی وێڵ و شەیدایە بە شوێنیدا.

یەکێ هەر بیری لای پارە و پوڵە، هەیە بیری لای کۆشك و تەلارە.. هەیە بیری لای ڕەگەزی بەرامبەرە و کوڕە تەنها کچێ لەم جیهانەدا دەبینێ، یان بە پێچەوانەوە کچێکە و شۆڕەسوارەکەی بە کوڕێك دەزانێ و تەنها چاوی لەسەر ئەوە.. هەشە بەدوای پلە و پایە و مەسئولیەتدا وێڵە و ئاواتی ئەوەیە بگاتە فلان کورسی و پۆستی دەسەلاتە. کەسان و چین و توێژێکی زۆریش هەن، کە سەریان داخستووە و هەموو تێڕوانین و بیرکردنەوەیان لەسەر بوونی منداڵێکە، بە ئاشکرا دەری دەبڕن، کە هیچیان لە خوا ناوێ لەدوای دین و ئیمان تەنها منداڵێك نەبێت.

جا بەڕاستی کە منداڵەکە نابێت، کەساڵانێکی زۆر ئەم خەونەیان نایاتەدی، هەست بە دڵ تەنگی دەکەن، ئەم زەویە فراوانەیان لێ دەبێت بە کونی دەرزی.. ئاڵەم کاتەدا خوای گەورە بە ئەوان و بە هەمووومان کە هەریەکەمان بەهۆی بەدەست نەهێنانی ئەوەی شەیدا و عەوداڵینی، وا ئەزانین ئیتر هیچی تر لەسەر زەوی نیە. خوای گەورە دەفەرمووێ: هەستە سەری نزمت بەرز بکەوە، سەیری ئاسمان و ئەستێرەکان و ئەم گەردوونە فراوانە و جێگا دەستی قودرەتی خوای پەروەردگار ببینە، ئەمجا بزانە چۆن دڵت دەکرێتەوە. ئەمجا تێدەگەی کە ژیان و ژینگە زۆر لەوە گەورەترە کە تۆ وادەزانی هیچت تێیدا نیە..

بابچینە خزمەت قورئان کە دەفەرمووێ: ﴿تَبَٰرَكَ ٱلَّذِي بِيَدِهِ ٱلۡمُلۡكُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ۝١ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡمَوۡتَ وَٱلۡحَيَوٰةَ لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗاۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡغَفُورُ ۝٢ ٱلَّذِي خَلَقَ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٖ طِبَاقٗاۖ مَّا تَرَىٰ فِي خَلۡقِ ٱلرَّحۡمَٰنِ مِن تَفَٰوُتٖۖ فَٱرۡجِعِ ٱلۡبَصَرَ هَلۡ تَرَىٰ مِن فُطُورٖ ۝٣ ثُمَّ ٱرۡجِعِ ٱلۡبَصَرَ كَرَّتَيۡنِ يَنقَلِبۡ إِلَيۡكَ ٱلۡبَصَرُ خَاسِئٗا وَهُوَ حَسِيرٞ ۝٤﴾ الملك.

واتە: گەورە و موبارەك و پیرۆز و شکۆمەندە ئەو زاتەی کە جڵەوی هەموو بونەوەر و هەموو جیهانەکانی بەدەستە، هەر

خۆیشی دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێك و هەموو كارێك و هەموو پێشهاتێكدا هەیە. هەر ئەو زاتە خۆی مردن و ژیانی دروست كردووە، لەناوچون و ژیانی بەدی هێناوە، تا تاقیان بكاتەوە و دەریبكەوێت كێتان كردەوەی چاكتر و پەسەندترە، نەك تەنها چاك و پەسەندە، (دیارە خوای گەورە دەیەوێت بەندەكانی پێشبڕكێ بكەن لە چاكە خوازیدا) دڵنیاش بن كە هەر خوای گەورە خۆی باڵادەستە (بەسەر یاخی و بێ باوەڕ و ستەمكاراندا) لە هەمان كاتدا تەواو لێبوردە و لێخۆشبووە لە باوەڕداران.

ئەو زاتە حەوت چین ئاسمانی دروست كردووە، (ژمارەی هەسارەكانی هەر چینێك لە ژمارە نایەن، لەنێو ملیۆنەها گەلە ئەستێرە و كاكێشاندا) بێگومان لەنێو دروستكراوەكانی خوای میهرەباندا هیچ كارێكی ناڕێكی و ناتەواویەك بەدی ناكەیت.. ئەی ئینسان تۆ هەر چاو بگێڕە و هەر تەماشا بكە و هەر سەرنج بدە ئایا هیچ كەم و كوڕی و ناتەواویەك بەدی دەكەیت؟! پاشان هەر سەرنج بدە و چاو بگێڕە و وورد ببەوە، جار لەدوای جار كۆڵ مەدە، تا سەرەنجام ملكەچ دەبیت و چاوت ماندوو دەبێت، كەچی هەر تێر نابیت لە سەرنج دان و تەماشاكردن هەتا بە تەواوی ماندوو دەبیت و پەكت دەكەوێت!! (تەفسیری ڕۆشن).

بەڵێ مرۆڤی ئیماندار كاتێ كە بەگوێی خالیقی خۆی دەكات و سەرنجی ئاسمانەكان دەدات و سەری بەرز دەكاتەوە و گەورەیی و

دەسەڵاتی خوا زیاتر دەبینیّ، ئەمجا ئاسودەیی ڕوو لە دڵی دەکات و یەقینی هەیە. ئەو خوایە بەو دەسەڵاتە بیّ سنورەی خۆیەوە. زۆر بەلایەوە ئاسانە کە ئەم پێداویستی و داواکاریەی منیش جێبەجیّ بکات. کە منداڵیش بە من ببەخشیّ، لەبەرئەوە نائومێد نابم لە ڕەحمی بیّ سنوری خوا، وەپاشان چۆن لەکاتی تەماشاکردنی ئاسمان و ئەستێرەکاندا هیچ کەم و کوڕی و کورتی نابینریّ و هەمووی لە شوێنی گونجاوی خۆیدایە و ئەگەر وانەبیّ ژیان نابیّ. دەبیّ هەر ئاوابیّ کە خالیقمان کە (الله)یە بڕیاری داوە و کەس ناتوانیّ لەوە جوانتر بنیات بنیّ. یان هەر بەبیریشیدا بێت! دەی نەبوونی منداڵ لای ئەم و بوونی چەند کوڕ و کچ لای ئەو، ئەوپەڕی کاربەجێیی خوای گەورەی تێدا بەدی دەکریّ و مرۆڤی ژیر و بە ئیمان ڕەخنە لە کاری خوا ناگریّ.



## بەڕێزان: با لە ئاسمانی یەکەمدا لە ڕووی زانستیەوە سەرنجێکی چینە هەواکانی سەرومان بدەین!

**چینی یەکەم:** چینی هەوای خوارەوەیە کە هەموو زیندەوەران تێیدا دەژین، لە مرۆڤ و باڵندە و هەموو زیندەوەران. ئەم چینە هەوایەش دووبارە پێکهاتووە لە چەند چینێك، کە لە گۆڕان

کاریدایە لە بارودۆخێکەوە بۆ بارودۆخێکی تر، وەلەجیٚ گۆڕکێدایە لە جێگایەکەوە بۆ جێگایەکی تر، لە حاڵەتی گەرمیەوە بۆ حاڵەتی ساردی، بۆ حاڵەتی تەم و مژ، بۆ هەور و باران، بۆ گەردەلولی بەهێز، لە شوێنیٚ پەستان بەرزە، لە شوێنیٚ پەستانی هەوا نزمە، هەر ئەم گۆڕانکاری و جێگا گۆڕکێیەیە کە بناغەی گۆڕانی کەش و هەوایە.. ئەم چینە هەوایەی خوارەوە بەرزیەکەی تێپەڕ ناکات لە (١٦) کیلۆمەتر..

**چینی دووەم:** ئەم چینە هەوایە، چەند وردیلەیەکی غازی گۆگردی تێدایە، کە خوای گەورە ئەم گەردیلە وردانەی کە غازی گۆگردیان تێدایە، کردویەتی بە هۆکاری پیتاندنی هەورەکان و ئاسان بوونی کرداری باران بارین، ئەگەر ئەم چینە گۆگردیە نەبوایە هیچ کات باران نەدەباری، ئەوکات ژیان لەسەر زەوی نەدەبوو..

هەر لەم چینی دووەمی هەوایەدا چینی ئۆزۆن هەیە:

کە بەرگێکە پێکهاتووە لەسیٚ گەرد ئۆکسجین، بۆیە ئۆزۆن ($O_3$) پیٚ دەوتریٚ کە ئەم چینی ئۆزۆنە کاری هەڵمژینی تیشکی سەروو وەنەوشەییە کە تیشکێکی بکوژ و لەناوبەرە چونکە لەناو خۆردا (ڕۆژدا) تیشکی سەرو وەنەوشەیی هەیە، کە دیٚ بەرەو زەوی، ئەم چینی ئۆزۆنە ئەم تیشکە لەناوبەرە هەڵدەمژیٚ و ڕێگەنادات ئەم تیشکە زیان بەخشە بێتە سەر زەوی و ئێمەی مرۆڤ و دروستکراوەکانی خوا ئازار بدات و لەناومان ببات.

بەڵام کاری خوا ئەوەندە جوانە، تەماشاکە ئەم چینی ئۆزۆنە بەشێکی یەکجار زۆر کەم لەو تیشکی سەرو وەنەوشەییە هەڵنامژێ و ڕێگەی دەدات تێبپەڕێ بۆ سەر زەوی! بۆچی؟! بۆ کوشتنی ئەو میکرۆب و ڤایرۆسە زیان بەخشانەی کە لە زیندەوەراندا هەن!! هەر بۆیە جار و بار خۆدانە بەر تیشکی خۆر و، لێدانی تیشکی خۆر لەناو ماڵ و حەوشەکەنمان سوودی زۆری هەیە و پاککەرەوەیە. بەڵام ئەم چینی ئۆزۆنە هەندێ جار و لە هەندێ جێگا خەلەلی تێ دەکەوێ. بەهۆی زۆری گەشتی ئاسمانی و مانگە دەستکردەکان و زۆری کارگە غازیەکان.. هەر بۆیە شێر پەنجە (سرطان)ی پێست لە هەندێ لەو وولاتە پێشکەوتوەکانی جیهاندا زۆرە، چونکە لەو ناوچانەدا چینی ئۆزۆن خەلەلی تێکەوتووە و نەیتوانیوە ئەو تیشکە لەناوبەرەی سەرو وەنەوشەیی هەڵبمژێ و گەشتۆتە سەر زەوی و مرۆڤی تووشی سەرەتانی پێست کردووە!!

چینی سێهەم: ئەم چینە لە هەوا هەروەکو کورەیەکی زۆر گەرمی پڕ لە ئاگر وایە. کە ئەگەر ئەم چینە لە هەوادا نەبوایە. ئەوا بەردەکانی کەون و ئەستێرە هەڵوەریوەکان لە گەردووندا کە هەمیشە بەرەو زەوی دێن، هەموو شتێکیان لەسەر زەوی لەناو دەبرد، بەڵام لە ڕەحمەتی خوایە بۆمان کە بەهۆی ئەم چینەوە هەواییە گەرمەی کەوەکو کورەی ئاگر وایە. هەرچی شتێ لە

نەیزەك و بەرد و ماددەكانی تر كەبەرەو زەوی دێن لەم چینەدا دەسوتێن و دەبنە خۆڵەمێش و هیچ زیانێ بە زەوی ناگەیەنن لێرە و لەوێ. لەماوەی چەند ساڵدا دەبیستین كە بەردێكی نەیزەكی لە ئاسمانەوە هاتووە و لە ڕوسیا و فلان وولات لەزەوی داوە، چەند هێكتار زەوی لەناوبردووە.. كەئەوەندە گەورە بووە! ئەم بەرگە هەوایە نەیتوانیوە بیسوتێنێ. دەی ئەگەر ڕەحمەت و پارێزگاری خوا نەبوایە بۆمان، هەمیشە و بەردەوام ئاوا بەردی گەورە و بچوكمان بەسەردا دەباری و ژیان نەدەبوو لەسەر ئەم زەویە ئارامە دەی لەخوا غافڵ مەبە و سوپاسی خوا بكە و بێ فەرمانی مەكە لەسەر زەویدا و بە كارەكان و بڕیارەكانی ڕازی و ملكەچ بە. چونكە خوا تۆی خۆشدەوێ.

**چینی چوارەم:** لەبەرگە هەوای دەوری زەوی بریتیە لە چینی (الأیونوسفیر). كەلەم چینەدا گەلێك گۆڕانكاری سەرسوڕهێنەر بەسەر گازی ئۆكسجین ($O_2$) و (نایترۆجین N)دا دێ و زاناكانی فیزیا لێی شارەزان و ئەوەندە دەڵێن: بەهۆی ئەم چینە هەوایەوە شەپۆلەكانی دەنگ و ڕەنگ دەگوازرێنەوە و ئەگەر ئەم چینە هەوایە نەبوایە، هیچ ڕادیۆ و تەلەفیزۆن و تەلەفون و مۆبایل و ئینتەرنێتێك بونی نەدەبوو.

**چینی پێنجەم:** ئەم چینە هەوایەش لەسەروی هەزار کیلۆمەتر تا (شەست و پێنج) هەزار کیلۆمەتر دەست پێدەکات. لەم چینەدا هەوا پلە بە پلە کەم دەبێتەوە تاوەکو نامێنێ. شایانی باسە، بەرگە هەوای دەوری زەوی لەسەر زەویەوە تا هەوا نامێنێ، نزیکەی (٦٥) هەزار کیلۆمەترە بە ئاراستەی سەرو لەسەر زەویەوە.. هەمووشی خوای پەروەردگار بۆ سوودی مرۆڤ ئاوا دروستی کردووە و هەر خەلەلێك لەمە ڕوویدات ژیان نامێنێ.

ساڵێکیان یەکێ لەو فڕۆکە نەفەر هەڵگرانەی حاجی هێنابوو بۆ حەج. پلەی هەوای لەدەرەوەی فڕۆکەکە تۆمار کردبوو کە (٥٠) پلە لەژێر سفرەوە بوو! ئەوەندە سارد بوو، پەنجا پلە ژێر بەستن!! هەر لەو ڕۆژانەدا پلەی گەرما لە مەککە و مەدینە لە سێبەردا (٥٥) پلە بوو لەگەرمیدا خەڵك خۆی نەدەگرت. دەی ئەگەر ئەم بەرگە هەوایە نەبێ، ئەو تەوژمە ساردە لەناوبەرە، ئەو بەرد و نەیزەکە کوشندە، ئەو تیشکی سەرو وەنەوشەییە لەناوبەرە، مەنع نەکات لەوەی بگاتە سەر زەوی کێ هەیە بمان پارێزێ؟! بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَجَعَلْنَا ٱلسَّمَآءَ سَقْفًا مَّحْفُوظًا ۖ وَهُمْ عَنْ ءَايَـٰتِهَا مُعْرِضُونَ ﴿٣٢﴾﴾ الأنبياء.

واتە: ئێمە ئاسمانمان وەکو سەقفێکی دامەزراو و مەحکەم بەڕاسەریانەوە ڕاگرتووە، کەچی زۆربەی ئەو خەڵکە بە شێوازێکی

سادە بۆی دەڕوانن و لەسەرنجدانی ئەو هەموو ئەستێرە و هەسارانە کەمتەرخەمن و بیر لە بەدی هێنەریان ناکەنەوە!! (آياتُ الله في الآفاق، د. محمد راتب نابلوسي ص٤١).



چەند پەیامێك بۆ ئەو کەسانەی کە منداڵیان نیە و ئەوانەش لەگەڵیان دەژین:

## پەیامی یەکەم: خەفەت مەخۆ

ئەی ئەو ژن و پیاوەی کە منداڵتان نەبووە، هیچ کات خەم مەخۆ بۆ ئەوەی کە بڵێی ئەگەر چوومە تەمەنەوە کەس نابێ بە خزمەتم بکات و هاوکارم بێ، دڵنیابە خوای میهرەبان قەرەبوت بۆ دەکاتەوە، بەمەرجێ ڕازی بی بەبەشی خوا و حەسود نەبی بەرامبەر منداڵی خەڵکی، خوای گەورە لە دنیادا موحتاجی دەستی ناکەس و نامەردت ناکات. پێویستیەکانت دەکەونە لای کەسانی خواناس و بە حورمەت.. وە هەروەها خۆشەویستت دەکات لەلای خەڵکی و هەموویان وەکو باوکیان ڕێزت لێدەگرن، خوای گەورە گەنج و لاوانت بۆ نەرم دەکا و خۆشەویستت دەکات لە دڵیاندا و هەموویان لە ئاستدا دەست لەسەر سنگ دەوەستن و لە خزمەتتا دەبن..

## پەیامی دووەم: یەکتری تاوانبار مەکەن

ئەی ئەو پیاوەی کە دەزانی ژنەکەت هۆکاری منداڵ نەبوونە، لە ڕێگەی پشکنینی پزیشکیەوە ئەمەت بۆ دەرکەوتووە، لە خوا غافڵ مەبە و ڕووی مەشکێنە و تاوانباری مەکە و دڵی ڕابگرە، چونکە سروشتی ئافرەت وایە. خوای گەورە وای دروست کردووە کە هەر لە منداڵیەوە کە کچێکی بچکۆلانەیە ئاواتی ئەوەیە ببێ بە دایك، نابینی کچۆڵەیەکی دوو سێ ساڵ حەزی لە بوکە شوشە و بێشکە و کەلوپەلی منداڵ و شیردان بە منداڵە.

وەرە تاقیبکەرەوە، سەیارەیەکی منداڵانە و کەرەستەی خانوو تۆپ و چەکی منداڵان لەگەڵ بوونی بوك و بێشکە ومەمکەی وپەڕۆی منداڵان بخەرە بخەرە بەردەستی کچێکی دوو سێ ساڵ، بزانە یەکسەر بوکە کە و بێشکەکە هەڵدەگرێ، بۆیە ئەم ئاواتەی کچ لەگەڵیا گەورە دەبێ و هەر کە شووی کرد ئاواتی یەکەمی ئەوە دەبێ کە ببێ بە دایك..

کە پاش ماوەیەك منداڵی لە ئامێزی خۆیدا نەبینی و منداڵی نەبوو، دنیای لێ دێتەوە یەك.. ئەی پیاو، ئەی هاوسەری ئەو ژنەی ئاگاداری بەو ڕێزی لێبگرە و لەگەڵ ئەوەدا کە هاوسەر و هاوژینی بۆی، دەوری منداڵیشی بۆ ببینە. لەم کاتەدا وەفاداربە بۆ ژنەکەت و بەهەڵوێست بە و بیر لە ژنی تر مەکەوە، قسەی وای لە ڕوو مەکە کە ناخی ئازار بخوات. ئایا منداڵبوون بەدەستی خۆیەتی؟!

ئەی بۆچی بیر ناکەیتەوە ئەگەر هۆکاری منداڵ نەبونەکە تۆ بویتایە ئایا چیت دەکرد؟!

تو خوا ژنەکەت بیری لە جیابوونەوە دەکردەوە بۆ ئەوەی شوویەکی تر بکات و ئاواتی دایکایەتی بێتە دی، کە مافی ڕەوای خۆیەتی؟! بە دڵنیاییەوە نەخێر، بەدەیان ژنی بە حورمەت و خاوەن هەڵوێست هەیە، چەندین ساڵە چاوەڕێیە. پرچی سپی هۆنیەوە بە ئاواتی منداڵێکەوەیە. کە منداڵ نەبوونەکە هۆکاری پیاوەکەیەتی، مەردانە ئارامی گرتووە، بەڵام بەداخەوە، کەم نین ئەو پیاوانەی هەر کەزانیان ژنەکەیان هۆکاری منداڵ نەبوونە، خێرا بە فرسەتی دەزانن بۆ هێنانی ژنی دووەم!!

ئەمە ئەگەر لە ڕواڵەتدا ڕێگە پێدراو بێ. بەڵام بێ عەزیمەتی و بێ وەفایی پیاو دەنوێنێ بەرامبەر ژنەکەی.. خۆ ژیانی هاوسەری تەنها و تەنها ئامانج لێی بوونی منداڵ نیە، ئەگەر منداڵ نەبوو باشتر، فەزڵی خوایە.. ئەگەر نەبوو حیکمەتی خوایی یە و گرنگ ئەوەیە ئەم ژن و مێردە سوکنا و ئاسودەیی بن بۆ یەکتری و ڕۆڵی منداڵیش ببینن بۆ یەکتری.

بەسەرهاتێك: مامۆستایەك دەفەرمووێ: برادەرێکم بۆی گێڕامەوە کە پوری ناوی (سارا)یە، شووی کردبوو بە پیاوێك منداڵی نەدەبوو، کابرا هەژار بوو، وردە وردە دەوڵەمەند بوو، کابرا ژنێکی

تری هێنا و منداڵی نەبوو، دووەمی تەڵاقدا و وتی: ژنی تر دێنم، پێیان وت: باشە فەحصێکی خۆت بکە کێ دەڵێ خەتاکە لە خۆتەوە نیە؟!

فەحصی نەکرد و وتی: مەکینەیەکی بەرگ دورینت بۆ دەکڕم خۆت بژیەنە و ئەم ژنە کۆنەشی تەڵاقدا، ساراخان زۆر بێتاقەت بوو، زۆر دەگریا، دیارە خوا ستەم لەکەس قبوڵ ناکات. پیاوەکە دوو ژنی تری هێنا و هەر منداڵی نەبوو..

لەم لاشەوە سارەخان خەوی بینی، لە خەویا لە جۆگەیەك دەپەڕیەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی گرت و گوڵێکی جوانیشی دایە، لە خەوەکەدا بە خەڵکی دەگوت: ئەها گوڵەکەی من چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی داوم لە گوڵەکانی ئێوە جوانتر و گەشترە، بە قەدەری خوا ئەم ئافرەتە شووی کردەوە بە پیاوێکی باش و ئێستا دوو منداڵیشی هەیە. بۆیە پێویستە بەڕاستی بڕوادار بێهیوا نەبێ و هەمیشە لەیادی بێ کە ئەم دنیایە بێ خاوەن نیە. هیچ کات لە خوا غافڵ مەبە.. (زەردەخەنەی هیوا، ئەندازیار عثمان ل١١).

## پەیامی سێهەم: ئەوانەی منداڵیان نیە بێزاریان مەکەن

ئەی کۆمەڵگا ئەی خزم و کەس و کار و دۆست و هاوپیشە و هاوڕێ و هاودەم، دڵی ئەو ژن و مێردانە ئازار مەدەن کە منداڵیان نابێ، بەتایبەت خەسوو خەزوری کوڕ و کچ. ئەوەندە پرسیاری

ئەوەیان لێ مەکەن: (ئەوە هیچتان نەبوو؟! ئەوە هیچتان بەیەکەوە نەناوە؟! ئەوە تاکەی هیچتان دیار نیە؟!). بەڕاستی هەر کەس ئەم پرسیارە بکات نیشانەی گێلی و گەمژەیی و نەزانی خۆی دەردەخات. لەبەرئەوەی وادەزانێ کە ژن و پیاو خۆیان وەکو کارگە منداڵ دروست دەکەن!!

بەڕێزم ئەمە جگە لە خوای دروستکەر (خالق) کەسی تر نیە توانای هەبێ بەرامبەری، ئیتر بۆچی پرسیاری نابەجێ دەکەیت؟!

ئەی دراوسێ و خزم و برادەرانی، کەچوونە سەردانی ئەو ماڵانەی کە منداڵیان نیە، یان ئەوان بوونە ڕەفیقی سەفەر و میوانی ماڵتان، ئاگادارین:

لەبەرچاوی ئەوان منداڵەکەتان ماچ مەکەن، باسی منداڵەکەت مەکە کەچۆن بووە و چی دەکا و لەکوێ دەخوێنێ..

پێیان مەڵێ خۆزگە ئێوەش منداڵێکی ئاوا جوانتان دەبوو! بەخوا خەمی ئێوەمە، منداڵ نەبوون زۆر ناخۆشە!!

مەڵێ زۆرم دوعا بۆ کردوون منداڵتان ببێ.. نەخێر هەر باسی منداڵ مەکە، مەجلیس و دانیشتنەکە مەکە بەو بابەتە، دوورنیە کە تۆ ئاوا دڵی دەشکێنی، خوای باڵادەست عیتابت لێ بگرێ و تۆ منداڵەکانت لەدەست بدەی و ئەو بکاتە خاوەن منداڵ.

## بەلوت بەرزی.. ژیانی تێك چوو [بەسەرهات]

زانای بانگخواز و ناسرا و ناودار، دکتۆر محمد راتب نابلوسی دەفەرمووێ: ژن و پیاوێك دوای چەند ساڵ لە پێکهێنانی ژیانی هاوسەری، منداڵیان نەبوو، بەڵام ژن و مێردێکی زۆر بەختەوەر بوون بەیەکەوە، ئەم ژنە زۆر صاڵحە و لەخواترس بوو، زۆر مێردەکەی خۆی خۆشدەویست.. هەرچەندە مێردەکەی هیچ کات باسی منداڵ نەبوونی نەدەکرد. چونکە لە پشکنیندا سەلمابوو کە ئەم ژنە منداڵی نابێ، پیاوەکەی زۆر هەستی ژنەکەی ڕادەگرت و برینداری نەدەکرد.

ژنەکەش دەیزانی پیاوەکەی وەکو هەر پیاوێك حەزدەکات گوێی لە وشەی باوکە گیان بێ کە منداڵەکەی پێی بڵێ، بەڵام لەبەر خاتری ئەو، ئەم داخوازی دڵەی شاردۆتەوە، بۆیە خۆی داوای لە مێردەکەی کرد کە ژنی دووەم بێنێ و بە ئومێدی خوا منداڵیان ببێ بۆ ئەمیش مایەی چاوڕۆشنی بێ و ئاوەدانیماڵیان بێ!

پیاوەکە چەند جارێك ئەم داوایەی ژنەکەی ڕەتکردەوە، بەڵام ژنەکەی هەر سور بوو لەسەر پێشنیارەکەی و سەرەنجام بەڕاوێژی هەردووکیان پیاوەکە ژنی دووەمی هێنا و دوای ساڵێ حامیلە بوو بە منداڵێك. هەر کەزانی دووگیانە ئەمجا زیاتر چاودێری دەکرا، ژنە خۆی لێ گۆڕا و وەکو جاران حورمەتی ژنی یەکەمی هاوسەرەکەی نەدەگرت. کە منداڵی یەکەمی بوو، پاش ساڵێ دووگیان بۆوە و

منداڵی دووەمیشی بوو، ئەمجا بە تەواوی دژایەتی هەوێکەی (ژنی یەکەمی) دەکرد، هەرچەندە ئەو وەکو کچی خۆی هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکرد و بۆ خۆی و منداڵەکانی زۆر دڵسۆز بوو، وەکو منداڵی خۆی ئاگاداری دەکردن و خزمەتی دەکردن.

پاشان ئەم ژنی دووەمە کە حامیلە بوو بە منداڵی سێهەم. ئەمجا بە تەواوی ژنی یەکەمی وەکو کۆیلە سەیر دەکرد. فەرمانی بەسەردا دەکرد و بە خزمەتکاری ماڵ تەماشای دەکرد، ڕۆژێکیان ژنە گەورەکە ئازار گەیشتە ئێسقانی و وتی: کچم خوا هەڵناگرێ ئاوام لێدەکەی، من چ خراپەیەکم بۆتۆ هەیە؟!

ژنی دووەم لێی هاتە دەنگ و وتی: قسە مەکە هەی وەجاخ کوێر، تۆ هەر بۆ خزمەتکاری دروست بووی، ئەگەر هیچ بویتایە خوا منداڵی دەدایتێ. نابینی من دوو منداڵم لە باوەشە و یەکیشم لە سکایە. چۆن خۆت دەهێنیتە ئاستی من؟! ژنی یەکەم بە بیستنی ئەم قسە جەرگ بڕانە زمانی گیرا و چوە ژوورەکەی خۆی و زۆر گریا و داوای لە خوا کرد کە بێ بە هانا و هاواریەوە و لە دەستی ئەم ژنە خوانەناسە لە خۆباییە ڕزگاری بکات!..

بەڵێ ئەم گەردونە (الله) بەڕێوەی دەبات. لەکەس غافڵ نیە و هەرکەس لەخوا غافڵە کافرە.. ژنەی دووگیان بە منداڵی سێهەم لە لەشی ساغەوە تووشی نەخۆشیەکی کوت و پڕهات و منداڵەکەی

لەبارچوو!! دوو منداڵەکەشی لە دوو ڕووداوی دڵتەزێنی جیادا بەماوەیەکی کەم مردن! پاکی و بێگەردی بۆ خوا.

ئەم ژنەی یەکەم، کە چەند ساڵی زۆر بوو منداڵی نەبوو، دووگیانی دەرکەوت و لەسەریەك لەماوەی چەند ساڵێکدا (پێنج) کوڕی بوو!! بەڵام لە خوا غافڵ نەبوو.. ئەمەی بە ئازایەتی و نیشانەی بەڕێزی خۆی نەدەزانی و بەلوتف و کەرەمی خوای دەزانی و هەمیشە بە ژنی دووەمی دەگوت:

ئەم منداڵانە هی تۆشن و فەرقمان نیە و ئامۆژگاری منداڵەکانی دەکرد کە بە دایە گیان بانگی ئەویش بکەن!.



## پەیامی چوارەم: هەرگیز نائومێدمەبن

ئەی ئەو ژن و مێردانەی کە تائێستا منداڵتان نەبووە، هەرگیزا و هەرگیز نائومێد مەبن لە ڕەحمی خوا بۆ بەخشینی منداڵ.. لەبەرئەوەی گەش بینی بۆ ژن و مێرد لە بابەتی منداڵ نەبوندا زۆر گرنگە.

لە زانستی کۆرپەلەناسیدا دەڵێ: هەر کات ژن و مێرد بەقەلەقی و پاڕایی و دوو دڵیەوە جوت بوون، ڕەش بین بوون لەبەرامبەر ئەوەی لەو جوت بوونەدا منداڵیان دروست ببێ ئەوە منداڵ دروست

نابیّ، چونکه مێشك پەیام دەدات بەتۆوە ڕژێنی پیاو و هێلکەدانی ئافرەت کە ئەو مرۆڤە بەتەمانیە منداڵی ببیّ و گەشبین نیە، بۆیە پیتاندن ڕوونادات و منداڵ دروست نابیّ.

تۆ سەرنج بدەن هەموو ئەو هاوسەرانەی کە منداڵی زۆریان هەیە و خۆیان مەنع دەکەن لە منداڵ بوون، چونکە ترسی دووگیان بوونیان هەیە، زۆربەی کات سەرەڕای بەرگری لە منداڵ بوون منداڵەکە هەر دروست دەبیّ!! لەبەرئەوە ترس و قەلەقیتان لاببەن و یەقین و دڵنیایتان هەبیّ کەخوای گەورە وەڵامی دوعا و نزاکانتان دەداتەوە و منداڵتان پیّ دەبەخشیّ.

## بپاڕێنەوە لەخودا بۆمنداڵ بون..

دوو نمونەی قورئانی:

یەکەم: ئیبراهیم: خوای گەورە باس و بەسەرهاتی باوکی پێغەمبەران گەورەمان (ئیبراهیم) و (سارە خاتوون)ی هاوسەری دەگێڕێتەوە بۆمان، کە دوای تەمەنێکی زۆر و پیربوون هەر دوعایان دەکرد و لەخوا دەپاڕانەوە، کە خوای گەورە منداڵی صالحیان پیّ ببەخشیّ.. خوای گەورەش لەو تەمەنە زۆرەدا کە بەبۆچونی مرۆڤ کاتی منداڵ بوون بەسەچووە، منداڵیان پیّ دەبەخشیّ، وەکو دەفەرموویّ:

ڕۆژێك لە ڕۆژان دەستەیەك لە فریشتەكان بە فەرمانی خوا سەردانی ماڵی ئیبراهیم پێغەمبەریان كرد، سەلامیان لێكرد و ئەویش فەرمووی: سلاوی خوا لە ئێوەش..

دوای پێشوازی گەرم و بەخێرهێنانیان (كە نەیزانی ئەوانە فریشتەن، وایزانی هەر مرۆڤن و بە میوانی هاتوونەتە ماڵی، كەواتە: غەیری خوا، تەنانەت پێغەمبەرانیش غەیب نازانن، ئیتر چۆن فالچی و دەستبڕ دەڵێن بۆیە منداڵت نابێ چونكە ئاوی گەرمت بە جنۆكەدا كردووە!! ئەوەتا ئیبراهیم، ئەو پێغەمبەرە گەورەیە نەیزانی ئەوانە فریشتەن و مرۆڤ نین، وە نەیزانی نیەتیان چیە و بۆ كوێ دەچن!).

ئیبراهیم چووە لای خێزانەكەی و هەر خێرا خواردنیان ئامادەكرد و زۆری پێنەچوو گەڕایەوە لایان بە سینیەك گۆشتی گوێرەكەی برژاوەوە. لە بەردەمیاندا داینا و فەرمووی لێكردن بەلام ئەوان دەستیان بۆ نەبرد!! كاتێك ئیبراهیم بینی دەستی بۆ نابەن گومانی لێ كردن و لە دڵی خۆیدا ترسا، بۆیە ئەوانیش یەكسەر وتیان: مەترسە، ئێمە فریشتەین بۆیە نان ناخۆین، وەلەلایەن خوای بالادەستەوە نێردراوین بۆسەر قەومی (لوط).

ئەمجا فریشەكان موژدەیان دا بە ئیبراهیم كە بەم نزیكانە و لەو تەمەنەدا خوای گەورە كوڕێكی نایابیان پێ دەبەخشێت، بۆیە كاتێك هاوسەرەكەی (سارە خاتوون) گوێی لەو موژدەیە بوو، لەخۆشیدا پێكەنی، خوای گەورەش دەفەرمووێ: ئێمە لە ڕێگەی

فریشتەکانمانەوە مژدەمان پێدا کە ئیسحاقت پێدەبەخشین و لەنەوەکانیشی یەعقوب دێتە دنیاوە!! پاشان سارە خاتوون وتی: وەی لە من، شەرمەزار خۆم، چۆن منداڵم دەبێت، خۆ من پیرەژنێکم و ئەوەش ئیبراهیمی هاوسەرمە کە پیرەمێردێکی بەساڵاچووە. بەڕاستی ئەمە شتێکی سەیرە!! فریشتەکان وتیان: باشە تۆ چۆن سەرسام دەبیت لە فەرمان و ویست و کاری خوای گەورە، ئێوە ڕەحمەت و فەڕ و بەرەکەتی خوای گەورە هەمیشە لەسەرتانە..

بابچینە خزمەت ئایەتەکان و چاو و دڵمانی پێ ڕوونبکەینەوە: ﴿وَٱمۡرَأَتُهُۥ قَآئِمَةٞ فَضَحِكَتۡ فَبَشَّرۡنَٰهَا بِإِسۡحَٰقَ وَمِن وَرَآءِ إِسۡحَٰقَ يَعۡقُوبَ ﴿٧١﴾ قَالَتۡ يَٰوَيۡلَتَىٰٓ ءَأَلِدُ وَأَنَا۠ عَجُوزٞ وَهَٰذَا بَعۡلِي شَيۡخًاۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٌ عَجِيبٞ ﴿٧٢﴾ قَالُوٓاْ أَتَعۡجَبِينَ مِنۡ أَمۡرِ ٱللَّهِۖ رَحۡمَتُ ٱللَّهِ وَبَرَكَٰتُهُۥ عَلَيۡكُمۡ أَهۡلَ ٱلۡبَيۡتِۚ إِنَّهُۥ حَمِيدٞ مَّجِيدٞ ﴿٧٣﴾﴾ هود. (تەفسیری ڕۆشن، بورهان محمد أمین ل٣٣٥).

هەر لە قورئاندا خوای گەورە باسی ئیبراهیم پێغەمبەرمان بۆ دەکات، کە کاتێ کۆچی کرد و چوو بۆ وڵاتی (میصر) لەوێ بوو بە هاوسەری (هاجەرە خاتوون)، ئالەوێشدا، لەو تەمەنە پیریەدا

لەخوای گەورە پاڕایەوە و فەرمووی: ﴿رَبِّ هَبۡ لِي مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ۝١٠٠﴾ الصّافات.

واتە: پەروەردگارا نەوەیەکی چاك و پاك و خواناسم پێ ببەخشە (ئەی ئیماندار تۆش ئاوا بە یەقینەوە لەخوای خۆت داوا بکە، مەڵێ زەحمەتە منداڵم ببێ، بزانە تۆ لەخوایەك داوا دەکەیت کە مەحاڵی لەلانیە. وەکو حەزرەتی ئیبراهیم داوای ئەولادی چاك لەخوا بکە).

﴿فَبَشَّرۡنَٰهُ بِغُلَٰمٍ حَلِيمٍ ۝١٠١﴾ الصّافات واتە: ئێمەش موژدەمان دایە بەوەی کە کوڕێکی ژیر و خاوەن حیلم و حەوسەڵەی پێ دەبەخشین..

دووەم: زەکەریا: پێغەمبەری بەڕێز و گەورە، زەکەریا پێغەمبەر ـ سەلامی خوای لەسەربێ. داوای بەخشینی منداڵ دەکات لەخوای گەورە، بەڵێ منداڵ ئەوەندە شیرینە، پێغەمبەران داوایان لە خوا کردووە لەو خەڵاتە گەورە بێ بەشیان نەکات. زەکەریا فەرمووی: ﴿وَزَكَرِيَّآ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥ رَبِّ لَا تَذَرۡنِي فَرۡدٗا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡوَٰرِثِينَ ۝٨٩ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَوَهَبۡنَا لَهُۥ يَحۡيَىٰ وَأَصۡلَحۡنَا لَهُۥ زَوۡجَهُۥٓۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ وَيَدۡعُونَنَا رَغَبٗا وَرَهَبٗاۖ وَكَانُواْ لَنَا خَٰشِعِينَ ۝٩٠﴾ الأنبياء.

واتە: زەکەریاش هانا و هاواری بۆ پەروەردگاری برد و وتی: پەروەردگارا داواکارم کە بەتەنها نەمهێڵیتەوە هەرچەندەی زاتی تۆ چاکترین واریسە بۆ من (ئەگەر منیش نەمام هەرچی کاروبار و خەمم هەیە تۆ بۆم ئەنجام دەدەیت و جێبەجێی دەکەیت)

خوای گەورەش دەفەرمووێت: ئێمە نزاو پاڕانەوەی ئەویشمان گیراکرد و یەحیامان پێ بەخشی و هاوسەرەکەیمان لە هەموو ڕوویەکەوە بۆ چاك و باش کرد، لەڕاستیدا ئەوانە زۆر بەپەلە و تاڵوکە بوون بۆ ئەنجامدانی هەموو خێر و چاکەیەك، بەردەوامیش دوعا و نزایان دەکرد بە ئومێدی بەدەست هێنانی خێر و بەهەشت، وە دوورە پەرێزی لە شەڕ و دۆزەخ. هەمیشە و بەردەوام ملکەچی و فەرمانبەرداری و هەستکردن بە شکۆمەندی ئێمە و سۆز و خۆشەویستی بۆ ئێمە لە ناخیاندا دەدرەوشایەوە. (تەفسیری ڕۆشن).

<u>**وانەیەکی گرنگ:**</u> ئەو کەسانەی کە تامەزرۆی منداڵن دەبێ چاو لە پێغەمبەران بکەن. ئەوەتا (ئیبراهیم و زەکەریا) تەنها لە خوا پاڕانەوە.. چونکە بەخشینی منداڵ جگە لە (اللە) دەسەڵاتی هیچ کەسێکی تری تێدانیە. لەبەرئەوە تۆش تەنها داوا لە خوا بکە و لەخوا غافڵ مەبە، نەکەی بچی بۆلای قەبر و گۆڕ (باهی پیاوباشان و ئەولیا و صالحان)یش بێ، یان لە دەوری گۆڕێکدا

بسوڕێیتەوە و داوای منداڵ بکەی. پەنابەخوا ئەمە شیرکە و مرۆڤی ئیماندار پێی لە ئیسلامەتی دەچێتەدەر، وەرە تەنها و تەنها لە (الله) داوابکە وەکو زەکەریا و خێزانەکەی کاروکردەوەی چاك ئەنجام بدە.. ملکەچی فەرمانەکانی شەرع بە. بە ویستی خوا تۆش منداڵی جوان و صاڵح لە ئامێز دەگریت.



## دوای ١١ ساڵ منداڵیان بوو! 〈بەسەرهات〉

ئەم بەسەرهاتە تازە ڕوویداوە و ئەو کەسەی کە بۆی گێڕامەوە و بۆشی نوسیم دانیشتوی شارۆچکەی پیرەمەگرونە و کەسێکی ـ خوا خۆی بەندە ناسە ـ دیندار و ڕاستگۆیە وماڵەکە لە نزیکەوە دەناسێ و ئەمەش بەسەرهاتەکەیە:

ژن و پیاوێك دوای (یانزە) ساڵ لە هاوسەرگیریان، چەندین جار سەردانی دکتۆری پسپۆڕیان کردووە بۆ ئەوەی هۆکاری منداڵ نەبوونیان بزانن، کە هەمیشە چاوەڕێی لەدایك بوونی کۆرپەیەکی نازدارن. بەڵام تەواوی دکتۆر و ئەنجامی پشکنینەکان هەر ئەوەیان پێ وتوون کە ئێوە کێشەیەکتان نیە بۆ منداڵ بوون لە ڕووی پزیشکیەوە پاشان منداڵ بوون هەر بەدەست خوایە. بەڵام ئەم ژن و مێردە تامەزرۆیە بۆ منداڵ، ئیتر پەتی صەبریان دەپچڕێ و داوا دەکەن لە خزم و کەس و کار و ناسیا و هاورێ.. کەئەگەر شکیان

برد منداڵێکیان هەیە و دایك و باوکی بۆیان بەخێوناکرێ. ئەمان دەیکەن بە منداڵی خۆیان و بەخێوی دەکەن.

بەڵێ دوای ئەمە ڕۆژێکیان خزمێکیان هەواڵی ئەوەیان دەداتێ کە ماڵێك هەیە، دوای چەند ڕۆژی تر منداڵیان دەبێ و بە هۆکارێك بڕیاریان داوە کە منداڵەکەیان بدەن بە کەسێك و بۆخۆیان ناتوانن بەخێوی بکەن. ئەم ژن و مێردە زۆر زۆر شادمان بوون.

بەلاّم دوای ئەوەی لێیان کۆڵیەوە کە منداڵەکە هی کێیە و بۆچی بەخێوی ناکەن، بۆیان دەرکەوت کە ئەم منداڵە پێش ئەوەی ئەم ژن و مێردە (باوك و دایکی منداڵەکە) زەواج بکەن دروست بووە!! بۆیە بڕیاریان دا ئەگەر چەند ساڵی تریش بێ منداڵ بن لە خۆی نەگرن. بەلاّم باوکی منداڵەکە هاتە لایان و بەسەرهاتی لەدایکبوونی ئەم منداڵە و هۆکاری ئەوەی ناتوانن خۆیان بەخێوی بکەن، بۆئەم ژن و مێردەی بەم شێوەیە ڕوونکردەوە: ئەو منداڵەی دوای چەند ڕۆژێکی تر ئەبێ ناشەرعی نیە و لە زینا و حەرام دروست نەبووە، بەڵکو لە فەترەی دەزگیرانی دوای مارەکردنی دایکی منداڵەکە، چومەتەلای و بەیەکەوە دروست بووین ـ ئەمە هەرچەندە لەڕووی شەریعەتی ئیسلامەوە ڕەوایە و حەلاّڵی خۆیەتی ـ بەلاّم لەڕووی کۆمەڵگای کوردەواریەوە ناشرینە.

ئێستاش (شەش) مانگە من هاوسەرم گواستۆتەوە و ئێستا منداڵمان ببێ ناتوانین دەمی ئەو خەڵکە بگرین و ڕەنگە بەهۆی

ناحاڵی بوون لە دینی پاکی ئیسلام لەم بارەوە، تووشی ناخۆشی و گرفتی بنەماڵەییش ببن. بۆیە ئەگەر ئێوەی بەڕێز و خاوەن حورمەت و پێویست بە منداڵ ئەم منداڵە هەڵبگرنەوە، هەم ئێمە ڕزگار دەکەن لەم ناڕەحەتی و کێشەیە، هەم ئێوەش دەبنە خاوەن منداڵ. ئێمەش دڵمان ئارام دەگرێ و کە منداڵەکەمان لەلای کەسێکی دیندار و خواناس و بەڕەوشت بێ.

بەڵێ ئەم ژن و مێردە کە ئەم ڕاستیەیان زانی و زانیان کە ئەم ژن و مێردە ناتوانن منداڵەکەیان لای خۆیان بهێڵنەوە و هەر دەبێ لەخۆیانی دووربخەنەوە. منداڵەکەیان قبوڵ کرد و هێنایانە ماڵی خۆیان و ناسنامەیان لەسەر خۆیان بۆ دەرکرد..

بەڵام ئەم خۆشیەیان بوو بە دوو خۆشی کاتێ دوای ماوەیەکی کەم، چەند مانگ تێنپەڕی بوو. کە هاوسەری ئەم پیاوە. کە (یانزە) ساڵ بوو هاوسەرگیریان کردبوو، منداڵیان نەبوو بوو. هەستی کرد نیشانەی دووگیانی پێوە دیارە و دوای پشکنین دەرکەوت بەڵێ حامیلەیە ! ! بەڵێ منداڵی خۆشی لەدایك بوو، ئەمجا شیریشی دا بە منداڵەکەی کە هەڵیان گرتبۆوە و ئەمیش بوو بە منداڵی شیری خۆیان و گرفتی پاشەڕۆژی ئەویشیان نەما...

بەڵێ هیچ کات لەخوا غافڵ مەبە و چاکەکاربە و ڕوو لەخوا بە و دڵنیابە بۆ خوای گەورە زۆر ئاسانە منداڵت پێ ببەخشێ.

## پەیامی پێنجەم: سود لەزانستی نوێ وەربگرن

ئەی ئەو ژن و مێردانەی کە منداڵتان نیە، دەتوانن سود لە زانستی پزیشکی پێشکەوتووی ئەمڕۆ وەربگرن، لە ڕێگەی (منداڵی بلوری)یەوە ببنە خاوەنی منداڵ بە ویستی خوا، کە ئەم زانستە ناشەرعی نیە. بە مەرجێ منداڵەکە لەتۆوی پیاوەکە خۆی و هێلکەی خێزانەکەی خۆی بێ و سپێرم و هێلکەی ژن و پیاوێکی تری تێکەڵ نەکرێ (وەپێویستە ئەو سەنتەرانەی کە کاری منداڵی بلوری دەکەن، لەخوا غافڵ نەبن، کارەکەیان تەنها پارە پەیداکردن نەبێ و بەپێی ڕێنمایی شەریعەتی ئیسلامی کاربکەن و ئەگەر زانیان بەپێی زانست ژن و پیاوێك منداڵیان بەم ڕێگەیەش نابێ، دەستیان نەبڕن و پارەیان لێوەرنەگرن! ).

بەڵێ ئەگەر ئەم ڕێگا زانستیەشت گرتەبەر و سەرکەوتنی بە دەست نەهێنا، دیسان نائومێد مەبە و دنیات لێ نەیەتەوەیەك. بەڵکو دیسان گەشبین بە و چەندە بە سەرکەوتنی ئەم هەواڵە زانستییە خۆشحاڵی، کە نەشبوو ئاوا گەش بینانە بیربکەوە کە ئەمە بۆ تۆ خێری تێدایە. چونکە دڵنیابە لەمەشدا خوای گەورە پاداشتی گەورەتان دەداتەوە.



**موسڵمانانی کورد زمان، ئاوا ڕازی بوون بەوەی خوا بڕیاری لێ داوە:** [بەسەرهات]

مامۆستای بەڕێز و بانگخواز (مامۆستا حەسەن پێنجوێنی) دەیگێڕێتەوە کە: لە گوندێکی پێنجوێن پیاوێك هەبووە منداڵیان نەبووە، زۆریش تامەزرۆ و ئاواتی منداڵێکیان بوو، بۆیە داوای لە مەلای گوندەکە کردووە دوعا بە دەورەی ڕۆژی هەینی بۆ بکەن، ئەوانیش بە کوڵ و بە دڵ داوای بۆ لەخوا دەکەن، لەپاش ماوەیەك منداڵێکیان دەبێت. دوای ماوەیەك منداڵەکە خشتیلە دەبێت و ڕۆژێکیان مامۆستا دەچێت بۆ مزگەوت قەرەباڵغی دەبێت، دەپرسێت..

دەڵێن: منداڵە تاقانەکەی فلان کەس مردووە، دەڵێ زۆرم خەفەت خوارد، وتم: ئای چەندە ئاواتی منداڵێك بوو، بەو پیریە و لەو تەمەنەدا، ئێستا دەبێت حاڵی چۆن بێت؟!

لەم قسانەدا بوو، مام (...) هات. جل و بەرگێکی تازە و جوانی لەبەر کردبوو، خۆی گۆڕی بوو، قۆز و کەشخە بوو!

وتم: لەوانەیە منداڵەکەی ئەو نەبێت. بەهەڵە وایان وتووە، بەڵام کە هات وتی: مامۆستا دەزانی منداڵە تاقانەکەم مرد؟!

بەبێ ئەوەی بگری، وتم: خودا پاداشتت بداتەوە، وتی: ئەزانی بۆچی خۆم گۆڕیوە؟!

ئەو ڕۆژەی لەدایك بوو جل و بەرگێکی زۆر جوانم لەبەرکردبوو، چونکە زۆر دڵخۆشبووم و سوپاسی خوام کرد.. ئەمڕۆش کە مرد بۆیە وامکردووە تا نەبێتە ناشکوری!

(پایزە برا، مەلا ئەحمەدی شەریعە ب١ ل٢١).



## پەیامێك بۆ ئەوانەی کە منداڵیان دروست دەبێ، بەڵام لەباریان دەچێ:

هەندێك ئافرەت هەیە دووگیان دەبێ، بەڵام پاش ماوەیەك منداڵەکەی لەباردەچێ و ئیتر نابێتە خاوەن منداڵ. هەیە چەندین منداڵی لەبارچووە، ئەم کەسانەش پاداشتی گەورەیان لەلای خودا هەیە. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: **(وَالَّذي نَفْسي بِيَدِهِ، إنَّ السقطَ لَيَجُرُّ أُمَّهُ بسِررهِ إلى الجَنَّةِ إذا احْتَسَبَهُ)**. حَديثٌ حَسَنٌ، رَواهُ إبْنُ ماجَة: (١٦٠٩) و حَسَّنَهُ الألْباني في صَحيح الجامع: (٧٠٦٤).

واتە: سوێند بەو خوایەی کە گیانی منی بەدەستە، منداڵی لەبارچوو بەپەتی ناوکی دایکی ڕادەکێشێ بەرەو بەهەشت. ئەگەر ئەو دایکە ئارامگر و خۆڕاگر بێ و ڕازی بێ بەبەشی خوا و ناشکوری دەرنەبڕێ.

سەرنجێك: ئەم ئافرەتانەش کە منداڵیان بۆ ناوەستێ و لەباریان دەچێ، دەتوانن سەردانی پزیشکی پسپۆڕی بواری ژنان و

منداڵبوون بکەن و چارەسەر وەربگرن و لە ڕێگەی شەرعەوە کارێکی باش و پێویستە. نابێ بڵێین خوا چی بڕیارداوە هەر ئەوەیە و ڕازین بە قەدەری خوا. چونکە ئەم قسەیە ئەگەری چی لە ڕواڵەتدا ڕاستە، بەڵام پێویستی بەشی کردنەوە هەیە بەم شێوەیە: (بڕوادار بڕوای هەیە بە قەزا و قەدەر ـ خَيْرِهِ وَ شَرِّهِ ـ نەخۆشی ئەگەر قەدەرێکی شەڕیش بێت، ئەبێ دەسەوەسان نەبێ بەرامبەری و هەوڵبدا بیگۆڕێت بەهۆی قەدەرێکی خێرەوە، کەداو و دەرمان و چارەسەر کردنە..

شێخ عبدالقادری گەیلانی دەفەرمووێت: زۆر لە خەڵکی کە دەگەنە قەزا و قەدەر دەوەستن، بەڵام من پەنجەرەیەکی بچوکم بۆ کرایەوە و لێیەوە سەیری مەسەلەکەم کرد:

(فَنازَعْتُ أَقْدارَ الحَقِّ بالْحَقِّ لِلْحَقِّ). واتە: ڕووبەڕووی ئەقداری حەق بوومەوە بە هەق و لەبەر هەق. واتە: هەرچیمان توش دەبێ هەقە و لەخواوەیە و تاقیکردنەوەیە. بە قەدەرێکی هەقی تر و ڕووبەڕووی دەبینەوە و هەوڵی چارەسەر کردنی دەدەین، ئەمەش لەبەرئەو خوایە دەیکەین کە هەقە).

(زەردەخەنەی هیوا، ئەندازیار عثمان ل١١).



**لەکۆتایدا:** لە صیفاتی ئیماندار ئەوەیە کە کاتێ داوا لە خوا دەکات کە منداڵی ببێ، داوای منداڵی صاڵح و چاك دەکات کە ببێتە مایەی چاوڕۆشنی بۆی و کەچووە ماڵەوە بەبینینی منداڵە جوانەکەی ماندووبوونی دەرەوەی ماڵی دەرچێ و بحەسێتەوە، هەروەکو خوای گەورە لە سوڕەتی: (الفرقان)دا، لە باسی صیفاتی (عِبادُ الرَّحْمن)دا، باسی یەکێ لە سیفاتە بەرزەکانیان دەکات کە دەفەرمووێ: ﴿وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَٱجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴿٧٤﴾﴾ الفرقان.

واتە: دەڵێن پەروەردگارا هاوسەرەکانمان و نەوەکانمان بکە بە مایەی ئاسودەیی و حەسانەوەمان و گەشبونەوەی دڵ و دەروون و ناخمان، وە بمانکە بە پێشەوای تەقواداران و پارێزکاران.

بەڵێ هەر ئاواتت بونی منداڵ نەبێ. بەڵکو منداڵێك بێ کە ببێتە بەرەکەتی ماڵ و حەسانەوەت نەك ماڵت لێ قەدەغە بکات. چونکە منداڵی ئاواش هەیە. بەڵام مەبەستمان لە منداڵی گەورەی لاسار نیە. بەڵکو مەلۆتکەیەکی بچوك ئەگەر خوا ڕەحمت پێ نەکات ماڵت لێ قەدەغە دەکات. بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی باسەکەمان، سەرنجی ئەم ڕووداوە بدەن:

ڕۆژی (٢٠١٣/٧/١٧) بەرامبەر: (٨ی ڕەمەزانی ١٤٣٤) کاتژمێر (٥: ١٠) دە و پێنج خولەك. پیاوێك لە شاری سلێمانیەوە هاتبوو بۆ

شارۆچکەی پیرەمەگرون، بۆلای بەندە ـ نوسەری ئەم بابەتە ـ، هاتە ژووری دانیشتنم لە مزگەوت: زۆرخەم و مەحزونی پێوە دیار بوو، وامزانی کێشە و گرفتی دارایی و نەخۆشی و قەرزاری هەیە. بەڵام ئەو وتی: خۆزگە ئەوانەم هەبوایە!!

بەلامەوە سەیر بوو، بۆیە وتم: ئەوە چ گرفتێکە لەمەش گەورەترە؟!

وتی: من تەمەنم نزیکی پەنجا ساڵ بۆتەوە سوپاس بۆ خوا هەمیشە ئەهلی مزگەوت و جومعە و جەماعەت بووم، چەند منداڵی کوڕ و کچی گەورەم هەیە. لەم ماوەیەدا خوای گەورە منداڵێکی جوانی پێ بەخشین، وەکو دوا منداڵی ژیانمان سەیرمان کرد، لەبەرئەوەی ماوەیەکی زۆرە منداڵمان نەبووە، لە ڕادەبەدەر خۆشم دەوێ. بەڵام گرفتەکەم ئەوەیە: توشی حاڵەتێکی زۆر نائاسایی بووم. ناوێرم بچمە سەر منداڵەکە و بیبینم، یەکسەر وام لێ دێ کە دەست بخەمە قوڕگی و بیخنکێنم!!

هەرچی سورەتی (الفلق) و (الناس) و (الأخلاص) و آیة الكرسي دەخوێنم، ئەو حاڵەتەم لەسەر لاناچێ و ئێستا ناوێرم بڕۆمەوە ماڵەوە و هەر جارەی بەبیانوی سەردان و تەعزیە و نەخۆشەوە دەچمە ماڵە خزم و ناسیاوێك و خۆم دووردەخەمەوە لە بینینی منداڵەکەم، لەترسی ئەوەی نەوەکا توشی ڕووداوێکی نەخوازراوی دڵتەزێن ببم!!

پێم وت: واباشە سەردانی دکتۆرێکی دەروونی بکەی، وتی: چووم و هیچ سودمەند نەبووم. بەڵام لەگەڵ مسوڵمانان دوعامان بۆ بکەن خوای گەورە لەم گرفتە گەورەیە ڕزگارمان بکات.. خوای گەورە لەو ناڕەحەتیە گەورەیە ڕزگاری بکات، آمین..

کەواتە: ئەی ئەو ژن و پیاوەی کە منداڵتان نیە. ئەمجارەش سوپاسی خوای گەورە بکە، کێ دەڵێ تۆش وەکو ئەم کەسە ئاوا تووشی گرفتاری نەدەبووی بەدەست منداڵەکەتەوە. هەموومان لەپەروەردگارمان دەپاڕێینەوە: ﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ حَسَنَةٗ وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾ اللهُمَّ آمين..

# وانەی یانزەیەم

## بابەت: لەخوا غافڵ مەبە و لە ناپاکی هاوسەری بەدووربە

### ـ بەشی یەکەم ـ

۞ قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وَتَعالى: ﴿وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلزِّنَىٰٓ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَسَآءَ سَبِيلًا ﴿٣٢﴾﴾ الإسراء.

۞ قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (البِكْرُ بالْبِكْرِ جَلْدُ مأتةٍ وَتَغريبُ عامٍ) رَواهُ مُسْلِم: (١٦٩٠).

۞ عَنْ ابي هُرَيْرَةَ قالَ: أَتَى رَسُولَ اللهِ ﷺ رَجُلٌ مِنَ المُسْلِمِينَ، وَهُوَ فِي المَسْجِدِ فَناداهُ، فَقالَ: يارَسُولَ اللهِ، إِنِّي زَنَيْتُ، فَأَعْرَضَ عَنْهُ، فَتَنَحى تِلْقاءَ وَجْهِهِ، فَقالَ: يارَسُولَ اللهِ، إِنِّي زَنَيْتُ، فَأَعْرَضَ عَنْهُ، حَتَّى ثَنَّى ذالِكَ عَلَيْهِ أَرْبَعَ مَرَّاتٍ، فَلَمّا شَهِدَ عَلى نَفْسِهِ أَرْبَعَ شَهاداتٍ، دَعاهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَقالَ (أَبِكَ جُنُونٌ؟) قالَ لا، قالَ: فَهَلْ أَحْصَنْتَ؟ قالَ: نَعَمْ، فَقالَ النَّبِيُّ ﷺ إِذْهَبُوا بِهِ فَارْجُمُوهُ) متفقٌ عَلَيْهِ، رَواهُ البُخارِيُّ: (٤٨٦٦) وَ مُسْلِم: (٣٢٠٢).

## سەرچاوەکان:

١) تەفسیری ڕۆشن، بورهان محمد أمین.

٢) وەلاَمێك بۆ چەند پرسیارێکی سەردەم، د. محمد عبدالله پێنجوێنی، ل٧ – ١٤.

٣) گۆڤاری (ژیار) ژمارە: ٧، ل٣٢، نوسینی د. إبراهیم طاهر معروف.

٤) موسوعة غَرائِبُ القِصَص، د. أحمد سالم بادویلان، ص٢٧٥.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحَمْدُ للّهِ رَبِّ العالَمين وَ الصَّلاةُ وَ السَّلامُ عَلى سَيِّدِنا محمد وَ عَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أجْمَعينَ:

یەکێ لەو بابەتانەی کە لە سەرەنجامی دورکەوتنەوە لە پەیامی خوای پەروەردگار و جێبەجێ نەکردنی شەریعەتی پاك و دادپەروەری ئیسلامدا ڕوودەدات و بەرهەمی لەخوا غافلّ بوونە، بریتیە لە (خیانەتی هاوسەری). کە ئەمڕۆ خێزانی زۆر هەن کە توشی کێشە و گرفتی زۆر گەورە بوون بەهۆی ناپاکی هاوسەری لەیەکتری.. بۆیە لەم وتارەدا هەندێ لەو بارەوە دەدوێین بەویستی خوا (إن شاء الله). بە ئومێدی خۆپاراستنمان و بەئاگاهێنانەوەی ئەوانەش کە توش بوون..

سەرەتا پێویستە ئەوە ڕوون بکەینەوە کە: خوای کاربەجێ و حەکیم، کە مرۆڤی دروستکردووە لەسەر زەوی، بۆ بەردەوام بوونی ژیان لەسەر زەوی و نوێبونەوەی نەوە لەدوای نەوە و درێژەدان بە سونەتی حەیات و ژیان، ئارەزووی جنسی و مەیلی هەردوو ڕەگەزی نێر و مێی دوای باڵغبوون و پێگەیشتن بۆیەکتری لەناخی هەردوو لادا دروستکردووە، لەزەت و خۆشیشی لە ئەنجامداینەدا بە مرۆڤ بەخشیوە، ئەمەشی کپ نەکردووە، بفەرموێ خۆشم دروستم کردووە و نابێ مرۆڤیش بەکاری بێنێ. بەڵکو ئیسلام ڕێگەی حەڵاڵی بۆ داناوە، کە بریتیە لە: هاوسەرگیری کچ و کوڕ دەچنە لای یەکتر

و ئارام دەگرن لەپاڵ یەکتردا و دنیایەکی پڕ لە سۆز و ئەڤین و خۆشەویستی بەزەیی بۆیەکتر، لە نێوان ئەم دوو هاوسەرەدا دروست دەبێ. بە تەعبیری پوختی قورئانی:

﴿وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ۝﴾ الروم.

بەلاّم لەگەڵ ئەم ڕێگە حەلاّڵەدا، لەگەڵ ئەم خۆراکە پاکەدا بۆ تێرکردنی ئارەزووی جنسی، مرۆڤ ئەگەر لە خوا غافڵ بوو، توش لادان دەبێ، حەزەکانی لە ڕێگەی ناپاکی و حەرامەوە تێردەکات. خۆی و بەرامبەر و بنەماڵە و گەل و ولاّتی لیخن و پیس و بۆگەن دەکات. جائەم حاڵەتە لەنێوان کوڕ و کچێکدا بێ کە پێشتر هاوسەرگیریان نەکردبێ. حوکمەکەی و تاوانەکەی سوکترە لەوەی کە لەنێوان ژن و پیاوێکدا بێ، کە پێشتر هاوسەرگیریان کردبێ و ئیستا خاوەنی هاوسەربن و بەدزی و ناپاکی ئەم خیانەتە ئەنجام بدەن. واز لە حەلاّڵی خۆیان بێنن و بەحەرام و گوناه خۆیان تێربکەن. کە پێی دەوترێ (ناپاکی خێزانی) و ئێمە زیاتر لەسەر ئەم بابەتە و خەتەر و بەلاّکانی ئەم بەلاّ کوشندە لەناوبەرە خێزان هەڵوەشێنە، مرۆڤ ڕیسواکەرە دەدوێین، کەبەرهەمی ئەوەیە مرۆڤ لە خوا غافڵە.

### پێناسەی ناپاکی خێزانی:

سەرەتا با پێناسەی ناپاکی خێزانی (الخيانَة الزَّوجِيَّة) بکەین: ناپاکی هاوسەری بریتیە لە پەیوەندی ناشەرعی کە یەکێك لە هەردوو لایەنی هاوسەر ئەنجامی دەدات، لەگەڵ کەسێکی سێهەم. ئەمەش تەنها ئەنجامدانی کاری سێکسی ناگرێتەوە بە تەنها، بەڵکو هەموو پەیوەندیەکی هاوسەرایەتی لەدەرەوەی چوارچێوەی خێزاندا، بەبێ ئاگاداری هەردولا دەچێتە خانەی ناپاکی خێزانیەوە، بەواتایەکی تر ناپاکی خێزانی بریتیە لە:

ئەنجامدانی کاری سێکسی ناشەرعی و پێشینەکانی لەلایەن هەردوو کەسی هاوسەرەوە لەگەڵ کەسێکی سێهەم، بەبێ بوونی هیچ پەیوەندیەکی شەرعی کە ڕێگە بدات بەو کارە.

کەواتە: گرانترین جۆرەکانی ناپاکی خێزانی بریتیە لە: سێکس کردن لەگەڵ کەسێکی تر کە شەرعیەتی نیە، کە ئیسلام ناوی زینای لێناوە، بۆزیاتر ڕوونکردنەوەی ئەم پێناسەیە، پێویستە بگەڕێینەوە بۆ چەمکە فیقهیەکان.

لە فیقهی ئیسلامدا ئەو کوڕەی کە ژنی هێنابێ و بەگرێبەندێکی شەرعی هاوسەرگیری کردبێ بە (مُحْصَن) لەناو قەڵای داوێن پاکی ناودەبرێت، هەروەك ئەو ئافرەتەی شوی کردبێ و، بەگرێبەندێکی شەرعی هاوسەرگیری کردبێ بە (مُحَصَنَة) لەناو قەڵای داوێن پاکی ناو زەندی دەکات. ئەمەش ئاماژەیەکی ڕوونە کە کەپێك هێنانی

هاوسەرگیری شەرعی دەبێتە قەڵایەکی مەحکەم بۆ پاراستنی هەردوو کەسەکە و، دەبێ حەزی سێکسیان لەوێدا کۆتایی پێ بهێنێ..

هەروەك ئاماژەیەکی ترە بۆ ئەوەی کە حەزی سێکسی ووزەیەکی خوا کردە لە مرۆڤەکاندا بۆ ئامانجێکی گەورە و پاراستنی ڕچەڵەکی گەلانی پێوە بەندە، دەبێت لە شوێنی خۆی و لە جێی خۆیدا بۆ ئامانجی خۆی بەکاربهێنرێت. دەی هەر کەسێك لەم قەڵای هاوسەرگیرییەدا بێت، چۆن دەبێ ڕێگە بەخۆی بدات لەدەرەوەی ئەم خێزانەوە بەبێ بونی شەرعیەت ئەو حەزەی خۆی خەرج بکات؟! داوێن پاکی یەکێکە لە ئەرکە داواکراوەکان کە قورئان هیچ شارشی لەسەر ناکات و دەفەرمووێ: ﴿مُّحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَٰفِحِينَ وَلَا مُتَّخِذِىٓ أَخْدَانٍ﴾ المائدة.

واتە: ئەوانەی لە پیاوان دەیانەوێت هاوسەرگیری بکەن، یان هەر کەسێکی تر بێت، دەبێت ئافرەتانی داوێن پاك لەم جۆرە پیاوانە مارە بکرێت، کە داوێن پاك و زیناکار نین هاوڕێیان نەگرتووە و لە نهێنیدا لەگەڵ کچان و ئافرەتانی هاوڕێیدا بە هاوڕێی کاری سێکسی ناکەن..

جا هەروەك لەم ئایەتەدا ڕوو دەکاتە پیاوان و ئەو ڕەوشتەیان لێ داوا دەکات، بەهەمان شێوەش دەقێکی تریش لە قورئاندا ڕوو

دەکاتە ئافرەتان و دەفەرمووێ: ﴿مُحْصَنَـٰتٍ غَيْرَ مُسَـٰفِحَـٰتٍ وَلَا مُتَّخِذَٰتِ أَخْدَانٍ﴾ النساء.

هەروەها دەبێ پیاوانی داوێن پاك، ئافرەتانی لەم جۆرە مارە بکەن کە داوێن پاکن و زیناکار نین و هاوڕێیان نەگرتووە و لە نهێنیدا لەگەڵ هاوڕێی پیاودا نین..

لێرەوە چەمکی خیانەتی هاوسەری باش ڕوون دەبێتەوە کە خێزان قەڵای داوێن پاکییە و قوتابخانەی ئەخلاقە و فێرگەی ئاکاری جوانە، مەیدانی ڕاستگۆیی یە، سەنگەری بەرهەڵستە لە هەموو ناپاکی و کارە دزێوەکانی دژ بە پەروەردەی دروستی تاك دەبێت خێزان پارێزراو بێت. بۆیە هەرکام لەم دوو کەسە (ژن یان مێرد) لە دەرەوەی نیکاحی شەرعی کاری سێکسیان کردووە دەبێتە ناپاکی خێزانی و بەخیانەتی زەوجی لەقەڵەم دەدرێت.



## سزای ناپاکی خێزانی:

قورئانی پیرۆز سزای ئەم جۆرە تاوانەی دیاریکردووە، کە چوار جۆر سزای هەیە:

### جۆری یەکەم: سزای جەستەی و دەروونی پێکەوە

وەك خودا دەفەرمووێ: ﴿ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجْلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا مِاْئَةَ جَلْدَةٍ وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْآخِرِ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَآئِفَةٌ مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۝٢﴾ النور.

واتە: سەرەتا بۆ تەمێکردنی ئافرەتی زیناکەر و پیاوی زیناکەر (سەد) جەڵدە و شەلاقمان بۆ هەریەکەیان بڕیارداوە بەبێ جیاوازی ـ چونکە سنور شکاندنە و نانەوەی کێشەی کۆمەڵایەتی هەمەلایەنە و عەیبدار کردنی بنەماڵەکانە، خۆئەگەر منداڵیش پەیدابوو ئەوە منداڵێکی بێ ناز و بەدوور لە سۆزی خێزانی دێتە سەر گۆڕەپانی ژیان ـ هەروەها با بەزەییتان پیایاندا نەیەتەوە و سستی مەکەن لە ئەنجامدانی ئەو حوکمە خواییەدا..

کاتێك کە چوار کەس شایەت بوون لەسەر دیتنی ئەو تاوانە، ئەگەر ئێوە باوەڕتان بەزاتی خوای گەورە و ئەو جیهان هەیە، دەبا دەستەیەك لە ئیمانداران پیادەکردنی ئەو سزایە ببینن. تا ئەوانەی سنور شکێنن یان نیازی خراپیان هەیە، تەمێ ببن و جڵەوی نەفسیان بگرن. (شایانی باسە پیادەکردنی ئەو حوکمە ئەرکی سەرشانی دەوڵەتی ئیسلامیە و حیساب بۆ هەموو گومانێك دەکرێت تا سومعە و ناوبانگی کەس بە ناحەق لەکەدار نەکرێت).. (تەفسیری ڕۆشن، ل٥١٧).

لێرەدا دوو جۆر سزا کۆبۆتەوە:

١) سزایی جەستەیی کە لێدانی (١٠٠) دارە.

٢) سزای دەروونی کەلەبەرچاوی کۆمەڵێ خەڵکدا ئەنجام دەدرێت.

### جۆری دووەم: لێ سەندنەوەی پلەیەکی کۆمەڵایەتی

ئەمەش سزایەکی ترە کە لێ سەندنەوەی پلەیەکی کۆمەڵایەتیە کە داوێن پاکی یە. دەرکردنی لە ئاستی مرۆڤە داوێن پاکەکان و پاکیزەیی لێ وەردەگرێتەوە، وەك قورئان دەفەرمووێ: ﴿ٱلزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ ۚ وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٣﴾﴾ النور.

واتە: جا ئیتر پیاوی زیناکەر دەبێت ئافرەتی زیناکەر یان ئافرەتێکی بێ دین و موشریك بخوازێت. ئافرەتی زیناکەریش دەبێ شوو بە پیاوێکی زیناکەر، یان بێ دین و موشریك بکات، بێگومان ئەو جۆرە ژن و مێردایەتیە لە ئیمانداران حەرام و قەدەغەیە.

لێرەدا بە ڕاشکاوی دیارە کە دەبێ زیناکاری پیاو تەنها زیناکارێکی ئافرەت بخوازێ. هەروەها زیناکارێکی ئافرەت شوو بە زیناکەرێکی پیاو دەکات. ئەمەش لێسەندنەوەی پلەی پاك داوێنی و پاکیزەییە، کە لەناو کۆمەڵگەی ئیسلامی پلەیەکی بەرزە.

### جۆری سێهەم: دوورخستنەوەی لە شارەکەی

دوورخستنەوەی زیناکار لەو شارەی خۆی بۆماوەی ساڵێك، لەم جۆرە سزایەدا ڕای جیاواز هەیە لە نێوانی زانایاندا، چونکە دەچێتە ناوەندی سزای (تەعزیریەوە)، واتە: بڕیاردەر و دادوەر خۆیان سەرپشك دەبن لەم جۆرەی سێهەمدا، گەر بە گونجاویان زانی بڕیار دەدەن و ئایا ئەم دورخستنەوەیە تەنها هەر بۆ پیاوانە، یان ئافرەتانیش دەگرێتەوە، لەسەر ئەم بابەتە ڕای جیاواز هەیە و کورتەکەی دەکەوێتە دەستی دادوەر چی بە مەصلەحەت زانی ئەوە دەکات، هەڵبەتە ئەمەش بەڕاوێژ دەکات نەك بە خواستی خۆی.

### جۆری چوارەم: بەردباران و کوشتن

سزایەکی تر هەیە کە ئەویش بەردەباران و کوشتنە، کە لە چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە، بۆ ئەنجامدانی ئەم سزایە ئەم مەرجانەی خوارەوە هاتووە:

١) دەبێت ئەم کەسە چەند جارێ دانی نابێ بەوەی کە زینای کردووە.

٢) دەبێت داوەر وردە کاری زۆری تێدا بکات، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرمووی بەو کەسەی کە دانی بەوەدا نا کە زینای کردووە، لێی پرسی (أَبِكَ جُنُونٌ) ئەوە شێتی؟! یان شێت نیت؟! بۆئەوەی

دەرفەتی بداتیٚ، نەبادا ئاگای لە خۆی نەبیٚ، بۆیە داوەریەکەی دواخست بۆ ڕۆژێکی دیکە.

٣) ئەم سزایە وەك سزای (تەعزیری)وایە، دادوەر دیاری دەکات، بەپێی کەس و جۆری کردارەکە و جاری دووبارە بونەوە، هەروەکو پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: **(إِذْهَبُوا بِهِ فارجِمُوا)** بڕیارەکە لەلایەن پێغەمبەرەوە بوو ﷺ.

٤) ئەگەر خودی زیناکردنەکەی پێویستی بە چوار شاهید بیٚ، ئاسان نیە کوشتن بە سانایی بسەپیٚ و بڕیاری لەسەر بدریٚ. بۆیە نمونەکان هەر هەموویان (إقرار)دان پێدانان بوە و خۆیان قسەیان کردووە.

٥) لەقورئاندا هیچیانی جیانەکردۆتەوە، بەو ووشەی ﴿ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي﴾ واتە: سزای تاوانی زینا هەر ئەوەیە کە لە قورئاندا هاتووە. ئەوەی دیکە ئیجرائاتی دادوەرە بۆ ڕێگرتن لە بڵاوبونەوەی زینا.

٦) ئەو کەسەی کەپێغەمبەر فەرمووی **(إِذْهَبُوا بِهِ فارجِمُوهُ)** پیاوێك کە لەوێدا بوو وتی: ئەو ڕەجم مەکەن من ڕەجم بکەن، چونکە من لەگەڵ ئەو ئافرەتە زینام کردووە.. ئەوەش ئەوە دەگەیەنیٚ کە ئەو ئافرەتە یەکەم جاری نەبووە، بەڵکو کردویەتی

بە پیشە و پیاوەکانیش هەمان گریمانەیان هەیە، واتە: ئەوانیش دەکرێت کردبێتیان بە پیشەی ڕۆژانەیان.

٧) ئەم سزایە بە تەوبەکردن لادەچێت، وەك دەفەرمووێ: (فَتابَ تَوْبَةً إلى اللهِ لَوْ قسمت عَلى أَهْلِ المَدينَةِ لَكَفَتْهُمْ)

بۆیە سەرەنجام دەتوانین بڵێین: بەردە باران کردن بابەتێکی تایبەتە بە حاڵەتی تایبەتەوە کە لە کۆمەڵگەدا ڕوودەدات. بۆئەو جۆرە کەسانەیە کە زیاتر ئەم تاوانە دەکەنە پیشە و بەلایانەوە زۆر سانایە و باندی بۆ دروست دەکەن و کۆمەڵگە پیس دەکەن، بۆ پاراستنی پاکیزەیی کۆمەڵگە پێویستە دادوەر سود وەربگرێت لەم جۆرە سزایانە.

کەواتە: بەردباران و ڕەجم کردن تا کوشتن، سزایەکی ڕەهانیە و بۆ هەموو کەس نیە. ئەوانەی باندیان هەیە و دەیکەنە پیشە و پارەی پێ پەیدا دەکەن لە هەردوو ڕەگەز شایستەی سزای سەختن، خۆ ئەگەر وازیان هێنا و تەوبەیان کرد باشە، دەنا دەکرێت سزای سەختیان بدرێت، ئەمەش تەنها کاری دادوەرە.

(وەڵامێك بۆ چەند پرسیارێکی سەردەم، د. محمد عبدالله پێنجوێنی ل٧ – ١٤).

لێرەدا ڕەنگە کەسانێکی دوور لە دین، یان ناحەز بە ئیسلام بڵێن: باشەی بۆچی ئەم کارە حەرامە و بۆچی بە خیانەت ناودەبرێ

له ئیسلامدا؟! ئایا مرۆڤ ئازاد نیه لەگەڵ کێ مومارەسەی کاری جنسی خۆی بکات؟! بۆچی دەبێ ژن و پیاوێك تەنها لەگەڵ یەکتردا کاری سێکسی ئەنجام بدەن. ئەی هەمان کارنیه لەگەڵ کەسێکی دەرەوەی خێزاندا ئەنجام دەدرێ ئەی بۆچی ئەمەیان حەرامە؟!

لەوەڵامدا دەڵێین:

یەکەم: ئەگەر کەسێك موسڵمان بێ، له ناخەوە تەسلیم بووە بە هەموو فەرمان و حوکمەکانی خوای پەروەردگار، یەقینی هەیە کە هەرچی خوای گەورە حەرامی کردبێ پڕ حیکمەتە و هەمووی لە بەرژەوەندی مرۆڤدایە بۆ ئێستا و داهاتووی. ئەو خوایەی کە خۆی مرۆڤی دروستکردووە، هەر ئەویش شایەنی ئەوەیە کە حەڵاڵ و حەرامی بۆ دیاری بکات. چونکە هەر دروستکار دەزانێ کە دروستکراوەکەی چۆن کار بکات و خۆی لە چی بەدوور بگرێ.

دووەم: لەڕووی زانستیەوە، ئەمە با وەڵامی ئەو کەسانە بێ کە خۆیان بە زانستخواز و ئەهلی زانست دەزانن و بڕوایان بە زانستی نوێ هەیە. فەرموون ئەمەش قسەی زانست لەم بابەتەدا: لەدوای پاك بونەوە لە بێ نوێژی بەچەند ڕۆژێك یان لە نیوەی مانگدا، هێلکە پێدەگات و لە هێلکەداندا بەتوندی پاڵدەدرێت و فڕێ دەدرێت بۆ ناوچەکانی دەوروبەری جۆگەی هێلکە، ئەوانیش

لەباوەشی دەگرن و ڕایدەکێشن و پاڵی دەدەن بەرەو ناو جۆگەی هێلکەدان. هەروەکو خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿فَلْيَنظُرِ ٱلْإِنسَـٰنُ مِمَّ خُلِقَ ۝ خُلِقَ مِن مَّآءٍ دَافِقٍ ۝ يَخْرُجُ مِنۢ بَيْنِ ٱلصُّلْبِ وَٱلتَّرَآئِبِ ۝﴾ الطارق.

واتە: بۆئەوەی ئادەمیزاد لەخۆی نەگۆڕێت و خۆی فەرامۆش نەکات، با تەماشای سەرەتای دروست بونی خۆی بکات. تەماشای ئەو مادە و شتانە بکات کە لێی دروست بووە، ئادەمیزاد دروست بووە لە نێوان ئاوێکی هەڵقوڵاو لە لایەن نێرینەوە (کە ملیۆنەها سەرە مێکوتە مەلەی تێدا دەکات، وە لە ئاوێکی تر کە هێلکۆکەیەکی تێدایە و چاوەڕێی پیتاندنە). بەشە نێرینەکەی لە بڕبڕەکانی پشتدا لەسەرەتاوە دروست دەبێ و دادەبەزێت بۆ نێو شوێنی تایبەت لە بەشی خوارەوەی نێرینەدا لە کیسێکدا کۆدەبێتەوە، بەشە مێینەکەش لە بڕبڕەکانی سنگەوە دروست دەبێت و دادەبەزێت بۆناو منداڵدان..

بەڵێ ئەو ئایەتە بۆمان ڕوون دەکاتەوە وەکو موعجیزەیەکی خوایی، کە ئاوی نێرینە و هێلکەی مێینە، هەردووکیان بە توندی فڕێ دەردێن و هەردووکیشیان لە نێوان بڕبڕەکانی پشت و پەراسوەکان دروست دەبێت کاتی دروست بونی ئەندامەکانی لەشی

کۆرپەلە، هێلکە لە نیوەی جۆگەی هێلکەدان بە جوانترین شێوە خۆی ڕازاندۆتەوە و کڵاوەی زێڕینی پۆشیوە و بە ژمارەیەکی زۆر لە خانەی پارێزەر دەورە دراوە بۆ پارێزگاری کردنی.

هێلکە لەو شوێنە چاوەڕوانی هاوبەشی ژیانی دەکات کە بریتیە لە یەکێك لە سپێرمەکان، بۆئەوەی لەگەڵی جوت ببێت و کۆرپەلە دروست ببێت (ئەگەر لە نێوان دوو هاوسەر جوت بوون ڕووی دابێ). سپێرمەکان بە خێراییەکی زۆر بەرەو هێلکە سەردەکەون و لە نێوان خۆیان پێشبڕکێ دەکەن تاوەکو بگەنە هێلکە و تەنها یەکێکیان دەتوانن پیتێنی لەگەڵدا بکەن. (کامەیان خێراتر و بەهێزتر بێ) ژمارەی ئەو سپێرمانەی سەردەکەون (٣٠٠) سێ سەد ملیۆنە، بەڵام تەنها (٢٠٠) دووسەد سپێرم لە کۆتایی پێشبڕکێیەکەدا دەتوانێ بگاتە دەوروبەری هێلکە، چونکە ماوەکەی دوور و درێژە، نزیکەی (٣٠ – ٤٠)سم دەبێت.. پێویستە سپێرم ئەو ماوە ببڕێت بەناو کۆئەندامی زاوزێدا تاوەکو دەگاتە هێلکە، ئەوانی تری گشتیان لە ڕێگە شەکەت دەبن و دەمرن، ئەو سپێرمەی خوای گەورە بە قەدەری خۆی دایناوە پیتێن بکات ئەوا سەری لە دیواری هێلکە دەدات بۆ چونە ژوورەوە، بەهۆی دەردانی ئێزایمەکی تایبەت بە ناوی (ئەکرۆسین) (Acrocin) دەتوانێ دیواری هێلکە ببڕێت.

ئینجا سپێرم لەناو هێلکەدا دەتوێتەوە و پیتێن ڕوودەدات (الإخصاب – Fertilization) دیواری هێلکە زۆر پتەوە،

سپێرم ناتوانێ لەهەموو شوێنێكەوە بچێتە ژوورەوە، بەڵكو شوێنی تایبەت هەیە بەناوی (شوێنی تەنك ـ **منطقة الشّفاف** ـ Pellucida zona) یان پێیان دەڵێن ناوچەی پێشوازی كردن لە سپێرم، هەركات پیتێن ڕوویدا لەگەڵ یەك سپێرم ئەوا ئەو ناوچانەی پێشوازی لەسەر دیواری هێلكە هەڵدەگیرێن و هیچ سپێرمێكی تر ناتوانێ بچێتە ناو هێلكە هەرچەندە زۆر بەهێزیش بێت. ئەگەر ئەو ڕووداوەش ڕوویدا، واتە: دوو سپێرم چوونە ژوورەوە ئەوا دەبێتە هۆی كوشتنی هێلكە و سپێرمی یەكەم. هەروەها سپێرمی دووەمیش.

بەمەش كۆرپەلە هەرگیز دروست نابێت، ئەو ڕووداوە نادروستە ئەگەر ڕوویدا، ئەوا لە زانستی پزیشكیدا پێی دەڵێن: (سك پڕی هێشویی ـ **الحَمْل العَنقودي** ـ Hydatidiform mole) ئەگەر ئەو نەخۆشیە چارەسەرنەكرێت بەنەشتەرگەری ئەوا ئافرەتە دەمرێت، یان توشی شێرپەنجە دەبێت لە داهاتوویەكی نزیكدا!!

ئەو ڕووداوەش بەڵگەیەكی زۆر زانستیانەیە لەسەر ئەوەی دەبێ هەر ئافرەتێك بۆیەك پیاو بێت. هەركات زیاتر لە یەك پیاو چونە لای ئافرەتێك، ئەوا شێواندن و تێكدانی باری هاوسەرێتی و خێزان و كۆمەڵگەیە، تێكەڵاوی نەوەكانی بەدواوەیە و كەس منداڵی خۆی ناناسێ و كێشەی میراتیش سەرباری هەموو كێشەكانی تر. هەموو شەریعەتەكانی ئاسمانی ئەو جۆرە هاوسەریەتیەیان ڕەت كردۆتەوە

و قەدەغەکردووە و لەواقعیشدا سەرناگریّ. چونکە کێشەی گەورە و زۆری بەدواوەیە و ئەمەش کۆتایی ژیانی مرۆڤایەتیە.. سەرنج بدە:

هێلکە بەو بچوکیەی خۆی ڕێگە نادات دوو سپێرم ببنە هاوبەشی ژیانی، بەڵام کۆمەڵگای دوور لە ئیسلامی بەناو پێشکەوتووی ئێستا، هەندێ کەس و تەوژم تێی دا داوای ئەوە دەکەن و دەیانەوێت دوو پیاو یان زیاتر بۆیەك ئافرەت بێت و بگەڕێنەوە سەردەمی نەفامی و کۆن!!



## ڕۆڵی ناوچەکانی پێشوازی لە کرداری پیتێن:

١) هەندێ چینە خانەی تایبەتی تێدایە، تاوەکو سەرنجی سپێرمەکان ڕاکێشێ بۆلای هێلکەکە.

٢) ناهێڵن (فرە پیتێن) ڕووبدات، واتە: دوای پیتێن بەرگری دەکەن لە چونە ژوورەوەی سپێرمەکانی تر و چی تر پێشوازی ناکەن لە سپێرم، هێلکەش کڵاوە زێڕینەکەی دادەکەنێ و دیواری ئەستور دەبێت و تریشقەیەکی کارەبایی دروست دەکات، دەبێتەی هۆی کوشتنی گشت سپێرمەکانی تر کەلەو ناوە ماون، یان خۆیان بەداخ و پەژارە دەمرن. چونکە داوی ماندوبونێکی زۆر پێشوازیان لێنەکراوە.

٣) دوای ئەوەی پیتێن ڕوویدا، ئەوا هەر ئەو ناوچانەن هاوکاری هێلکەی پیتراو دەکەن بۆ گەیاندنی بە سەلامەتی بۆناو منداڵدان.

ئەو دیمەنە سەرسوڕهێنەرە کە دەیبینین، هێلکە وەك بوك خۆی ڕازاندۆتەوە و سپێرمەکان ماندوو شەکەتن، پێشبڕکێ دەکەن بۆ گەیشتنە ئاواتیان، پاش ڕوودانی پیتێنی هێلکە بەو سپێرمەی خوای گەورە دیاری کردووە، ئەوا ئەوانی تر هەموو دەمرن لە داخا، یان سەری خۆیان بە دیواری هێلکەدا دەدەن و لەناو دەچن چونکە پێشوازیان لێ ناکرێت!!

بەڵێ چۆن پێشوازیان لێ بکرێ لە کاتێکا هێلکە بۆتە خاوەن هاوسەر و ماڵ و حاڵی خۆی، چۆن ماڵی خۆی تێك دەدات بۆ یەکێکی تر، ئەو ڕووداوانە کە بەو شێوەیە دەیبینن بەڕاستی ڕێك و پێکی و کردار جوانی و حیکمەتی خوای گەورەمان بۆ دیار دەکەوێت لە هەموو کارەکانی. چونکە ئەگەر هەر (٢٠٠) دوو سەد سپێرمەکە پیتێنی بکردایە، هەر جارێك ئافرەتێك (٢٠٠) دوو سەد منداڵی ببوایە ئەوا دەبوایە ژیانی ئەو ئافرەتە پێش منداڵبوون و دوای منداڵبوون و ژیانی خێزان و کۆمەڵگە و باری ئابوری جیهان چی لێ بەسەر دەهات؟!

بەڕاستی خوای گەورە خاوەن بەزەیی و حیکمەتە جا ئەو حیکمەتە زانستی سەردەم و زانایان بیزانن یان نا، ئەوا هەموو

کارەکانی چ پەنهانی چ دیارەکان هەمووی بەسود و قازانجی مرۆڤایەتیە و لادان لەو بەرنامەیە، نەهامەتی و بەدبەختیە. هەروەکو ئەمڕۆ بەرهەمی پابەند نەبوون بە ژیانی پاك داوێنی و حەلاڵی هاوسەری و سێکسی دەرەوەی خێزان و هەر جاری لەگەڵ کەسێکدا جوت بوون.. بەرهەمی ئایدزە، پەنا بەخوا.

(گۆڤاری ژیار، ژمارە: ٧، ل٣٢، نوسینی د. إبراهیم طاهیر معروف).



## حیکمەتی حەرامی ناپاکی هاوسەری:

کاتێ ئیسلام ناپاکی هاوسەری و خێزانی حەرام کردووە، ئازادی مرۆڤیشی پێشێل نەکردووە، بەڵکو ئازادی بە مرۆڤ بەخشیوە، مرۆڤی ڕزگار کردووە لە:

١) نەخۆشی شێرپەنجەی ڕەحمی ئافرەت، وە نەخۆشی لەناوبەر و بێ چارەسەری ئایدز.

٢) تێکەڵ بوونی مرۆڤایەتی بە یەکتر کەکەس نەزانێ کوڕی کێیە.. ئەوەتا بە ملیۆن کەس هەیە لە ئەوروپا دەزانێ دایکی کێیە؟ بەلاَم ناوی باوکی دیارنیە چونکە دایکی لەگەل چەندین پیاودا جوت بوە، بۆیە نازاندرێ ئەم منداڵە لەکامیانە!! ئێمەی مسوڵمان لە سایەی داوێن پاکی و ڕەوشت بەرزی دایك و باوکمانە،

کە لە ئیسلامەوە وەریان گرتووە، دەزانین باوکمان کێیە و دایکمان کێیە. بنەماڵەمان کێیە و خەڵکی کوێین، ئەم ووشە جوانانە کە هێز دەبەخشن بە مرۆڤ، وەکو مام و خاڵ و پور و ئامۆزا و پورزا، ئەوە بەرهەمی پاکی خێزانەکانمانە، کە دەزانین کێ چیمانە و کێ حەڵاڵمانە و کێ لێمان حەرامە.

٣) پاکی ژیانی هاوسەری ئێمەی پاراستوە لە تێکەڵبونی میرات. ئێستە دەزانین میرات لە کێ دەگرین و کە مردین کێ میراتمان لێ دەگرێ، ئەگەر خێزان شیرازەی تێکچوو ژن و مێردایەتی بە حەڵاڵی و بەپاکی نەما، ئەمە لە کوێ ئەزانرێ.

٤) ئەم پاکیەتی ژیانی هاوسەری و دوربونە لە خیانەتی هاوسەری ئێمەی موسڵمانی پاراستوە لە هەڵوەشانی کۆمەڵگاکەمان. لەبەرئەوە بناغەی دەوڵەت لە خێزانەوە دەست پێدەکات. ئەگەر خێزان تۆکمە و بەهێز و پارێزراو بوو، ئاسایشی نەتەوە و وڵاتیشمان پارێزراو دەبێت.



## منداڵەکەی ژەهر خوارد دەکات !

بەسەرهات

کوڕێکی گەنج لە تافی هەرزەکاری و لاویدا، دڵی دەچێتە سەر کچێك و دوای ماوەیەك لە پەیوەندی ناشەرعی نێوانیان، ئەم کوڕ و کچە بەهۆی ڕێگە پێنەدانی ماڵی باوکی کچەوە ناگەن بە یەکتری

پاش ماوەیەك لە نائومێد بونیان کە بۆیەکتری نابن، کچەکە شوو دەکات و کوڕەکەش ژن دێنێ و لەدوای تێپەڕبونی سێ ساڵ بەسەر ژیانی هاوسەری نێوانیان ئەم کوڕە و ژنەکەی دەبنە خاوەنی منداڵێك تا تەمەنی دەگاتە شەش مانگ..

بەڵێ، ئالەم کاتەدا کوڕەکە هەواڵی ئەوەی پێدەگات کە ئەو کچەی کاتی خۆی ئەم بەتەمای بووە، ئێستا لە هاوسەرەکەی جیابۆتەوە و تەلاقدراوە و چۆتەوە ماڵی باوکی. ئیتر لەم کاتەوە ئەم کوڕە هەموو بیر و خەیاڵی دەچێتەوە بۆسەر ئەو کچە کە پێشتر بەتەمای بوە و بۆی نەبووە، ژن و منداڵەکەی خۆی لەبەرچاو دەکەوێت و لێرەوە ئاژاوە و کێشە و دووبەرەکی دەکەوێتە نێوانیانەوە..

ئەم کوڕە کە ئێستا خاوەنی ژن و منداڵێکی شەش مانگانەیە، لە خەیاڵی ئەوەدا دەژی کە چۆن خۆی لەم ژن و منداڵەی ڕزگار بکات، بۆئەوەی بگات بە کۆنە دۆستەکەی!

لەبەرئەوەی ژنەکەی ڕازی نابێ کە هاوسەری دووەم بێنێ و بیهێنێتە ئەم ماڵەوە و بەیەکەوە بژین. ئەویش دەست کورتە و ناتوانێ ماڵی سەربەخۆی بۆ دابین بکات.. وەئەگەر ژنەکەشی تەلاق بدات و لە مافەکانی بێ بەشی بکات، توانای دارایشی ئەوەندە کزە و کەمە کە ناتوانێ مافی ژنەکەی بدات لەدوای جیابونەوە لێی. بۆیە دەکەوێتە بیرکردنەوە لە ڕێگایەك کە بە ئاسانترین و بێ

مەصرەفترین شێوە خۆی لەم ژنە کۆنەی ڕزگار بکات و بگات بەو ئافرەتەی چەندین ساڵە بەتەمایەتی. خۆی لەخوا غافڵە و شەیتانیش مامۆستایەتی، سەرەنجام ئەم پیلانە دادەڕێژێ:

ڕۆژێکیان دێتەماڵەوە و ڕووی خۆی بەرامبەر خێزانی خۆش دەکات و، هەواڵی کچە بچکۆلە جوانکیلە شەش مانگەکەیان لە خێزانی دەپرسێ کە گوایە زۆر موشتاقە بۆی، ژنەکەشی خۆشحاڵە و سەرسام دەبێ کە چۆنە ئەو پیاوەی زۆر خراپ بوو لەگەڵیان، ئێستا وا دڵی نەرم بووە و ڕووی خۆشە و لە کچە تاقانەکەی دەپرسێ! کە لەوەتەی بووە وەکو پێویست لە ئامێزی نەگرتووە. بۆیە ئەمیش بە خۆشحاڵیەوە دەڵێ خەوتووە.

بەڵام دەبێ هەڵی بسێنین چونکە کاتی شیر خواردنیەتی، باوکی منداڵەکە دەڵێ زۆر چاکە من حەزدەکەم خۆم مەمکە شیرەکەی بۆ بکەم، خێزانی دەڵێ دەی زۆرباشە، من ئیشەکان دەکەم و تۆش شیرەکەی بدەیە..

بێئاگا لەوەی کە ئەمە چ پیلانێکی ژەهراوی لە ژێر سەردایە. بۆیە باوکی منداڵەکە دەچێ شیرەکەی بۆ ئامادە دەکات و چەند دڵۆپێ لە دەرمانی مشکی زۆر کوشندە دەکاتە شیری منداڵەکەیەوە و، منداڵ لەخەو هەڵدەستێ و منداڵی جوانیش زەردەخەنە و گروگاڵ بۆ باوکی دەکات و، بەدەستە نەرمۆڵەکانی مەمکە شیرەکە

دەگریٚ و دەست دەکات بە خواردنی، لەبەرئەوەی زۆری برسی دەبیٚ بە خێرایی دەیخوات..

لەم کاتەدا باوکەکە منداڵەکە دەخاتەوە جێگاکەی و بەپەلە بۆی دەردەچیٚ. هێشتا دورناکەوێتەوە لەماڵ کە منداڵەکە دەست دەکات بە گریان و هێڵنج و ڕشانەوە و دایکی پەرێشان لە تاوا نازانیٚ چی بکات، بانگی مێردەکەی دەکات سەیر دەکات لەویٚ نەماوە. ئیتر بە ناچاری بە تەنها لە ئامێزی دەگریٚ و دەیگەیەنێتە نزیکترین بنکەی تەندروستی لە ماڵەکەیانەوە..

بەڵام بەداخەوە منداڵەکە لە پشکنیندا دەردەکەویٚ بەهۆی بەهێزی ئەو ژەهرەی کە دراویەتیە ڕیخۆڵەکانی تەقاندووە و جەستەی شین بۆتەوە و هەر لەوێدا دوا هەناسەی دەدات و بۆ دوا جار چاوەگەش و ناسکەکانی لەسەر یەك دەنیٚ!

لێرەدا پەیوەندی دەکەن بە باوکیەوە کە دێت زۆر خۆی پەرێشان نیشان دەدات و هەر خێرا دەڵیٚ ئەمە دەستی ژنەکەمە و لەداخی من منداڵەکەی ژەهرخوارد کردووە..

بەڵام پۆلیسی ئاشکراکردنی تاوان، کەسەیری ڕووداوەکە و پەرێشان حاڵی دایکەکە و خۆپەرێشان کردنی ساختەی باوکی منداڵەکە دەکات. گومانی تەواوی بۆ ئەوە دەچێت کەئەمە دەستی باوکی منداڵەکەیە نەك دایکی. بۆیە فەرمانی دەستگیرکردنی هەردووکیان دەدات و لە کاتی پشکنینی جل و بەرگەکانیان و

وەرگرتنی كەل و پەلی گیرفانیان پێش چوونە ناو ژووری گرتوخانە (سجن)ەكەوە، پۆلیس شوشەی ژەهرەكە لە گیرفانی پیاوەكەدا دەگرێ كە هێشتا لە گیرفانیایەتی و بیری چووە فرێی بدات.

بۆیە لە ژێر لێكۆڵینەوەدا دان دەنێ بە تاوانەكەیدا و دەڵێ ویستم لەم ڕێگا ناشەریفانە و ترسنۆكانەوە، ژنەكەم لە كۆڵ خۆم بكەمەوە و ئیتر لە ژن و منداڵ ڕزگارم ببێ و بەو ئافرەتە بگەم كە پێشتر پەیوەندی ناشەرعیم لەگەڵی هەبووە!! (موسوعة غرائب القِصَص، د. أحمد سالم بادويلان، ص٢٧٥).

بەڵێ ئەمە بەرهەمی غافڵ بونە لە خوای گەورە، لێرەدا كە دەڵێین: هەركەس لەخوا غافڵ بوو لە دڕندە و ئاژەڵ كەمتر و خراپترە، چونكە كاری وەكو ئەم كارەی لێ دەوەشێتەوە كە هیچ دڕندەیەك وە هیچ ئاژەڵێك بە بەچكە شیرەخۆرەكەی خۆی و هاوبەشی ژینەكەی ناكات و نەكردووە! بۆیە ئەی مرۆڤ ئاگاداربە لە خوا غافڵ مەبە و لە هەموو كارێك بەدووربە كە توشی ناپاكی هاوسەریت بكات!.



## وانەی دوانزەیەم

## بابەت: لەخوا غافڵ مەبە و لە ناپاکی هاوسەری بە دووربە..

**ـ بەشی دووەم ـ**

۞ **قالَ اللهُ تَعالى:** ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَـٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾ يُضَـٰعَفْ لَهُ ٱلْعَذَابُ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِۦ مُهَانًا ﴿٦٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَـٰلِحًا فَأُو۟لَـٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَـٰتٍ﴾ **الفرقان.**

۞ **عَنْ عَبْدِاللهِ بنِ مَسْعُودٍ، قالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ: أَيُّ الذَّنْبِ أَعْظَمُ؟ قالَ: أَنْ تَجْعَلَ للهِ نِدّاً وَهُوَ خَلَقَكَ، قالَ: قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قالَ: أَنْ تَقْتُلَ وَلَدَكَ مَخافَةَ أَنْ يَطْعَمَ مَعَكَ، قالَ: قُلْتُ ثُمَّ أَيٌّ؟ قالَ: أَنْ تَزْنِيَ بِحَلِيلَةِ جارِكَ). متفق عليه (بُخاري: ٤١١٧) مُسْلِم: (١٢٤).**

## سەرچاوەکان:

١) تەفسیری کوردی، مەلای گەورەی کۆیە، ب٣، ل٢٨٠.

٢) ئەوەیە شاژن، د. محمد العریفی، و: هێمن محمد علی، ل٢٢٧.

٣) وەلامێك بۆ چەند پرسیارێکی سەردەم، دکتۆر محمد عبدالله پێنجوێنی، ل١٥.

٤) رَوْضَةُ المُتَنَزِّه، شَرْح بدايَة المُتَفَقّه، أيْمَنْ علي موُسى، ج٣ ص٣٩.

٥) تەفسیری ڕۆشن، بورهان محمد أمین، ل٣٤٢.

٦) ندم، هانی درار عُثمان، ص١٧٩.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العالَمين، و الصَّلاةُ وَ السَّلامُ عَلى سَيِّدِنا محمد وَ عَلى آلِهِ وَ صَحْبِهِ أجْمَعينَ:

بە پشتیوانی و ویستی خوای پەروەردگار (إن شاءَ الله) ئەم وانەیەشمان تەواوکەری وانەی ڕابردووە کە باسی (ناپاکی هاوسەری – الخِيانَة الزَّوجيَّة) مان کرد، باسی ئەو کەسانە دەکەین کەوا لە ژیانی ڕۆژانەیاندا، لەژیانی هاوسەریاندا، پەنا بەخوای پەروەردگار توشی غەفڵەت و بێ ئاگاییەك دەبن..

چونکە دەرونی مرۆڤ، نەفسی مرۆڤ، ئەگەر لە خوای پەروەردگاری خۆی غافڵ بوو، وای لێ دێ توشی لادان دەبێ، توشی ئەوە دەبێ کە هاوسەری حەڵاڵ و پاکی خۆی هەیە، کەچی حەزی لەم پاکە نیە و حەزدەکات نەفس و ئارەزووەکانی بە پیس و بە حەرام تێر بکات. بۆیە پشت لە حەڵاڵەکەی خۆی دەکات و لە پشتەوە خیانەتی لێدەکات و لەگەڵ کەسێکی تر ئارەزووی جنسی خۆی تێردەکات.. بەڵێ ئەمە بەرهەمی غەفڵەتە.

## مرۆڤی لەخوا غافڵ قسە نابیسێ

خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرمووێ: ﴿وَلَقَدۡ ذَرَأۡنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِۖ لَهُمۡ قُلُوبٞ لَّا يَفۡقَهُونَ بِهَا وَلَهُمۡ أَعۡيُنٞ لَّا

يُبۡصِرُونَ بِهَا وَلَهُمۡ ءَاذَانٞ لَّا يَسۡمَعُونَ بِهَآۚ أُوْلَٰٓئِكَ كَٱلۡأَنۡعَٰمِ بَلۡ هُمۡ أَضَلُّۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡغَٰفِلُونَ ﴿١٧٩﴾ الأعراف.

بۆ تەفسیر کردنی ئەم ئایەتە پڕ بەهرە و پەند و بەرەکەتە، دەچینە خزمەت تەفسیرەکەی مەلای گەورەی کۆیە. کە مامۆستای (جەلی زادە) ئاوا تەفسیری کردووە:

(دروستمان کردووە بۆ چوونە ناو ئاگری دۆزەخ ئەوانەی خۆیان لێ بزر دەبێ، وەك گورگ دەچنە ناو پێستی مەڕ، خەڵکی بە چەندین شێواز دەخەڵەتێنن و گێل و گەمژەیان دەکەن و ماڵ و حاڵیان داگیردەکەن، ئەوانە لە ڕێگەی زمانی لوس و دڵسۆزی و تێکەڵی و هاودەمی و دۆستایەتی، پاشقول لە خەڵکی دەگرن و بە تەوقی سەردا ئەیخەن و ناهێڵن هەستیش بکات چ پەندێکیان پێ داوە، وەکو سیاسیە درۆزنە تەڵەکەبازەکان، کە بەزمان دۆستی میللەتن و بە دڵ دوژمنی، کە پێویستە میللەت زۆر ووشیار بێ بەرامبەریان..

جا ئەو کەسانە ـ کە موستەحەقی جەهەنم و دۆزەخ بۆ ئەوانە ئامادەکراوە، ئەمە صیفەت و ڕەوشتیانە: دڵیان هەیە، زۆر زانان، زۆر زانن، بەڵام تەنها سەرکێڵ بیردەکەنەوە و ناچنە قوڵایی بابەتەکان. بیریان بەلای داهاتوودا ناچێ، هەمیشە تەنها بەرژەوەندی کاتی خۆیان دەبینن، ئێستا ئەمان قازانج بکەن بەسە،

دوایی ئوممەت و گەل و میللەت چی لیّ بەسەردیّ، بالێی بیّ گرنگ نیە، وەکو کورد فەرموویەتی:

(کفن بە من ببڕیّ، مردوو گۆڕ بە گۆڕچیّ)..

ئەم کەسانە دوربین نین، گویّ نادەنە مێژووی گەلان بیر لەوە ناکەنەوە و تەماشای ئەوە ناکەن کە هۆکاری داڕوخان و هەرەسی گەلانی پێشوو چیە؟ کە ئەوانیش لە کاتی خۆیدا تووشی ئەو هەڵخەڵەتێنەر و دەستبڕانە بوون. کە سەرەنجام هەردوولا ـ فێڵباز و فێڵلێکراو ـ خانە خراپ و ماڵ کاول بوون.. ئەوانە وەکو ئاژەڵ وان، ئەمڕۆ سکی تێربێ، بیری سبەینێی نیە..

مەلای گەورە لێرەدا نمونەیەك دێنێتەوە و دەفەرمووێ: ئەو ساڵەی کوللە زەردە هاتە ولاّت و هەرچی دەغڵ و دان و شینایی یە نەیهێشت، تەنانەت قەدی دارەکانیان خوارد. لەو کاتەدا بە کوللەکانم دەگوت: ئێوە پێستی ـ توێکڵی ـ دارەکان مەخۆن، بادارەکان وشك نەبن، بەبەری دار و گەلاّ و پەلەکان وازبێنن و دەست هەڵگرن. بۆئەوەی لە ساڵی داهاتوودا بۆ نەوەکانتان بەرهەم بداتەوە و ئەوانیش لێی بخۆن، بەلاّم ئەگەر ئێوە توێکڵی دارەکانیش بخۆن، سەرەنجام ئەم دار و درەختانە ووشك دەبن و منداڵەکانتان کە دوای ئێوە دێن پەکیان دەکەویّ!! بەلاّم نەخێر قسە لەگەڵ کیّ دەکەی؟! هەر گوێشیان نەدامیّ)..

بەڵێ مرۆڤی لە خوا غافڵ ئاوا وەکو ئاژەڵ و گیانداران قسە نابیستێ، بەڵکو هەندێ جار لەوان خراپترە. چونکە ئاژەڵەکان و درەندەکانیش تۆزێ ویژدانیان هەیە. بەڵام ئەم مرۆڤانە هەر هیچ ویژدانیان نیە، ئەوانە غافڵ و بێ ئاگان.

ئەگەر بشزانن کار بۆ داهاتووی گەل و میللەتی خۆیان ناکەن، ئەوانە حەز ناکەن هاوزمان و هاونیشتیمانیان ژیر و عاقڵ و تێگەشتوو بێ، بۆئەوەی چۆنی پێیان خۆشە ئاوا باریان بکەن و خزمەتی خۆیانیان پێ بکەن. سبحان الله میللەتیش حەزی بەو جۆرە کەسە فێلباز و دەستبڕ و چەواشەکارانەیە. سیاسی درۆزن و بەناو زانای ئاینی خورافیات و پەسەندی خۆشدەوێ و حەزی بەو کەسانە نیە کە ڕێگای ڕاست و دروستی دین و دونیای پێ دەڵێن و دڵسۆزانە ئامۆژگاری دەکەن!

مامۆستا لە کۆتایدا دەفەرمووێ: گەلێ جار لە کۆڕی ئامۆژگاریدا، عەرزی خۆشەویستان و دۆستانم دەکەم کە: وەرن بۆ تاقیکردنەوە ماوەی دوو ساڵ چاك بین و لەناو یەکتردا ڕێك و پێك و بەڕێزبین و بۆ بەرژەوەندی گشتی تێ بکۆشین ـ بەرژەوەندی تەنها کەسی خۆمان بخەینە دوای بەرژەوەندی گشتی گەل و میللەت و وڵاتمانەوە ـ جا ئەگەر لە بەرهەمی ئەو دووساڵ چاکبوونەدا پێش کەوتین و حاڵمان باشتر و ژیانی کۆمەڵایەتیمان بەتامترو بەچێژتر بوو، لەزەتمان لە ژیان کرد، ئەوە زۆر چاکە و

بەردەوام دەبین. ئەینا ڕوو دەکەینەوە خراپەی خۆمان، خۆ بە دوو سالْ چاکی، خراپی جارانمان لەدەست دەرناچیْ!!

(تەفسیری کوردی، مەلای گەورەی کۆیە، ب٣، ل٢٨٠، بە دەستکاریەوە).

بەلْیْ ناپاکی هاوسەری بەرهەمی لە خوا غافلْ بوونە، چونکە مرۆڤێك دلْ و ویژدانی هەیە، کەچی ئەو ویژدانەی خۆی دەخاتە ژێر پیْ، ویژدانی پێی دەلْیْ داوێن پیسی خراپە، خیانەتی هاوسەری بەلاّیە کەچی دەیمرێنیْ. کەچی بەگوێی ناکات وەکو ئەوەی هەر دلْی نەبیْ! چاوی لە کاتی ئەو کارە قێزەونەدا شەرمەزارانە و ترسنۆکانە بەهەموو لایەکدا دەڕوانیْ لە ترسی ئاشکرابوون. کەچی وەکو چاوی نەبیْ وایە. کەبلْیْ باشە بۆچی ئەوەندە دەترسی؟ بەگوێی خۆی بەسەرهات و عاقیبەتی شەڕی و نەهامەت و نەدامەتی ئەو کەسانەی بیستوە کە ناپاکی هاوسەریان کردووە.کەچی دەرس و عیبرەتی لیْ وەرناگرن، کەواتە وەکو گوێیان نەبیْ وایە! ئەوانە لە ئاژەلْ نزمترن. چونکە ئاژەڵەکانیش زۆربەیان پاك داوێنن و تەنها لەگەلْ هاوسەری خۆیدا جوت دەبیْ و ناچیْ بۆ یەکێکی تر.

زانایان فەرموویانە: (الغَفْلَةُ هِيَ الإِنْغِماس في شَهَواتِ الدُّنيا، وَنِسيانِ الآخرة). غەفلەت نقوم بوون و ڕۆچونە لە شەهوەتو

ئارەزووی دونیایی و لەبیرکردنی دوارِۆژ و قیامەت و لێپرسینەوەی کردوەکانە لەلایەن خوای پەروەردگارەوە.



## بەڵاو نەهامەتیەکانی خیانەتی هاوسەری:

### یەکەم: خیانەت و ناپاکی یە لەخۆی..

هەر کەسێك هاوسەری حەلاڵی شەرعی خۆی هەبێت، لە ژن و لە پیاو، بەڵام بیەوێ لە ڕێگەی ناشەرعیەوە ئارەزووەکانی سێکسی خۆی جێبەجێ بکات. وە خیانەت لە هاوسەرەکەی بکات. ئەوە باش بزانێ یەکەم خیانەتی لە خۆی کردووە، لەبەرئەوەی ئەو کەسە بەردەوام هەست دەکات کەکەم و کورِیەکی هەیە، متمانەی بە کەس نیە. تەنانەت بڕوا و متمانەی بە خۆشی نیە، وای لێدێ گومانی لە هەموو کەس هەیە. چونکە خۆی ناپاکی کردووە وادەزانێ ئەو خەڵکەش هەمووی ناپاکن.

جا هەرکات مرۆڤ وای لێهات متمانەی بە کەس نەما ئەوا بەردەوام لە دڵەڕاوکێدا دەژی، خۆی خودی خۆی بەلاوە سوك و بێ نرخە، ئەگەرچی لەناو خەڵك و کۆمەڵگەدا زۆر ناوداربێ، پایەدار و پلەدار بێ، بەڵام ئەم خۆی نەفرەت لە خۆی دەکات و خودی خۆی زۆر بەلاوە بێ قەدر و نرخە..

**دووەم: ناپاکی هاوسەری خیانەتە لەو متمانەیەی کە هاوسەرەکەی پێیەتی..**

چەند تاوانە، چەند خیانەتێکی گەورەیە کاتێ ژنێك خیانەت و ناپاکی لەو مێردەی دەکات، کە کلیلی ماڵەکەی داوەتە دەست، ژنەکەی بە جێگای متمانەی پاراستنی ناموس و حورمەت و ماڵ و دارایی و منداڵی داناوە، ئەمینداریەتی، ئەو چۆتە دەرەوە نانێکی حەڵاڵیان بۆ بێنێتەوە، کەچی ژنەکەی کەسێکی ناپاك بێنێتە ماڵەوە و ناپاکی لەگەڵ بکات..

یان بە پێچەوانەوە، چەندە تاوانێکی قیزەون و گەورەیە و شایانی سزای توندە، ئەو پیاوەی کە ژنەکەی تا دەرگای ماڵەکەی بەدوعای خێر و خوا ئاگادارت بێ بەڕێی دەکات، وا ئەزانێ مێردەکەی بۆ کاروکەسابەت و پەیداکردنی بژێوی ژیانی ئەوان چۆتە دەرەوە کەچی بە پێچەوانەوە، ئەم پیاوە لەجیاتی کاروکەسابەت، لەجیاتی بەسەرکردنەوەی خزم و خۆشەویستان، لەجیاتی تۆمارکردنی مەردایەتی و ئەنجامدانی کاری پیاوانە و مەردانە و جوامێرانە، کەببێتە سەربەرزی بۆخۆی و ژن و منداڵەکانی، بڕوات لەگەڵ ئافرەتێکی بەد کرداردا دەست تێکەڵ بکات و خەریکی زینا بێ، باشە شەو چۆن ڕووی دێ بێتەوە بۆلای هاوسەرێك کە ئەوپەڕی متمانەی پێ بەخشیوە و لەکاتی چونە

دەرەوەی لە ماڵ چاودێری و موراقەبەی نەخستۆتە سەر، چونکە مێردەکەی خۆی بە پیاوێکی پاك و مەرد ناسیوە، ئیتر چۆن ئەم پیاوە ویژدانی زیندوبێ و ئەم کارە دەکات؟!.

## سێهەم: ناپاکی هاوسەری خیانەتە لەکەسوکاری یەکدی..

خیانەتە لەو خەزور و خەسوەی کچەکەیان بە ئەمانەت دا بەتۆ. لەبەرئەوە لەکاتی ژن مارەبریندا. باوکی کچ ئەو کچەی خۆی دەدات بەو کورەی کە دەبێتە زاوای و پێی دەڵێ: کوڕی خۆم ئەم کچە ئەمانەتی خوایە بەخشیویەتی بە ئێمە تا ئەم ساتە بەڕێز و قەدرەوە پاراستومانە، ئێستا بە شەرعی خوا ئەو ئامانەتە تەسلیمی دەستی تۆ دەکەم. تکایە ئاگاداری ئەم ئامانەتە بە، خیانەتی لێمەکە. کوڕەکەش بەڵێن دەدات کە ئەو ئامانەتە کە بەشەرعی خوا بۆتە حەڵاڵی بیپارێزێ، جا پەنا بەخوا کاتێ کە ئەو پیاوە ناپاکی هاوسەری کرد، ئەوە خیانەتی کردووە لەو بەڵێنەی کەبە خەزور و خەسوی داوە، وە خیانەتی لە ئەمانەت کردووە.

## چوارەم: ناپاکی هاوسەری خیانەتە لەکۆمەڵگا..

(الخِيانَة الزَّوْجِيَّة) خیانەتە لە کۆمەڵگا، چونکە هەر کۆمەڵگایەك داوێن پیسی و خیانەتی هاوسەری تێدا بڵاوبۆوە،

سەرەنجام نەخۆشی (ئایدز) و چەند نەخۆشی زۆر سامناك و لەناویەری تێدا بڵاودەبێتەوە، بەمەش کۆمەڵگا هەڵدەوەشێت..
ئێمە ئەگەر سەرنجی کوردستانی خۆمان بدەین، ساڵانی هەشتاکان و نەوەدەکانیش، تاوەکو خەڵکی بیانی نەهاتبوە وڵاتمان، بەشێوەی ئێستا و گەنجانمان سەفەری وڵاتانێکیان نەدەکرد کە داوێن پیسی بە ئاشکرا و ئازاد تێدا دەکریٚ..

بزانە ئەو کاتە کۆمەڵگای کوردی ئەوەندە پاك بوو، کاتیٚ کەسێك پێویستی بە خوێن بوو لە نەخۆشخانەیەکدا، هەر یەکسەر جۆری خوێنی خوێن وەرگر و خوێن بەخش دیاری دەکرا و ئەگەر بۆیەك ببونایە گەرما و گەرم لەم وەردەگیرا و دەکرایە لاشەی ئەمەوە. فەحصی چی و پشکنینی چی!!

چونکە کۆمەڵگەی کوردی پاك بوو، تەنها یەك ئایدزیش لە کوردستان تۆمارنەکرابوو.. بەڵام ئێستا نەخۆشەکە لە سەرەمەرگدا بیٚ، دەبیٚ چەندین پشکنین لە تاقیگەدا بۆ ئەو خوێنە بکرێت نەوەکو کەسی خوێن بەخش هەڵگری ئایدز و نەخۆشیەکانی تر بێت کە لەداوێن پیسیەوە مرۆڤی تر توش دەبێت. هیچ کات ئەم کوردستانە پاکە یەك نەخۆشی ئایدزی تێدا نەبووە کەچی ئێستا بە پێی راپۆرتی وەزارەتی تەندروستی چەند حاڵەتی ئایدز لە کوردستاندا تۆمار کراوە، بەداخەوە!

جاران ئەو خەڵکە ڕۆژانە لەم وڵات ئەچوو بۆ ئەو وڵات. چونکە خیانەتی هاوسەریان نەبووە، یان زۆر دەگمەن بووە، یان کەسەکە خۆی تەسلیمی حوکمی شەرع کردووە و پاك بۆتەوە، ئەو هەموو خەڵکە لەم سنوری وڵاتە چونە سنوری ئەو وڵاتە هیچ پشکنینی خوێن و جەستە نەبووە، بەڵام ئێستا کەسێك لە فڕۆکەخانەی وڵاتێکی تر دابەزێ کە بێگانە بێ بەو وڵاتە و گومانی ئایدزی لێ بکرێ. دەبێ هەموو پشکنینەکانی بۆ بکرێ، نەوەکو هەڵگری ڤایرۆسی ئایدزبێ و لە ڕێگەی ئەمەوە بێتە وڵاتەوە!

ئەم هەموو ترس و دڵەڕاوکێ و مەشغوڵی بۆ دکتۆر و تاقیگە و فڕۆکەخانەو نەخۆش و خوێن وەرگر.. بەهۆی بەلا و خیانەتی ناپاکی هاوسەری و زیناوە.

## داوێن پاکان ئامادەن گیانی خۆیان لە دەست بدەن و خیانەت نەکەن!

بەسەرهات

نوسەری ناودار، لیوا ڕوکن (محمود شیت خطاب) لە کتێبی (عَدالَةُ السَّماء) دا، باسی ئەم ڕووداوە دەکات و دەفەرمووێ:

نزیکەی پێش چل ساڵ لەمەوبەر ـ بەو کاتەی کە ئەو ئەم بەسەرهاتەی نوسیوەتەوە ـ لەشاری (بەغداد) پیاوێك قەسابی دەکرد و گۆشتی دەفرۆشت، لەپێش نوێژی بەیانیدا دەچوو بەرەو دوکانەکەی و مەڕەکانی سەردەبڕی و کەوڵی دەکردن و هەڵی

دەواسین و ئامادەی دەکردن بۆ فرۆشتن، پاشان دەگەڕایەوە بەرەو ماڵەوە.. ئەمجا دوای ئەوەی کە خەڵکی لەخەو هەڵدەستان و دەچوونە بازاڕ و وەختی گۆشت کڕین دەهات، ئەمیش دوکانەکەی دەکردەوە بۆئەوەی گۆشتەکان بفرۆشێ.

شەوێك لە شەوەکان دوای ئەوەی ئاژەڵەکانی سەربڕی و لە تاریکی شەودا گەڕایەوە بەرەو ماڵەوە، جل و بەرگەکانی خوێناوی ببون، لە نێوان ڕێگەکەدا و لە یەکێك لە کۆڵانەکاندا گوێی لە هاوار هاوار بوو، ئەمیش بەپەلە بەرەو لای هاوارەکە چوو، لەپڕکەوت بەسەر لاشەی پیاوێکدا، کە چەندان لێدانی چەقۆی پێوە بوو، خوێنی لەبەر دەڕۆی.. چەقۆی ئەم پیاوە (قەسابەکە) کەوتە سەر لاشەکە. چەقۆکەی هەڵگرتەوە و هەوڵیدا پیاوە بریندارەکە هەڵبگرێت و یارمەتی بدات. بەڵام بریندارەکە مرد و جل و بەرگی گۆشت فرۆشەکەش بە خوێنی بریندارەکە سور بوو!

لە پڕ خەڵکی کۆبونەوە.. کاتێك چەقۆکەیان بە دەستەوە بینی و بینیان جل و بەرگەکانی خوێنیان پێوەیە.. ئەم پیاوە زۆر ترسا و شڵەژا، تۆمەتباریان کرد بە کوشتنی کوژراوەکە..

پاشان بڕیاری کوشتنەوەی بەسەردا درا، کاتێك ئامادەکرا لە گۆڕەپانێکدا بۆئەوەی بیکوژنەوە و دڵنیابوو کە دەیکوژنەوە، هاواری بۆ خەڵکەکە کرد و وتی: ئەی خەڵکینە، سوێند بە خوا من

ئەو پیاوەم نەکوشتووە، بەلاّم بیست ساڵ پێش ئێستا کەسێکی ترم کوشتوە. ئەوەتا ئێستا لە تۆڵەیدا دەکوژرێمەوە..

پاشان وتی: ئەو کاتە من گەنج بووم لەمبەر و ئەوبەری ڕووباری دیجلەدا خەڵکم دەپەڕاندەوە.. ڕۆژێك لە ڕۆژان ئافرەتێکی دەوڵەمەند لەگەڵ دایکیدا هات و منیش پەڕاندمنەوە، پاشان بۆ ڕۆژی دوایی هاتنەوە و لە نزیکمەوە سواربوون. لەگەڵ تێپەڕینی ڕۆژگاردا دڵم وابەستە و شەیدای ئەو کچە بوو، ئەویش بەهەمان شێوە، داخوازیم لە باوکی کرد، بەلاّم لەبەر هەژاریم ڕازی نەبوو، دوای ئەوە پەیوەندیمان بەیەکەوە پچڕا، نەخۆی و نەدایکیم نەبینیەوە..

بەلاّم من هەر دڵم لەلای ئەو کچە بوو، دوای دوو سێ ساڵ لەبەلەمەکەمدا چاوەڕێی نەفەرم دەکرد، ئافرەتێك لەگەڵ منداڵە ساواکەیدا هاتن بۆ لام، داوای لێکردم کە بیان پەڕێنمەوە، کاتێك سەرکەوتن و گەیشتینە ناوەڕاستی ڕووبارەکە، سەیریم کرد، زانیم کچەکەی پێشووە، ئەو کچەی کە باوکی لەیەکی جیاکردینەوە. بە بینینەوەی زۆر دڵخۆشبووم. سەرەتا باسی ئەو پەیمانەم بۆ کرد کە بەیەکمان دابوو، هەروەها باسی خۆشەویستی خۆمم بۆ کرد. بەلاّم ئەو زۆر بەڕێز و شەرمەوە دەدوا و هەوڵی پێدام کە شووی کردووە و ئەمەش منداڵی خۆیەتی!

پاشان شەیتان تاوان و گوناه و دەستدرێژی کردنە سەر ئەو ئافرەتە بەستەزمانەی بۆ ڕازاندمەوە.. لێی نزیك بوومەوە، هاواری لێکردم خوای بیرخستمەوە، بەڵام من گوێم لێ نەگرت، ئەو بەستەزمانە بە پێی توانا پارێزگاری لە خۆی دەکرد. منداڵەکەش هەر هاواری دەکرد، منداڵەکەم لە دەست سەند و لە ئاوەکەم نزیك کردەوە و پێم وت: ئەگەر ملکەچم نەبیت، منداڵەکەت لە ئاوەکەدا نقوم دەکەم.. زۆر گریا و لێم پاڕایەوە.. بەڵام من زۆر بە دڵ ڕەقی گوێم لێ نەگرت و ئاوڕیشم لێ نەدایەوە، سەری منداڵەکەم دەخستە ئاوەکەوە، تا بە تەواوی لە مردن نزیك دەبۆوە و پاشان دەرم دەهێنا، ئافرەتەکەش سەیری دەکردم و هەر دەگریا و داوای یارمەتی لێدەکردم.. بەڵام سوربوو لەسەر ڕەد کردنەوەی داواکەم! ئەمجارەش سەری منداڵەکەم لە ئاوەکەدا نقوم کردەوە و خەریك بوو بە تەواوی بخنکێت..

دایکیشی هەر سەیری دەکرد و لەتاو منداڵەکەی چاوی دادەخست. منداڵەکەش هەر دەست و قاچی دەجوڵاند، هەتا هێزی تیانەما و لە جوڵە کەوت و خنکا.. بە مردووی لە ئاوەکە دەرم هێنا و پاشان فڕێم دایە ناو ئاوەکەوە!!

لە ئافرەتەکە نزیك بوومەوە و لێی چومە پێشەوە، بەهەموو هێز و توانایەوە بەرەنگارم بۆوە و پاڵی پێوە نام. بەڵام من بە قژی ڕامکێشا و لە ئاوەکەم نزیك کردەوە و سەریم خستە ئاوەکەوە و

پاشان دەرم هێنا، بەلاّم ئەو ئافرەتە سوربوو لەسەر ئەنجام نەدانی کاری ناشایستە و ناپاکی هاوسەری!! کاتێك دەستەکانم هیلاکبوون، سەریم لە ئاوەکەدا نقوم کرد، هەتا جوڵەی تێدا نەما و گیانی سپارد. ئەویشم فڕێدایە ئاوەکەوە و پاشان گەڕامەوە و هیچ کەسیش بەتاوانە چەپەڵەکەمی نەزانی، پاك و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی کە مۆڵەت دەدات. بەلاّم کەس پشت گوێ ناخات..

کاتێك خەڵکەکە گوێیان لەم ڕووداوە بوو، هەموو دەستیان کرد بە گریان.

دەی با لە حاڵی ئەو ئافرەتە پاك داوێن و ڕەوشت بەرزە وردبینەوە، ئەو ئافرەتەی لە بەرچاویدا جگەر گۆشەکەی کوژرا. پاشان خۆشیان کوشت، بەلاّم ئامادە نەبوو ئابڕوی خۆی لەکەدار بکات، ئامادەنەبوو خیانەت بە هاوسەرەکەی بکات.

(ئەوەیە شاژن، د. محمد العریفی، و: هێمن محمد علی ل٢٢٧)



## چارەسەری ناپاکی هاوسەری:

پرسیار: چۆن چارەسەری ناپاکی خێزانی دەکرێت لە ڕوانگەی ئیسلامەوە؟.

وەڵام: بۆ چارەسەری ئەم نەخۆشیە دەرونی و کۆمەڵایەتی و ئاکارییە ئەم چەند خاڵە پێویستە جێبەجێ بکرێن و کاریان پێ بکرێت:

## یەکەم: ناساندنی ئەم کردارە وەك تاوان:

تاوانێك کە دژەلەگەڵ کەسیەتی مرۆڤ و بەها باڵاکانی ژیانی مرۆڤایەتی، قورئان زۆر گرنگی بەم لایەنە داوە. دەیەوێ ئەم هەستە وەك قەناعەتێك لەناخی تاکەکاندا دروست بکات و دەفەرمووێ: ﴿وَلَا تَقْرَبُوا الزِّنَىٰٓ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَسَآءَ سَبِيلًا ﴿٣٢﴾﴾ الإسراء.

لێرەدا دوو دەستەواژە بەکاردەهێنێ ﴿فَٰحِشَةً﴾ لەگەڵ ﴿وَسَآءَ سَبِيلًا﴾.

یەکەمیان: ﴿فَٰحِشَةً﴾ ئاماژەیە بەوەی کە هۆکاری بەدکرداری یە و ژێرخانی ئەخلاقی دەڕمێنێ چونکە ووشەی (فَحش) بڵاوکردنەوە و تەشەنە سەندنی کارێکە لە ڕێگەی دەنگۆوە پاشان کردار.

دووەمیان: ﴿وَسَآءَ سَبِيلاً﴾ ئاماژەیە بەوەی کە وزەی جنسی وزەیەکی مرۆییە، بەرهەمدارە و مرۆڤ بەرامبەری بە پرسە لەکوێدا و لە چ ڕێگەیەکەوە خەرجی دەکات. بۆیە خەرجکردنی لە ڕێگەی داوێن پیسی یەوە خراپترین ڕێگەیە بۆ بەکارهێنانی ئەم ووزەیە.

## دووەم: یاسای (سَدُّ الزَّرائِعِ) بەرگرتن لە ئامرازەکان:

ئەمەش یاسایەکی بە پێز و بەهێزی ئەم بوارەیە و ئیسلام لە زۆر شوێندا کاری پێ دەکات. هەر جۆرە ئامراز و هۆکارێك سەربکێشێ بۆ سادەکردنی ئەم جۆرە کردارانە بە ناڕەوا و نادروست دەزانێ و قەدەغەی دەکات. وەك: (قەدەغەکردنی زیاد لە پێویست لە نێوانی نێر و مێدا، سەیرکردنی نادروستی یەکتر، کۆبونەوەی هەردوو ڕەگەز لە شوێنێکی چۆڵدا بەبێ بوونی کەسی سێهەم، هەروەها خۆ ڕازاندنەوەی ئافرەت لە دەرەوەی ماڵ و دەرنەخستنی جوانی ئافرەت بۆ پیاوانی نامەحرەم و قەدەغەکردنی سفوری لە ڕەگەزی مێ دا، قەدەغەکردنی تەماشاکردنی فیلم و کەناڵێك کە ئارەزووی مرۆڤ بوروژێنێ بۆ زینا..) کە هەموو ئەمانە بۆ ڕێگرتنە لە ئاسانکاری بۆ دروست بوونی ئەم جۆرە کردارانە، کە کەسایەتی خێزان پیس دەکەن. قورئان دەفەرمووێ:

(ئەی پێغەمبەر ﷺ بە ئیماندارانی گەنج و پیاو ڕابگەیەنە کە باچاویان بپارێزن لە تەماشای حەرام و خۆیان بپارێزن لە گوناه و بەدووربن لە شەڕواڵ پیسی، ئەو شێوازە چاك و پاك و پوختە بۆیان. چونکە بەڕاستی خوای گەورە تەواو ئاگادارە بە هەموو کار و کردەوە و هەڵسوکەوتیان..

هەروەها بە ئیماندارانی ئافرەتیش بڵێ (بە تایبەت تازە پێگەشتوان و ئەوانەی کە نەچونەتە ساڵەوە) با ئەوانیش چاویان بپارێزن لە تەماشای حەرام و خۆیان بپارێزن لەداوێن پیسی، هەروەها جوانی خۆیان دەرنەخەن جگە لەوەی کە شەرع ڕێگەی بە دەرخستنی داوە، کە بریتیە لە دەم و چاو و دەستیان، وە با بە سەر پۆشەکانیان سنگ و بەرۆکی خۆیان داپۆشن، باجوانی خۆیان دەرنەخەن بۆ کەسانی نامەحرەم جگە لە هاوسەریان، یان باوکی خۆیان، یان باوکی هاوسەرەکەیان و باپیری هاوسەرەکەیان، یان بۆ کوڕی خۆیان و کوڕی هاوسەرەکەیان (کە لە ژنێکی ترن).. هەتا لە کۆتاییدا دەفەرمووێ: هەروەها دەبێ ژنان لە کاتی ڕۆشتنیاندا پێ نەکوتن بە زەویدا، تا دەنگی خشڵ و زێڕەکانیان سەرنجی هەرزەکاران ڕانەکێشێت و بە جوانیە شاراوەکانیان نەزانن) النور: ٣٠ — ٣١.

هەتا شێوازی ئاخاوتن و ووشەکان کە لە زارەوە دەردەچن دەبێ لە سکێچی سروشتی خۆی دەرنەچێ، هەتا نەبێتە هۆکاری لێك نزیکبونەوە، قورئان دەفەرمووێ: ﴿فَلَا تَخْضَعْنَ بِٱلْقَوْلِ فَيَطْمَعَ ٱلَّذِى فِى قَلْبِهِۦ مَرَضٌ وَقُلْنَ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴿٣٢﴾﴾ الأحزاب.

واتە: گفتوگۆ بە ناسکی مەکەن، دەنگتان لە کاتی قسەکردن لەگەڵ پیاوی نامەحرەم ناسك مەکەنەوە، ووشەی وروژێنەر و هەست بزوێن بەرامبەریان لەکارمەهێنن بە کاتی گفتوگۆدا، تائەو کەسەی دڵی نەخۆی باوەڕ لاوازی تێدایە، خەتەرە و خەیاڵی خراپ نەیەت بەدڵ و دەروونیدا، هەمیشە و بەردەوام هەوڵبدەن قسە و گوفتاری چاك بڵێن، تاهیچ کەس نەتوانێ ڕەخنەتان لێ بگرێت..

بەڵێ، ئەگەر ئافرەتێك هەرچەند لە دەروونێکی پاکەوە بە کوڕێك یان پیاوێك کە ناخی بۆگەنە و حەز و ئارەزووی لە داوێن پیسییە و عەوداڵی بێ ڕەوشتیە، بڵێ: (بە قوربانت بم) یەکسەر ئەو پیاوە دڵ نەخۆشە واهەست دەکات کە حەزی لێدەکات و ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی پیلانی گلاوی بۆ دابنێ کە لێی نزیك ببێتەوە و سەرەنجام ناوی ئافرەتە پاکەکە بزڕێ! !

هەر لەبەر ئەمەیە کە ئافرەت بە ئازادی و سەربەستی بمێنێتەوە و ئەمانەی لێ قەدەغە دەکات نەك وەکو دوور لە دینەکان دەڵێن ئیسلام ئافرەتی کۆت و بەند کردووە!

**سێهەم: ئاسان کردنی ڕێکخستنی شوو کردن و ژنهێنان:**

دروستکردنی خێزان و ژیانی هاوسەرگیری بۆ کچان و کوڕان، ئەمەش ئەرکی تاکە و پاشان کۆمەڵگە و پاشان دەوڵەت. بە هەرسێکیان دەبێ هەنگاو بنێین بۆ ئاسانکاری، قورئان دەفەرمووێ: ﴿وَأَنكِحُوا۟ ٱلْأَيَـٰمَىٰ مِنكُمْ وَٱلصَّـٰلِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَآئِكُمْ ۚ إِن يَكُونُوا۟ فُقَرَآءَ يُغْنِهِمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٣٢﴾﴾ النور.

واتە: ئەی گرۆی ئیمانداران، ئەی کاربەدەست و دەست ڕۆشتوان، هەوڵبدەن کاری هاوسەرگیر بۆ ئافرەتانی بێ کەس و بێ داڵدە و بێ هاوسەر ڕێکبخەن، هەروەها خەمی لاوان و پیاوانی بێ هاوسەریش بخۆن..

بەڵێ ئەگەر هەرسێ لا: تاکەکات و خێزانەکان و دەوڵەت، هەڵمەتی بە ئەنجام گەیاندنی پرۆسەی پیرۆزی هاوسەگیری بۆ گەنج و لاوان ئەنجام بدەن، زۆر گرفت چارەسەر دەبێت. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (**خَيْرُ النِّكاحِ أَيْسَرُهُ**) رَواهُ أَبو داود: (٢١١٧) صَحيحٌ.

وە دەفەرمووێ: (**إِنَّ مِنْ يُمْنِ المَرْأَةِ تَيسيرُ خِطْبَتِها وَ تَيسيرُ صَداقِها، وَ تَيسيرُ رَحَمِها**) رَواهُ أَحمد. واتە: نیشانەی بەرەکەت و

بەفەڕی ئافرەتان ئەوەیە کە خوازبێنی کردنیان ئاسان بێت و مارەیی ئاسان بێت و منداڵبوونی ئاسان بێت..

ئەم فەرموودەیە: گوتارێکە ڕوو لە تاك دەکات، بە تایبەت ئافرەت کە خوازبێنی هات ئاسانکاری بکات و داوای مارەیی کەم بکات و داوای شەکراو خواردنەوەی قورس نەکات.

پاشان وەك کۆمەڵگەش: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (**إذا أَتاكُمْ مَنْ تَرْضَوْنَ خُلُقَهُ وَ دينَهُ فَزَوِّجُوهُ، إن لا تَفْعَلوُا تَكُنْ فِتْنَةٌ في الأَرْضِ وَ فَسادٌ عَريض**) رواهُ الترمذي: (١٠٨٤).

کە داوا لە خێزان دەکات هەر کات خوازبێنی کچیان لێ کرا تەماشای دوو شتی کوڕەکە بکەن ڕەوشت و ئاینی، ئیتر بەمەندە ڕازی بن و ئاسانکاری بکەن و بەداوای زۆر کارەکە قورس نەکەن. وەك دەوڵەتیش: پێغەمبەری خوا ﷺ کەل و پەلی بوکێنی فاتمەی کچی سازکرد، پێشەوا عەلی دەفەرمووێ:

(**لَقَدْ تَزَوَّجْتُ فاطِمَةَ وَمالي وَلَها إلاّ جِلْدَ كَبْشٍ ننام عليه باللَّيْلِ وَ نعلف عليه الناضِحَ النَّهارِ**).

واتە: ژیانی هاوسەرگیریمان پێکهێنا لەگەڵ فاطمە، من و ئەو هیچمان نەبوو، تەنها چەرمە مەڕێك نەبێ بەشەو لەسەری دەخەوتین و بەڕۆژیش ووشترەکەمان پێ تێر دەکرد..

کەواتە: پێویستە لەسەر دەوڵەت کە تەواوی ئاسانکاری بۆ کوڕ و کچانی لاو بکات بۆ هاوسەرگیری لە ڕێگەی پێدانی پێشینەی هاوسەرگیری و دابین کردنی شوێنی نیشتەجێبوون.

## چوارەم: کەمتەرخەمی نەکردن لە مومارەسەی کاری جنسی لە نێوانی هاوسەرە شەرعیەکاندا:

دەبێ چ پیاوان، چ ئافرەتان لە ژیانی هاوسەریاندا، ئەم لایەنە فەرامۆش نەکەن، چونکە فاکتەری سەرەکی هاوسەرگیری ئەم لایەنەیە. هەر بۆیە قورئان ووشەی (ناشز) بۆ پیاو و (ناشزة) بۆ ئافرەت بەکاردێنێ. چونکە هەردووکیان تەنها بە کەمتەرخەمی لەم لایەنەوە ئەو سیفەتە وەردەگرن. واتە کاتێ دەڵێن (ناشیزة) بەو پیاو و ئافرەتە دەوترێ کە ڕێگری لە کاری سێکسی دەکەن و یەکتری بە تەواوەتی تێر ناکەن.

هەروەکو لە سورەتی (النِّساء) ئایەتی (٣٤) و ئایەتی (١٢٨)دا هاتووە.

هەر لەم سۆنگەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (إذا دَعا الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ إلى فِراشِهِ فأَبَتْ أَنْ تَجيءَ، لَعَنَتْها الملائِكَة حَتَّى تُصْبِحَ). رَواهُ البُخاريُّ: (٥١٩٣).

واتە: ئەگەر پیاوێك داوای لە خێزانەکەی کرد بۆ سەر جێی و ئەنجام دانی کاری جنسی، ئەویش نەهات ـ بەبێ بوونی عوزری شەرعی ـ یان بەبێ ئەوەی مێردەکەی پێشتر ئازارێکی دابێ، قسەیەکی سوکایەتی پێ کردبێ، یان پێشتر ئەو لەگەڵی نەخەوتبێ ـ بەڵام ژنەکەی بەناهەق لارە ملی کرد و نەچوو لەگەڵیا بخەوێت، هەتا بەیانی فریشتەکان نەفرەتی لێدەکەن. هەروەها بە پێچەوانەشەوە، ئەگەر ئافرەتەکەش داوای کرد و پیاوەکە نەچوو بەلایەوە و لەگەڵی جوت نەبوو، ئەو پیاوەش دەکەوێتە بەردەم هەمان نەفرەت.

هەر لەبەر گرنگی ئەم بابەتە کە لە ئیسلامدا، جوت بوون لەگەڵ مێرد و بەدەمەوە چوونی داوا شەرعیەکانی بۆ ژن لە ڕۆژووی سوننەت لە پێشترە. وەکو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (**لا تَصُومُ المَرْأَةُ وَبَعْلُها شاهِدٌ إلاّ بِإذنِه**) رَواهُ البُخاريُّ: (٥١٩٢).

## ڕاستیەکی زانستی:

پێویستە پیاو لە کاتی جوت بوون لەگەڵ خێزانەکەی مافی هاوسەری بدات و مەنیەکەی خۆی لەدەرەوە نەڕێژێت و کۆندۆم بەکار نەهێنێت، پزیشکەکان دەڵێن: کۆندۆم لە ماددەیەکی لاستیکی دروست کراوە و لەلایەن پیاوانەوە بە مەبەستی ڕێگریکردن لە منداڵبوون بەکاردەهێنرێت، بەڵام هۆکارێکی

سەرەکیە بۆ ئەوەی ئافرەت توشی دڵەڕاوکێ و نەخۆشیەکانی خەمۆکی ببێت، خۆکارێکیشە بۆ هەڵوەرینی قژ و نەخۆشی وەرەمی جومگەکان، لەبەرئەوەی ئەو کۆندۆمە، دەبێتە پەردەیەك لە نێوان ئەندامی نێرینە و ئەندامی مێیینە و ناهێڵێت ئەو شلەی کە لە منداڵدانی ژندا هەیە تێکەڵ ببێت لەگەڵ شلەی توخمی پیاو و هەڵی بمژێت و لە ڕێگەی دیوارەکانی منداڵدان بیگوازێتەوە بۆناو خوێن و لە وێشەوە بۆ مێشك. لەبەرئەوەی ئەو شلە کە پیاو دەری دەکات لە کاتی جوتبوندا سودی زۆری بۆ نەهێشتنی دڵەڕاوکێی ژن هەیە و وادەکات کە ژنەکە هەست بە ئارامی دەرونی بکات.

(میدیا، ژ: ٥٥٦، ٢٠/١٠/٢٠١٢)



## ئەگەر کەسێك بۆی ئاشکرا بوو کە هاوسەرەکەی ناپاکی کردووە..

ناپاکی هاوسەری سەلماندنی زۆر قورسە. چونکە ئەگەر بە شایەت بێت، دەبێت چوار کەس شایەتی بدەن کە بەچاوی خۆیان بینیویانە ئەو پیاوە یان ئەو ژنە هاوسەرداره لەگەڵ کەسێکی غەیری هاوسەرەکەی خۆیدا کاری سێکسی ئەنجامداوە. زانایانی ئیسلام بە مەرجیان گرتووە لە شایەتیدا ناپاکی هاوسەری و زینا بە گشتی دا. دەبێ ئەم چەند خاڵە بەرچاو بگیرێ:

یەکەم: دەبێ چوار شایەت بن، ئەگەر لە چوار کەمتربن قبوڵ ناکرێن و بە بوختانچی دادەنرێن و دەبێ سزا بدرێن. چونکە ئەصلَ وایە ئەو ئافرەتەی سێ کەس شایەتی لەسەر دەدەن کە بینیویانە زینای کردووە، پاك بێ و ئەم سێ شایەتە درۆ بکەن. ئەمەش دەقی ئایەتی قورئانی لەسەرە کە دەفەرمووێ: ﴿وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَأۡتُواْ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجۡلِدُوهُمۡ ثَمَٰنِينَ جَلۡدَةً﴾ النور.

واتە: ئەو کەسانەی بوختان دەکەن بۆ ئافرەتانی داوێن پاك، ئینجا نایشتوانن چوار شایەت لەسەر دیتنی ئەو حاڵەتی زینایە پەیدا بکەن، ئەوا هەریەکە لەوانیش هەشتا جەڵدە و شەلاقیان لێبدەن..

(ئەم سزایەش بۆئەوەی هیچ دەم بەتاڵێك لەخۆوە بوختان نەکات، یاخود گەر شایەتەکان لە چوار کەس کەمتربوون، یا ڕاستگۆشبن، شایەتیەکەیان لێ وەرناگیرێ و بە بوختان دەدرێتە قەڵەم و دەبێ شەلاقیان لێ بدرێت. هەروەکو حەزرەتی عومەر وای کرد)

هەروەها هەمان ڕاستی لە ئایەتی (١٥) سورەتی (النِّساء) و ئایەتی (١٣) سورەتی (النُّور) داهەیە.

دووەم: دەبێ ئەو چوار شایەتە پیاو بن.

سێهەم: دەبێ شایەتەکان ئازادبن و کۆیلە نەبن.

چوارەم: پێویستە هەر چوار شایەتەکە دادپەروەربن و فاسق و بوختانچی و ڕابردوو پیس و دەم پیس نەبن و لە ڕابردوودا بە کەسی خراپ و بوختانچی نەناسرابن.

پێنجەم: دەبێ مسوڵمان بن چونکە ئایەتەکە فەرمووی: ﴿مِنْكُم﴾ لە خۆتان ئەی مسوڵمانان.

شەشەم: کە خاڵێکی زۆر گرنگ و جەوهەریە ئەوەیە کە دەبێ بێ پێچ و پەنا وەصفی حاڵەتی زیناکە بکەن و بڵێن: بە چاوی خۆمان بینیمان زەکەری لەناو دامێنی ئافرەتەکەدا بوو.

شیخ إبْنُ العُثَيمين لە کتێبەکەیدا: (الشرح الممتع ج١١ ص١٤٢) دەفەرمووێ:

ئەگەر شایەتەکان وتیان ئەو ژن و پیاوەمان بەڕوتی بەبێ جل و بەرگ لە باوەشی یەکتردا بینی، ئەوە بەشایەتی قبوڵ ناکرێ. تەنانەت ئەگەر هەر چوار شایەتەکەش وتیان: شایەتی دەدەین کە بە چاوی خۆمان بینیمان ژن و مێرد چی بەیەکەوە دەکەن، ئەو ژن و پیاوە ئاوایان بەیەکەوە دەکرد، هەر لێیان قبوڵ ناکرێ. بەڵکو پێویستە بێ پەردە باسی بکەن و لە شایەتی دانەکەیاندا بڵێن: شایەتی دەدەین کە ئەندامی نێرینەی ئەو پیاوە لە ناو ئەندامی زاوزێی ئەو ژنەدا نقوم ببوو! کە ئەمەش بەڕاستی بینینی قورس و گرانە.

پاشان (شیخ إبْنُ العُثَیمین) دەفەرمووێ: کاتی خۆی لەسەردەمی خۆیدا ـ الشَیخُ الإِسلام ـ إِبنُ تَیمِیَّة ـ باسی کردووە کە لە سەردەمی پێغەمبەرەوە ﷺ ـ هەتا ئێستا ـ سەردەمی الشَیخُ الإِسلام ـ هیچ زینایەك لە ڕێگەی شایەتی چوار پیاوی دادگەری موسڵمانەوە ئاشکرا نەبووە. کەلەدوای ئەوە و لەم سەردەمەشدا زۆر گران و زەحمەتە کە زینا بەشایەتی دانی چوار شاهید ئاشکرا ببێ.

(رَوْضَة المُتَنَزِّه ـ ج٣ ص٣٩١)

<u>تێبینیەکی گرنگ:</u> ئەگەر ژنێك یان پیاوێك شەیتان و نەفس فریویدا و توشی ئەوەبوو کەلەگەڵ کەسێکی بێگانەدا ـ غەیری هاوسەری خۆی ـ لەیەك نزیك بوونەوەیەك ڕوویدا.. پاشان بەردەوام نەبوو لەسەری و تەوبەی کرد و کارەکەش نەگەشتبووە زیناکردن، تەنها یەکتر بینین و دەست لە دەست دان و ماچکردن بوو. ئەوە ئەگەر هاوسەرەکەی پێی بزانێ، وە یەقینی هەبوو کە تەوبەی کردووە و وازی لەم کارە هێناوە، وە نەگەشتۆتە زیناکردن، ئەوە بەڕاستی گەورەیی دەنوێنێ و کارێکی چاك دەکات کەلە هاوسەرەکەی ببورێ و وەکو خوای گەورە بەتەوبە لێی خۆش بوە، ئەمیش لێی ببورێ و لەسەر ئەمە لەیەکتری جیانەبنەوە و ئەم کارە نەکەنە مایەی ڕووخاندنی قەلاّ و کۆشکی هاوسەرییان..

## هەموو شتێکم کرد، جگە لەزینا..

فەرموودەیەك: ئیبن مەسعود دەفەرمووێ: پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا: (**إِنِّي لَقيتُ إِمْرَأَةً، فَأَصْبَحْتُ مِنْها كُلَّ شَئٍ إلاّ الجِماع**) من تووشی ئافرەتێك بووم، پەیوەندی ناشەرعیم لەگەڵیدا دروست کرد، هەرچی پیاو ژن بەیەکەوە دەیکەن لەگەڵ ئەو ژنەدا کردومە، تەنها زینام لەگەڵ نەکردووە. (دیارە پرسیاری ئەوەی کردووە کە ئەگەر تەوبە بکات و بۆ یەگجاری واز لەو کارە قیزەونە بێنێ، خوای گەورە لێی خۆش دەبێت؟!) پێغەمبەری خوا ﷺ هیچی نەفەرموو تا خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە و فەرمووی: ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيْلِ ۚ إِنَّ ٱلْحَسَنَٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾ هود.

واتە: ئەی ئیماندار نوێژەکانت بەجوانی و ڕێکوپێکی ئەنجام بدە لەهەردوو جەمسەری ڕۆژدا، هەروەها لە بەشێکی شەویشدا نوێژەکان ئەنجام بدە (کە هەندێك لە نوێژە فەرزەکان و هەندێك لە نوێژە سوننەتەکان دەگرێتەوە) چونکە لە ڕاستیدا کاروکردەوە چاکەکان (لەسەروو هەموشیانەوە نوێژی جوان و ڕێك و پێك) کاروکردەوە خراپەکان ڕادەماڵێت (لە دۆسیەی کردەوەکاندا دەیسڕێتەوە و لە ڕەفتار و کرداری ڕۆژانەش هەڵەشەیی و نادروستی دووردەخاتەوە)..

ئەمجا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ئایەتەی بۆ کابرا خوێندەوە ئەو کەسەش وتی: (يارَسُولَ اللهِ أَلِيَ هذا؟) ئەی پێغەمبەری خوا ئەم موژدە خواییە و ئەم کردنەوەی دەرگای ڕەحمەتی خوایە هەر بۆ منە بەتەنها؟! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (لِجَميعِ أُمَّتي كُلِّهِمْ) نەخێر ئەمە بۆ هەموو ئوممەتەکەمە تا ڕۆژی قیامەت.

(ئەم فەرموودەیە: متفق علیه، بُخاري: (٤٩٥)، مُسْلِم: (٤٩٦٣))

لەڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە: ئافرەتێ مێردەکەی لە غەزابوو، ئەم ئافرەتە چوو بۆ خورما کڕین کابرای دوکاندار تەماعی تێکرد و وتی: لەماڵەوە خورمای جوانترمان هەیە و وەرە بابچین لەوە بتدەمێ، بەڵام لەماڵەوە پەلاماری ژنەکەی دا و ماچی کرد..

دوای ئەم کارە نالەبار و نامەردانە هاتەوە بەخۆیدا چوو بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: تۆ خیانەتت کردووە لە پیاوێك کە چووە بۆ غەزا لە پێناوی ئاینی خودا و ویستوتە ئابەو شێوەیە چاکەی خێزانەکەی بدەیتەوە؟ ئیتر پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی لە کابرای دوکاندار وەرگێڕا و ئەویش کە ئەمەی بیست و بینی لە دڵی خۆیدا وتی: تازە من دۆزەخم بۆ خۆم مسۆگەر کرد، وادیارە خوای گەورە هەرگیز لێم خۆشنابێت.. بەڵام ئەم ئایەتەی (١١٤)ی سورەتی هود نازڵ بوو، وە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی خوێندەوە..

جائەمە ئەوە ناگەیەنێت کە لەو بوارەدا شل گیری بکەین، چونکە ئیماندار دەبێت چاوی بپارێزێت لە تەماشای حەرام چ جای کەتنی وا بکات. ئەم موژدەیە بۆ ئەو کەسانە چاکە کەپێش پابەندبوونیان هەڵەی لەو جۆرەیان کردبێت و چاك وایە دەروازەی ڕەحمەت و میهرەبانی بەڕوویاندا دانەخەین..

(تەفسیری ڕۆشن. بورهان محمد أمین، ل٣٤٢).



### ئامۆژگاری و سەرزەنشتکردن بۆ گوناهی بچوك:

- پێشەوا (إبنُ قُدامة) لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا (المُغْني ج١٢ ص٣٥١) دەفەرمووێ: **(وَلَوْ وُجِدَ رَجُلٌ وَ امْرَأَةٌ يُقَبِّلُ كُلُّ واحِدٍ مِنْهُما صاحِبَهُ، وَلَمْ يُعْلَمْ هَلْ وُطِئَها أَوْلا، فلا حَدَّ عَلَيْهِما)**.

واتە: ئەگەر ژن و پیاوێك بەیەکەوە بینران دەمیان لەناو دەمی یەکتردا بوو، یەکتریان ماچ دەرکرد، بەڵام نەدەزانرا ئایا جیماعیان کردووە و بەیەکەوە جوت بوون یان نا، ئەوە حەدی شەرعیان لەسەر نیە. نابێ داری حەد و ڕەجمیان لەسەر جێبەجێ بکرێ. بەڵکو هەر سەرزەنشت دەکرێن و لەلایەن دادوەرەوە ئامۆژگاری و تەمێ دەکرێن کە دووبارەی نەکەنەوە. کەواتە: ئەگەر پیاوێك زانی ژنەکەی لەگەڵ کەسێکی نامەحرەمدا بە مۆبایل قسەی نەشیاوی کردووە، بەڵام ژنەکەی تەوبەی کرد و بۆ دواجار پەیوەندی بەو

کەسەوە پچڕاند، ئەم پیاوە پێویستە تەنها سەرزەنشتی بکات و ئامۆژگاری بکات و نەیگەیەنێتە تەڵاقدان و جیابونەوە، ژنێکیش بۆ پیاوەکەی هەمان ڕێگا بگرێتە بەر، ئەگەر ئەمەی لێ بینی.

بەڵام: ئەگەر ژنێك زانی مێردەکەی زینای لەگەڵ نامەحرەمێکدا کردووە و ناپاکی هاوسەری کردووە، یان پیاوێك زانی ژنەکەی لەگەڵ پیاوێکدا دەستی تێکەڵ کردووە و گەشتۆتە زینا کردن، وە ئەم کارەش بەبەردەوامی دووبارە دەبێتەوە و تەرکی ناکات.

لەم کاتەدا خۆ چوار پیاوی دەستناکەوێ لەم کاتی زینایەدا بیان بینن و شایەدی بدەن، ئەگەر قسەش بکات بە بوختانچی حساب دەکرێ (ئەگەر لیعان) نەکات. وە دادگای شەرعیش نەبوو ئەمەی لێ ئەنجام بدات، یان لە ئابڕوچونی خۆی و منداڵەکانی و داهاتوویان دەترسا، ئەوە لەم کاتەدا ڕێگەی پێ نادرێ بچێ هاوسەرەکەی بکوژێ. بەڵکو بەبێ دەنگی تەلاقی دەدا و باسی ئەوەش ناکات کەلەسەر ئەوە تەلاقی داوە، وە تۆڵەی خۆی لە هاوسەری و لەو پیاوەی ناپاکی لەگەڵ کردووە بەخوا دەسپێرێ و دڵنیابێ کە خوای گەورە تۆڵەیان لێ دەکاتەوە.. بەڵام نابێ مرۆڤی ئیماندار قبوڵی ئەوە بکات کە هاوسەرەکەی لە ناپاکی هاوسەریدا بێ و خێزانی ئەمیش بێ. هەروەکو لەم فەرموودەیەدا هاتووە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

(ثَلاثَةٌ يَدْعونَ اللهَ عَزَّوَجَلَّ، فَلا يُستَجابُ لَهُمْ: رَجُلٌ كانَتْ تَحْتَهُ امْرَأَةٌ سَيِّئَةُ الخُلُقِ فَلَمْ يُطَلِّقْها، وَرَجُلٌ كانَ لَهُ عَلى رَجُلٍ مالٌ فَلَمْ يُشْهَدْ عَلَيْهِ، وَرَجُلٌ أَتَى سَيفها مالَهُ، وَقالَ تَعالى: ﴿وَلَا تُؤۡتُواْ ٱلسُّفَهَآءَ أَمۡوَٰلَكُمُ﴾ حديثٌ صَحيحٌ، رَواهُ الحاكِمْ ـ صَحيحُ الجامِع: (٣٠٧٥).

واتە: سێ کەس هەن دوعادەکەن و لەخوا دەپاڕێنەوە، خوای گەورە دوعاو پاڕانەوەکانیان لێ وەرناگرێ و وەڵامیان ناداتەوە: پیاوێك کە ژنێکی هەبێ بەدڕەفتار و ناپاك بێ، بەڵام تەڵاقی نەدا و ڕازی بێ بەم ناپاکی و ناشەرعی و گوێی خۆی لێ بەخەوێنێ. وەکەسێك کە ماڵ و پارەیەکی لای کەسێکە و شایەتی لەسەر نەگرتووە و کەس ئاگادار نیە. وە کەسێك کە ماڵ و دارایی خۆی بداتە دەست سەفیهو کەم عەقڵ و پارە خۆر و پارە بە فیڕۆ دەرێك. لە کاتێکدا خوای گەورە لە سورەتی ( النِساء: ٥)دا فەرموویەتی نەکەن ماڵ و سامانتان بدەن بە کەسانی کەم عەقڵ و بەدڕەوشت و ناپاك بۆ کەسابەت و بازرگانی.



## لەکاتی زینادا خێزانەکەی بینی!

بەسەرهات

ئەم بەسەرهاتە لە یەکێك لە شارە گەورەکان ڕوویداوە و ئەمەش ناوەڕۆکی ئەم ڕووداوەیە: کوڕێکی گەنجی مسوڵمان و زانست خواز هاوسەرگیری کردبوو، تەنها خۆی و ژنەکەی بوون و هێشتا منداڵیان نەبوو بوو، لەم کاتەدا ئەم پیاوە خوێندکاری زانکۆ بوو لە بەشی یاسا و دادوەری. ڕۆژێکیان جانتا و هەندێ کتێبی بیرچوو. بۆیە بەپەلە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، کە پێشتر هیچ کات لەو کاتەدا نەهاتبۆوە ماڵەوە، خۆی کلیلی لابوو، دەرگای کردەوە و چووە ژووری نوستنەکەی کە شەو کتێبەکانی لەوێ جێهێشتبوو، بەڵام پەنا بەخوا چی بینی؟!

سەیری کرد بە چاوی خۆی دیمەنێك دەبینێ کە ناتوانێ بڕوا بە چاوی خۆی بکات کە ئەمە ڕاستە یان، نا، بەڵام نەخێر ڕاستەقینەیە و وا ژنەکەی لەگەڵ پیاوێکدا خەریکی زیناکردنن!!

کاتێ دەرگاکەی کردەوە، هەردووکیان وەختبوو ووشك بن، دەتگوت هەورە بروسکە لە ئاسمانەوە هات و لێی دان.. بەڵام کاردانەوەی ئەم پیاوە گەنجە دیندارە، خوێندەوارە، یاساناسە چی بێ باشە؟! بە کابرای خراپەکاری گوت: هەستە جل و بەرگەکەت لەبەرکە و بڕۆ دەرەوە..

کابرا بە لێوە لەرێوە وتی: سوێند دەخۆم خەتای من نەبوو، ژنەکەی تۆ منی فریودا و تووشی ئەمەی کردم!

ئەمیش پێی وت: ئەڵێم هەستە جل و بەرگەکەت لەبەربکە و لەماڵەکەم بڕۆدەرەوە هەی ناپاك.. بڕۆ خوا تۆڵەت لێبکاتەوە..

لەم کاتەدا ڕق و قین و توڕەیی بەچاوی گرتبوو. بەڵام یادی خوای کرد و بەسەرخۆیدا زاڵبوو..

کاتێ کابرای ناپاك لە ماڵەکە چووە دەرەوە، زەردەخەنە و پێکەنین گرتی، ئایا بەوە پێکەنی کەچۆن ئاوا ڕزگاری بوو لە کاتێکدا چاوەڕێی کارەساتێکی سامناکی دەکرد. یان پێکەنی بە عەقڵی ئەم پیاوە پابەندە بە دینی خوا و خۆڕاگر و دان بەخۆدا گرە!!

ئەم کوڕە خوێندکارەی زانکۆ هیچی نەوت تەنها وەڵامی ئەو پێکەنین و زەردەخەنە نارەوایەی بەوە دایەوە کە فەرمووی: (حَسْبِيَ اللهُ وَنِعْمَ الوَكيل) لەم کاتەدا دڵی وەکو مەنجەڵی سەر ئاگر دەکوڵا و، هەموو کەسێکی ژێر ئاواتی مردن دەخوازێ لەو کاتەدا. ئەمجا گەڕایەوە بۆلای خێزانەکەی و پێی وت: هەستە کەل و پەل و جل و بەرگەکەت کۆبکەوە و من لەدەرەوە چاوەڕێت دەکەم، تا ئامادە بی و دەتگەیەنمەوە دەست کەس و کارت..

ژنەکە دەستی کرد بە گریان و پاڕایەوە و وتی: ئەوە تەنها شەیتان پێی کردم و لێم ببورە..

بەڵام ئەم هەر گوێی گرت و قسەی نەکرد تا ژنەکەی لە قسەکان بۆوە، ئەمجا وتی: وا هەرکەسێك تەڵاقم دای و ژن و مێردایەتیمان

کۆتایی پێهات و برۆ خوا ئەم ناڕەواییەی لەگەڵ منت کرد بۆت پەردەپۆش بکات. تەنها هەر ئەوە دەڵێم: (حَسْبِيَ اللهُ وَنِعْمَ الوَكيل)

بەڵێ سواری ئوتومبێلەکەی کرد نزیکەی (٣٠٠) کلم ڕۆشت تاگەیشتە ماڵی خەزوری و ئەمجا بە ژنەکەی وت: برۆ خوا پەردەپۆشی ئەم کارەت بۆ بکات و لەخوابترسە. لەو خوایە بترسە کە هەمیشە و بەردەوام دەتبینێ، من هیچ شتێ بە ماڵی باوکت ناڵێم و تەنها دەڵێم، ناتوانین بەیەکەوە بژین و ئێستا جیاببینەوە باشترە لەکاتێکی تر..

ژنەکە گریا و وتی: بەخوا ڕاستە من شایەنی کەسێکی بەرز و بەڕێزی وەکو تۆ نیم، تەنها مەینەتی و پەشیمانیم بۆ مایەوە. ئەمیش هەر وتی: (حَسْبِيَ اللهُ وَنِعْمَ الوَكيل)

بەڵێ ئەم پیاوە دەڵێ: ساڵان تێپەڕین و من خوێندنم تەواو کرد و پاشان چوومە بەشی دادوەری و بومە قازی، بەڵام هەمیشە کەسێکی گۆشەگیربووم. تەنانەت حەزم بە بەشداری هیچ کۆڕ و کۆمەڵ و بۆنەیەك نەدەکرد کە خزم و کەس وکار و بنەماڵەکەم ئەنجامیان دەدا. لەگەڵ ئەوەدا چەندین ساڵ بەسەر ئەم ڕووداوەدا تێپەڕی بوو.. بەڵام بۆیەك چرکەش دیمەنی ئەو پیاوە نامەردە و ئەو پێکەنینە گاڵتەپێکردنەی لەبەرچاوم لانەدەچوو..

دوای چەند ساڵێ لەم ڕووداوە، هاوسەرگیریم بۆ جاری دووەم ئەنجامدا و سوپاس بۆ خوا خوای گەورە قەرەبووی بۆ کردمەوە، کە ئافرەتێك بوو بە هاوسەرم، کە هیچ کات خەونیشم بە ئافرەتێکی وا بەدین و ڕەوشت و نەرم و نیان و بەڕێزەوە نەبینیبوو، خوای گەورە منداڵیشی پێ بەخشین.

ئەم ژنە بە مانای کەلیمە گەورە و بەڕێز بوو، زۆر پشتیوانم بوو. تەنانەت داوای لێکردم کە بەردەوام بم لەسەر خوێندن و سەرەنجام دکتۆرام وەرگرت لەدادوەری و بومە سەرۆکی باڵای دادوەری. ئەم قازیە دەڵێت: هەموو دوای نوێژێك لە خوا دەپاڕامەوە کە ئەو دیمەنە نەشیاوەی خێزانم و ئەو پیاوە لەبەرچاوم لابەرێ کە بەڕوتی بەیەکەوە بینیبومن. بەڵام هەرکات کەسێکم دەبینی کە پێدەکەنێ و زەردەخەنەی دێت، من وێنە و پێکەنینی ئەم پیاوەم دەهاتەوە بەرچاو و پەنام بۆ خوای گەورە دەبرد، کە بەگەورەیی خۆی لە بەڵای شەیتان و وەسوەسە پیسەکانی بم پارێزێ.

بەڵێ، دەڵێ ڕۆژێکیان لە فەرمانگەکەم دانیشتبووم. وەکو ڕۆژانی ئاسایی لاپەڕە و دۆسیەکانی دادگام دەهاتە بەردەم. کاتێ سەرم هەڵبڕی پۆلیس کەسێکی هێنابوە بەردەمم، هەر کە چاوم پێکەوت ناسیمەوە، ئەوە ئەو پیاوەیە چەند ساڵی زۆر لەمەوبەر لەگەڵ ژنەکەمدا بەیەکەوە لەماڵەکەمدا گرتم و بەڕێم کرد، کەچی ئەو پێم پێکەنی. بەڵێ ئەمە خۆیەتی!!

بەلاَم ئەو منی نەناسیەوە. هەر کە هاتەبەردەمم وتی: جەنابی دادوەر هانام بۆ خوا بردووە پاشان دەستم بە دامێنت بە فریامکەوە..

دادوەرەکە دەڵێ پێم وت: چی تۆی هێناوەتەوە بۆ ئێرە و کێشە و گرفتت چیە؟

وتی: کاتێ چوومە ماڵەوە پیاوێکم بینی لەگەڵ ژنەکەمدا لەناو جێگای خەوتنەکەمدا زینایان دەکرد! منیش یەکسەر ئەو پیاوەم کوشت..

دادوەرەکە دەڵێ پێم وت: ئەی بۆچی ژنەکەت نەدەکوشت بۆئەوەی ببی بە پاڵەوانی کوڕی پاڵەوان؟!

وتی: کە ئەو کارەساتەم بینی هۆشم لای خۆم نەما و ئەو پیاوە ناپاکەم کوشت، دادوەرەکە پێی وت: ئەی بۆچی وازت لێنەهێنا و لەماڵ نەتکردە دەرەوە و نەت گوت: بڕۆ بائەم کارە ئاشکرانەبێ و خوا پەردەی لەسەر هەڵنەگرێ، بڕۆ خوا تۆڵەت لێبکاتەوە؟! پیاوەکە بە سەرسوڕمانەوە وتی: جەنابی دادوەر ئەگەر تۆ توشی حاڵەتی ئاوا ببی، شتی وا قبوڵ دەکەی و ئاوا ڕێگەی ئەو ناپاکە دەدەی بڕوا و نایکوژی؟!

دادوەر وتی: بەڵێ من بەمە ڕازی دەبووم و تەنها ئەوەم دەگوت: (حَسْبِيَ اللهُ وَنِعْمَ الوَكيل).

کابرای ناپاکی بکوژ کە گوێی لەمە بوو، دەمی داچەقاند و بەسەرسوڕمانەوە وتی: ئای پێشتر پێش چەند ساڵێ لەمەوبەر ئەم قسەیەم گوێ لێبووە. لەکوێ گوێم لێبوو؟!

دادوەر یەکسەر وتی: بەڵێ لەمنت گوێ لێبوو، ئەو کاتەی تۆی ناپاك هاتیتە ناو ماڵم و دەستت لەگەڵ خێزانم تێکەڵ کرد و بەیەکەوە لە ماڵی خۆمدا بینیمن، تۆی ناپاك ئەو ژنە داماوەی منت فریودا و توشی زینات کرد.. ئەی لەبیرتە کە چویتە دەرەوە چۆن زەردەخەنەت کرد و پێکەنی بەوەی کە من چۆن نەمکوشتی، بەڵێ من کارەکەم داپۆشی و دامە دەست خوای تۆڵە ئەستێن لە ناپاکان..

ئەوەتا خوای گەورە ماوەیەك مۆڵەتی دای و بەلاَم تۆ لە جیاتی تەوبە و پەشیمانیت هەر بەردەوام بووی لەسەر ئەم بەدکاریەت، تاوەکو خوای گەورە هەمان شتی بەسەرخۆت هێنایەوە و لەگەڵ خێزانتدا پیاوی ترت بینی، لە دەرگای خەڵکت دا، لە دەرگات درایەوە، ماڵی خەڵکت وێران کرد، ماڵی خۆت وێران بۆوە، ئێستا وا قەتڵ و تاوانی کوشتنیشت هاتە سەر، سوێند بەخوای گەورە یەقینم هەبوو، چەندە تەمەنت درێژ بێ. ئەم مەوقیفەت لە بیرناچێتەوە و ڕۆژێ سزاکەی وەردەگری.

پاشان دادوەر کەمێ بێدەنگ بوو، ئەمجا وتی: تۆ دەزانی من چیم پێدەکرێ؟! من هیچ دەسەلاَتێکم نیە بۆ یارمەتی دانی تۆ

ئەگەر بنەماڵە و کەس و کاری کوژراوەکە لێت نەبورن، ئێستاش شەرعی خوا چی بۆ بڕیارداوی من تەنها ئەوە جێبەجێ دەکەم.
پیاوی تاوانکار وتی: من ئەو ڕاستیە دەزانم، بەڵام تەنها یەك شتم لەتۆ دەوێت.. دادوەر وتی: چیە؟!

وتی: دەمەوێ لێم ببوری بە گەورەیی خۆت. بەڵێ من گوێڕایەڵی نەفس و شەیتان بوم و ئەم سزایەش کە لەڕێی دادگاوە وەری دەگرم، کەمترین سزایە بۆ من خوای گەورە ئاگادارە من سەرم لە خێزانی تۆ تێکدا و، ئەوەی ژنەکەت وتوویەتی ڕاستە، من چەندین ڕێگا و شێوازم گرتە بەر بۆئەوەی لە خشتەی ببەم. هەرکاتێ لە یەکێ لە شێوازەکاندا سەرکەوتوو نەدەبووم، پەنام بۆ شێوازێکی شەیتانی تر دەبرد و ئەمە ڕاستیەکەیە..

ئای خۆزگایە هەر ئەو ڕۆژە تۆ لە ماڵەکەی خۆتدا بت کوشتمایە و ئەوەی ئێستا بەسەرم هات نەمبینیایە..

قازی وتی: ئەمە تێپەڕی. لەیەکەم بینینم بۆتان، ئاسان نەبوو بۆم کە ئاوا ئارام بگرم، ئەگەر یادی خوای گەورە نەبوایە، بەڵێ هەرچەندە پیاوماقوڵان و ئەوانەی صوڵح و ئاشتەوایی دەکەن و کەوتنە هەوڵی چڕ و پڕ بۆئەوەی بنەماڵەی کوژراوەکە ڕازی بکەن، کە نەیکوژنەوە و بە پارە و داواکاری لێی خۆشبن.

بەڵام بڕیاری خوا لەسەرو هەموو شتێکەوەیە و بەهیچ شێوەیەك تەنەزولیان لە حەقی خۆیان نەکرد و، خوای کاربەجێ و دادگەر و

تۆڵە ئەستێن بڕیاری وابوو، کە سزای لە سێدارەدانی ئەم تاوانکارە بەقەڵەم و ئیمزای ئەو دادوەرە بێ! کە پێش چەندین ساڵ ئەو قەڵەمەی هەڵگرت لە جیاتی چەك بۆئەوەی شەریعەتی ئیسلامی پێ فێربێ، وەکارەکەی دایە دەست خوا و وتی: (**حَسْبِيَ اللهُ وَنِعْمَ الوَكيل**) خوای گەورەش بە ئیمزای ئەو سزاکەی بەسەردا چەسپاند و سزای لای خوای گەورەش، لای خوا خۆیەتی، پاکی و بێگەردی بۆئەو خوایەی حەکیم و کاربەجێیە و زانا و ئاگادارە بە هەموو ئاشکرا و نهێنیەك.

(ندم، هاني درار عثمان، ص١٧٩).



# وانەی سیانزەیەم

## بابەت: لە کاتی خۆشی و دەسەڵاتدا، سوپاسگوزاری خودا بە..

### ـ بەشی یەکەم ـ

۞ قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى: ﴿وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ وَلَئِن كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ ۝٧﴾ إبراهيم.

۞ قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (اللّهُمَّ إنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ زَوالِ نِعْمَتِكَ، وَ تَحَوُّلِ عافِيَتِكَ، وَ فُجْاءَ ةِ نِقمَتِكَ، وَ جَميعِ سَخَطِكَ). رَواهُ مُسْلِم: (٦٨٧٩).

**سەرچاوەکان:**

١) الجامع في الدُّعاءِ النّافِع، صالح بن طه عبدالواحيد.

٢) تەفسیری ڕامان، ئەحمەد کاکە محمود.

٣) تەفسیری ڕۆشن، بورهان محمد أمین، پێداچوونەوەی: د. سید أحمد عبدالوهّاب.

٤) یەك لە پەنای خاڵ و سیفری بێ بڕانەوە، د. عەلی شەریعەتی، و: هەژار).

٥) موسوعة أسْماء الله الحُسْنَى، د. محمد راتب نابلُسي ج٢ ص٢١٥.



بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العالَمين. وَ الصَّلاةُ وَ السَّلامُ عَلى سَيِّدِنا محمد وَعَلى آلهِ وَ أصْحابِهِ أجْمَعين:

پێغەمبەری پێشەواو دڵسۆزمان، نوری چاومان، مامۆستای ڕێ نیشاندەرمان، شەفیعی ڕۆژی مەحشەرمان ـ **محمد المصطفى** ـ ﷺ، زۆربەی كات ئەم دوعایەی دەكرد و ئاوا لە خوای گەورە و میهرەبان دەپاڕایەوە، كە ئەمەش وانەیەكە بۆ ئێمە كە ئاوا لە خوای خۆمان بپاڕێینەوە، خۆشەویستمان ﷺ دەیفەرموو: (**اللّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ زَوالِ نِعْمَتِكَ، وَ تَحَوُّلِ عافِيَتِكَ، وَ فُجاءَةِ نِقْمَتِكَ، وَ جَميعِ سَخَطِكَ**). رَواهُ مُسْلِم: (٦٨٧٩).

واتە: یاڕەبی خوایە پەنات پێ دەگرم، بەگەورەیی خۆت بمپارێزە لەوەی، ئەو خەڵات و خۆشیانەی كە بە منت بەخشیوە، لێم نەسێنیتەوە و لێم تێك نەچێ، خوایە پەنات پێ دەگرم، ئەو خەڵات و خۆشیەی، لەو لەش ساغی و سەلامەتیەی بە ئەندامانی جەستەت بەخشیوم، لەو دڵ خۆشیەی كە زەردەخەنە لەسەر لێومە و دڵم شادە و بەختەوەرم. لەو ماڵ و خێزانەی كە پێت بەخشیوم و خێزانم هەیە و ماڵ و حاڵێكم هەیە تیا بحەوێمەوە و لە دەرگای خەڵكی نیم، لەو سفرە ڕازاندنەوە و خواردن و خوانە خۆشەی كە پێت خەڵات كردوم. لەو حورمەت و كەسایەتی و شەخصیەتەی كە

لە فەزڵی خۆتەوە پێت بەخشیوم، هی ئازایەتی من نیە و تۆ وات کردووە لای خەڵکی ڕێزم لێ بگیرێ.

خوایە پەنات پێ دەگرم. کە بەهۆی خراپی و بەدکاری و ناشکوری خۆمەوە، لەناکاو ئاڵوگۆڕی بەسەردا بێت و لێم قلّپ ببێتەوە و لێم وەرگریتەوە..

خوایە گیان پەنات پێدەگرم لەوەی کەلە ناکاو غەزەبم لێ بگری. بمپارێزە لەوەی کە لەناکاو کارێکی نەشیاوی وابکەم شایانی ئەوەبم کە تۆ غەزەبم لێ بگری و لێم تورە بیت.

خوایە پەنات پێدەگرم. بە ڕەحمانیەت و ڕەحمی خۆت، لە لوتف و کەرەمی خۆت بمپارێزی لە هەموو سزاکانت. کە بۆ خراپەکارانت ئامادەکردووە.

خوایە بەدورم بگری. بەڵێ، ئەمە دوعاکەی پێغەمبەری خوا بوو ﷺ. دەبا ئێمەش لەبەری بکەین و هەمیشە پێی بپاڕێینەوە لەخوای خۆمان. بۆئەوەی خۆشیەکانی ژیانمان بەردەوام بن و لە بەلاّ و نەهامەتی و نەدامەتیەکان خوای گەورە بە لوتفی خۆی بمانپارێزێ.

## هەمیشە خودات لەیاد بێت..

ئەی مرۆڤ لە خوا غافڵ مەبە، جا بۆئەوەی مرۆڤ لە خوای گەورە غافڵ نەبێ پێویستە هەمیشە و بەردەوام یادی پەروەردگاری خۆی بکات. چونکە ئەم مرۆڤە سروشتی وایە. هەر کە لە یاد و زیکری

خوای گەورە دابڕا و دورکەوتەوە خۆی لێدەگۆڕێ. وەختێ بە خۆی دەزانێ کە لەو قالبەی خۆی چۆتە دەرەوە و وادەزانێ ئەم زۆر گەورەیە. ئەم خۆشی و ئاسودەییەی هەیەتی هی خۆیەتی و بە ئازایەتی و پیاوەتی و زیرەکی خۆی بەدەستی هێناوە، خۆی لێ دەبێت بە قارون و دەڵێ: ﴿قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلۡمٍ عِندِيٓ﴾ القصص: ٧٨.

هەندێ کەسیش خۆی لێ دەبێ بە فیرعەون و بە دەسەڵات و هێزەکەیدا دەنازێ و بەهی خۆی دەزانێ، نەك بە یارمەتی و کۆمەکی خوا بۆی تا چاکسازی پێ بکات لەسەر زەویدا نەك ستەم و چەوساندنەوە، بۆیە کە لەخوا غافڵ بوو دەڵێ: ﴿أَلَيۡسَ لِي مُلۡكُ مِصۡرَ وَهَٰذِهِ ٱلۡأَنۡهَٰرُ تَجۡرِي مِن تَحۡتِيٓۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ ۝﴾ الزخرف.

هەر کە خۆی بینی لەسەر کورسی دەسەڵات و فەرمانێکی بەدەست بوو. وا لە خۆی دەگۆڕێ وا دەزانێ کە ژیان و مردنی ئەو خەڵکە، نان و ناویان. بە دەستی ئەوە. بۆیە (نەمرود) ئاسا دەڵێ: ﴿أَنَا۠ أُحۡيِۦ وَأُمِيتُ﴾ البقرة: ٢٥٨.

بەڵێ ئەمە سروشتی مرۆڤە. زۆر زوو لە خۆی دەگۆڕێ، ئەگەر لە خوای خۆی غافڵ بوو. هەر بۆیە ژیانی مسوڵمان هەمووی یادی خوایە. پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی هەمیشە زیکری کردووە و بۆ ئێمەی ئوممەتیشی خوێندن و کارپێکردن و لەبەرکردن و

تێگەشتنیانی کردووە بە سوننەت. بۆیە دەبینی لە تەواوی کارەکانیدا زیکر و دوعایەك هەیە، بۆ نمونە:

## سوپاسگوزاری لەکاتی خواردن و خواردنەوەدا:

پێغەمبەری خوا ﷺ فێری کردووین، کە هیچ پاروە نانێك نەخۆین، وە هیچ قومە ئاوێك نەخۆینەوە، تاوەکو لەسەرەتاوە نەڵێین: (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحيم). لەبەرئەوەی ئەگەر ئەو خواردنە بەتام و ئەو سفرە ڕازاوە و ئەو خواردنەوە سارد و سازگارەت لەبەردەمی خۆت بینی، ڕەنگە خەیاڵت بۆ ئەوە بچێ کە ئەمە هی کاروکەسابەتی خۆتە. ئەوە تۆ پارەت پەیدا کردووە و ئەو خواردنەت پێ کڕیوە، ئەوە دیارە تۆ لە خەڵك چاکتر و بەهێزتری بۆیە سفرەت ئاوا ڕازاوەیە، بەڵام کە وتت (بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحيم) خوایە گیان بە ناوی تۆ، یەکسەر ئەوە دێتە بەردیدەت کە ئەمە هی خوایە. ئەو کاتە خۆ بە گەورە زانین و بە هی خۆ زانینت نامێنێ.. ئەمجا ئەگەر لە خواردنیش تەواوبووی وانەزانی بە ئازایەتی خۆت تێرت خواردووە، نەخێر.

ئەو دەم و لێوەت، ئەو دەم و دانەت کە خواردنەکەی هاڕی و پارچە پارچەی کرد..

ئەو لیکە ڕژێنانەی کە پاروە نانەکەیان بۆ شل کردیتەوە.. ئەو قوڕگ و گەرو و سورێنچکەت، ئەو زمانە بچکۆلەی ناهێڵێ خواردن و

خواردنەوە بچێتە بۆری هەناسەتەوە و بخنکێی یان لانی کەم نانەکەت لێ تاڵ ببێ..

ئەو گەدە (معیدە) ساغەی کە هەمەچەشن خۆراکت تێکرد و هەمووی هەزم کرد و هەرسی کرد..

ئەو ڕیخۆڵانەی کە لە ڕێگەی دەمیلەوە مژیان و چی سود بەخشبوو خستیانە خوێنتەوە و چی زیان بەخش بوو لە لاشەت فرێی دایە دەرەوە.. هیچی هی ئازایەتی تۆ نەبوو. تۆ هەر ئاگات لێ نیە و نەتزانیوە چۆن کاریان کردووە، هەمووی هی خوای گەورەیە و پێی بەخشیوی، بۆیە دەبێ بڵێی (الحَمْدُ للّه) خوایە گیان هەرچی سوپاس و ستایشە هەمووی هەر لایەقی تۆیە. سوپاس و ستایش هەر بۆتۆیە لەسەر ئەو خواردن و خواردنەوە پاك و حەلاڵ و بەتام و چێژەی پێت بەخشیم، لەوەشدا کە بە ئاسانی بۆم خورا و بەبێ ئازار لە پاشماوەی ڕزگارم دەبێ. بەم جۆرە بەم (بسم اللّه) و (الحَمْدُ للّه)یە مرۆڤ لە کیبر و خۆبەزل زانین ڕزگاری دەبێ. خۆت لە خەڵکی بە گەورەتر نازانی، لە سنوری خۆت ناچیتە دەرەوە.

## کاتێ کە ئوتومبێلت لێخوڕی:

سوننەتە لەو کاتەدا کە قاچت دەخەیتە ناو ئوتومبێلەکە بڵێی (بسم اللّه) پاشان کە دانیشتی بڵێی: (الحَمْدُ للّه) ئەمجا بڵێی

﴿سُبۡحَـٰنَ ٱلَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَـٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقۡرِنِينَ ۝١٣ وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ ۝١٤﴾ الزخرف.

واتە: پاك و بێگەردی بۆ ئەو پەروەردگارەی کەئەمەی بۆ ئێمە ژێر بار و موسەخەر و ڕام کردووە کە سواری ببین و لە ماندوبونی ڕێگا برین بەدووربین. وە بە دڵنیاییەوە هەموومان بۆلای ئەو خوا گەورە و بەدەسەلاتە دەگەڕێینەوە. ئەمجا سێ جار دەڵێی: (الحَمْدُ لله) وە سێ جار (اللهُ اكبر) پاشان دەڵێی: (سُبْحانَكَ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسي فَاغْفِرْلي، إِنَّهُ لا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إلاّ أَنْتَ) حَديثٌ صَحيح. (صَحيح الوابل الصَّيب: ٢٢٢).

ڕەنگە یەکێ بپرسێ: باشە چونە ناو ئۆتۆمبێل و لێخوڕینێك ئەم هەموو دوعا و زیکرەی دەوێت؟!

دەڵێین بەڵێ، چونکە هەر مرۆڤە و بەچاوی خۆمان دەیبینین کە کاتێ قاچی لە زەوی بڕا و چوارتایەیەکی لە ژێر خۆیدا بینی، بە تایبەت ئەگەر ئۆتۆمبێلەکەی گرانبەها و ناوازە و تازە مۆدێل بێ. چۆن یاساکانی هاتوچۆ پێشێل دەکات و ئازاری هاوڵاتیان دەدات و سەرەنجام ڕووداوی گەورە و دڵتەزێن ڕوودەدات و ڕۆژانە مرۆڤ دەبێتە قوربانی ڕووداوەکانی هاتوچۆ کە هۆکاری هەرە سەرەکی، سەرکەش و لوت بەرزی و خۆنواندنی شۆفێرە!!

بەڵێ ئەم ئیسلامە چەند جوانە، ئەم مرۆڤە چەندە پێویستی بە جێبەجێ کردنی سوننەتەکانی پێغەمبەی خوا هەیە ﷺ زیاتر لەوەی کە پێویستی بە ئوتومبێلەکەیە. چونکە بەبێ ئوتومبێل دەتوانێ بژی، بەلاّم ئوتومبێل بێ ئەوەی پابەندی یاسابی و شوکری خوای لەسەر بکەی و بیری قیامەتت هەبێ کە ئەگەر بەو ئوتومبێلەت هەر کەسێ ئازاربدەی، بالەچاوی پۆلیسی هاتوچۆ و غەرامەش ڕزگارت ببێ، لە قیامەت و لێپرسینەوەی بەردەم خوای گەورە ڕزگارت نابێ. بۆیە دەڵێی: (وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ).

ئەگەر ئەم ئیمانە نەبوو، ئەگەر شۆفێر لە خوا غافلْ بوو. ئوتومبێل لە جیاتی چێژبەخشین بە ژیان، دەبێتە مەرگ و ژان بۆ ژیان. بۆیە ئەگەر سەیارەیەکی زۆر چاکت پێبوو. بەلای کەسانێکدا ڕابوردی کە پیادەن، یان ئوتومبێلی مۆدێل نزم و خراپیان پێیە. یەکسەر بەم زیکر و دوعایانە لە خۆت ناگۆڕێی و بە هی خوای دەزانی نەك ئازایەتی خۆت.

بۆیە ئەگەر خەتەرەیەکی خۆبەگەورە زانین بە دلْ و دەروننتا هاتبێ یەکسەر داوای لێخۆشبوون لە خوا دەکەی و دەڵێی: (پاك و بێ گەردی بۆ تۆ ئەی خوای گەورە، من ستەمم لە نەفسی خۆم کرد. خەریکبوو لەبیرم بچێتەوە کە من چیم و چەندە بێ دەسەلاّتم، ئەگەر ڕەحم و لوتفی تۆ نەبێ هەناسەیەکم پێ نادرێ. دەی خوایە گیان لێم خۆشبە، بەڕاستی هیچ کەس ناتوانێ لە گوناهەکان خۆش

بێ. تەنها تۆ نەبێ ئەی خوای پەروەردگار).. بەڵێ، بەم بیروباوەڕە، بەم پەروەردە جوانە، مرۆڤێکی هێمن و لەسەرخۆ، خاکی و خۆبەکەمگر، بەبەزەیی و بەسود لە کۆمەڵگەدا دروست دەبێ، کە ژیان هەر بەمانە مانادار دەبێت.

### ئەو کاتەی کە هەواڵێکی خۆشت پێدەگات:

کاتێ سەرکەوتنێك بەدەست دێنی، یەکسەر یادی خوابکە و سوپاسی خوا بکە و کڕنوشی سوپاسگوزاری بۆببە، لەبەرئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی پێدانی موژدەی خۆش پێی، ئاوای دەکرد، صەحابەکان دەفەرموون: (**أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كانَ إِذا أَتاهُ أَمْرٌ يَسُرُّهُ أَوْ يُسرَّ بِهِ، خَرَّ ساجِداً شُكْراً لِلّهِ تَبارَكَ وَتَعالى**). حَسَنٌ، أَخْرَجَهُ الترمذي: (١٥٧٨) وَ صَحيح سُنَن إِبْنُ ماجَّة: (١١٤٣).

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ هەواڵێکی خۆشی ببیستایە، یان کارێکی دڵخۆشکەری ببینایە سوژدەی شوکری بۆ پەروەردگاری دەبرد.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ یەکەم نۆبەرەی میوەی ساڵی ببینایە، بەم شێوەیە یادی خوای دەکرد. هاوەڵی خۆشەویست (ئەبی هورەیرە) دەفەرمووێ: خەڵکی ئەوەندە پێغەمبەری خوایان خۆشدەویست، کاتێ یەکەم نۆبەرەی میوەیان دەبینی، خۆیان نەیان دەخوارد بەڵکو خێرا دەیانبرد پێشکەشی

پێغەمبەری خوایان دەکرد، پێغەمبەری خواش ﷺ دوعای خێری بۆ دەکردن و لێی وەردەگرتن و دەیفەرموو: (**اللّهُمَّ بارِكْ لَنا فِي ثَمَرِنا، وَ بارِكْ لَنا فِي مَدينَتِنا، وَبارِكْ لَنا فِي صاعِنا، وَبارِكْ لَنا فِي مُدِّنا**).

واتە: خوای پەروەردگار بەرەکەت و فەڕی خۆت بخەیتە ناو بەروبوممانەوە، بەرەکەت بخەیتە شارەکەمانەوە، بەرەکەت بخەیتە کێشانە و پێوانەمانەوە (باری ئابوریمان بەهێزبێ و کاڵای وڵاتمان بێ نرخ نەبێ و پارەمان ڕواجی هەبێ و توشی گرفتی دارایی نەبین).

ئەبی هورەیرە دەفەرمووێ: پاش خوێندنی ئەم دوعایە: (**ثُمَّ يَدْعُوا أَصْغَرَ وَلِيدٍ لَهُ فَيُعْطِيهِ ذالِكَ الثَّمَرِ**) رَواهُ مُسْلِم: (١٣٧٣).

واتە: ئەمجا پێغەمبەری دڵسۆز و بەسۆز، سەیری کەسانی دەوروبەری دەکرد کە لەو شوێنە ئامادەبوون، کێ لە هەمووان تەمەنی کەمتر بوایە لە منداڵان، بانگی ئەوی دەکرد و ئەو میوەی دەدا بە ئەو بیخوات. بەڵێ، هەرکات سەرکردە و لێپرسراوی وڵات ئاوا لە خوای گەورە پاڕایەوە و ئاوا دڵسۆزی میللەت بوو، ئەوەی زۆر نایاب و تایبەتە و تازەیە، نەیخستە بەردەمی خۆی و دەمی منداڵ و خێزانی، بەڵکو خستیە دەمی منداڵێکی بچکۆلەی میللەتەکەیەوە، ئەوە ئەو کاتە خوای گەورە ئەو وڵات و میللەت و گەلە بەختەوەری دونیا و دوا ڕۆژ دەکات و لەبەلا و مەینەتی

بەدوریان دەکات. نەك وەکو بەناو لێپرسراو و سەرکردەکانی ئەمڕۆ لە قوت و دەمی منداڵی خەڵکی دەگرنەوە، بۆئەوەی خۆیان و منداڵیان، لە چاکترین و جوانترین و نایابترین، خواردن و بەرگ و ئوتومبێل و خانوودا بژین.

## کاتی عیبادەت و کاری چاکە:

هەروەها ئەو کاتەی کە عیبادەتێکت ئەنجامدا، شەونوێژت کرد، ڕۆژووی سوننەتت گرت، عومرەت کرد، صەدەقە و خێرت کرد، خێرا یادی خوا بکە، نەوەکو نەفست پێت بڵێ: ئای تۆ زۆر بە دینی، ئەو خەڵکە لەچاو تۆدا هەر عیبادەت ناکەن، نەخێر، بەڵکو وەکو پێغەمبەری پێشەوا ﷺ لە خوای گەورە بپاڕێوە و بڵێ: (**اللّهُمَّ مصرِّفَ القُلوُب، صَرِّفْ قُلوُبَنا عَلى طاعَتِكَ**). رواهُ مُسْلِم.

واتە: ئەی ئەو خوایەی کە دڵەکان هەڵگێڕ و وەرگێڕ دەکەیت، دڵەکانمان ڕووبکەرە، تاعەت و بەندایەتی و گوێڕایەڵی خۆت.

هەروەها کاتێ ڕەوشتێکی جوانت نواند، هەستت کرد دڵێکی میهرەبان و زمانێکی ڕاستگۆ و دەستێکی پاك و بەخشندە و دەرونێکی خاوێن و زانستێکی بە سودت هەیە و خەڵکی لێت ڕازین یەکسەر یادی خوای گەورە بکە و وەکو پێغەمبەری خوا ﷺ لە خوا بپاڕێوە و بڵێ: (**اللّهُمَّ اهْدِني لِأَحْسَنِ الأَخْلاقِ، لا يَهْدي**

لأَحْسَنِها إلاّ أَنْتَ، وَاصْرِفْ عَنِّي سَيِّئَها لا يصْرِف سَيِّئَها إلاّ أَنْتَ). رَواهُ مُسْلِم.

واتە: خوایەگیان هیدایەتم بدەی بۆ چاکترین ڕەوشت، لەبەرئەوەی هیچ کەس ناتوانێ ڕێنمایی و هیدایەتم بدات بۆ جوانترین ڕەوشت، تەنها تۆ نەبێ. خوایەگیان بمپارێزە و لێم بەدووربگرە ڕەوشتە درێو و ناشرینەکان. لەبەرئەوەی کەس ناتوانێ لە کرداری ناشرین و ڕەوشتی ناپەسەند بمارێزێ جگە لە تۆ.

ئیتر ئەم ڕەوشت جوانیەت و پارێزراویت لە ڕەوشتێکی سوك و ناپەسەند، کەکەسایەتیت ورد بکات. بیخەرە پاڵ خوای گەورە، مەڵێ من خۆم ڕۆشنبیرم، کتێبم زۆر خوێندۆتەوە، دونیام زۆر بینیوە. باش پەروەردەکراوم، خولی ڕاهێنانی پەروەردەیی ڕەوشتم بینیوە.. لەگەڵ ئەوەی ئەمانە گرنگ و باشن، بەڵام کێ هاوکار و یارمەتی دەرت بوو، بۆئەوەی ئەمانە بەدەست بێنی؟! تەنها (الله)، چونکە زۆر کەس هەیە و بینیوتە، ئەمانەشی هەیە و ڕەوشتی جوان نیە و لای خەڵکی خۆشەویست نیە، بەڵکو گاڵتە دەکرێ بە شەهادە و بڕوانامەکەی!



## ڕاستیەکی درەوشاوە و حاشا هەڵنەگر

هەر کاتێ مرۆڤ بەردەوام لەگەڵ خوای پەروەردگاری خۆیدا نێوانی ئاوەدان بوو، هەموو خێر و خۆشیەك و بەهرە و خەڵاتێکی

خۆی دەدایە پاڵ خوای بەدیهێنەر و بەخشەری خۆشیەکان، وە سوپاسی خوای لەسەر کرد، خوای گەورەش ئەو مرۆڤە سەرفراز دەکات، وە خۆشیەکانی بۆ زیاد دەکات و بەخۆشی و شادمانی سودیان لێ وەردەگرێ. بە پێچەوانەشەوە، هەرکات مرۆڤ لە خوا غافڵ بوو، ئەوەی لە دەستیدا بوو، ئەوەی هەیبوو بە هی خۆی زانی نەك خەڵاتی خوا، ئەوە با دڵنیابێ کە درەنگ یان زوو لە دەستی دەدا و پەشیمانی یەخەی دەگرێ و پەنجەی حەسرەت دەگەزێ. ئەمەش بەڵێنی خوای گەورەیە کە لە قورئاندا فەرموویەتی: ﴿وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ ۖ وَلَئِن كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ ﴿٧﴾﴾ إبراهيم.

واتە: پەروەردگار بڕیاری داوە: کە ئەگەر ئێوە سوپاسگوزار بن، ئەوە خوای گەورە زۆرتر و زیاترتان پێ دەبەخشێت، بەڵام ئەگەر ناشکور و سوپاس نا پەزێر و بەدنمەك بن، سپڵە و پێ نەزانن بن، ئەوە ئەو کات سزا و تۆڵەی خوا زۆر توند و تیژ و سەختە...

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: (**إِنَّ العَبْدَ لَيُحْرَمُ الرِّزْقَ بالذَّنْبِ يُصيبُهُ**) رَواهُ أحمد.

واتە: مرۆڤ بەهۆی گوناه و تاوانێکەوە کە دەیکا، ڕزقی کەم دەکا و دەبڕدرێ..

## نانی ژێر پێڵاوەکانم بخۆن!!

بەسەرهات

لە وڵاتی لوبنان کارگەیەکی دروستکردنی شیرینی، هی پیاوێکی سەرمایەدار دەبێت، کە لە دوکانێکی بچکۆلەوە دەستی پێکرد و دوای ئەوەی شیرینیەکەی ناوبانگ دەردەکات، وردە وردە گەورەی دەکات تاوەکو دەبێتە کارگەیەکی زۆر گەورە و بەناوبانگ، نەك هەر لەناو (لوبنان) دا، بەڵکو لە وڵاتی دەوروبەر و عەرەبیەوە، پەیمانی لەگەڵ دەبەستن کە هەموو ڕۆژێك لە فڕۆکەی بارهەڵگر، چەند تەن شیرینیان بۆ بنێرێ.

بێگومان ئەم کارە گەورە کارگەی گەورە و دەیان و سەدان وەستا و کرێکاری دەوێت کەکاری تێدا بکەن. ئەم پیاوە بۆ خۆی تەنها سەرپەرشتی پێویستی کڕین و کارگە چاککردن و پارە وەرگرتن و ناردنی لە ئەستۆدایە و، لە نوسینگەی تایبەتی خۆیدا دادەنیشێ و بەدەم چا و قاوە خواردنەوەوە چەندین کوڕی گەنج و خاوەن شەهادە، لە خزمەتی جێبەجێ کردنی فەرمانەکانیدان..

ئالێرەدا کاتی ئەوە بوو، ئەم سەرمایەدارە هەمیشە یادی خوا بکات و وەکو (سولەیمان) پێغەمبەر ـ علیه السّلام ـ کە پێغەمبەرێکی دەسەڵاتدار و دەوڵەمەند و فەرمان جێبەجێ کراو بوو، بەڵام کە ئەو دەسەڵات و قودرەت و بونەی بەخۆیەوە بینی، ئەمە دوعا و دروشمی بوو کە دەیفەرموو: ﴿هَٰذَا مِن فَضْلِ رَبِّي

لِيَبْلُوَنِيٓ ءَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ ۖ وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّي غَنِيٌّ كَرِيمٌ ﴿٤٠﴾ النمل.

واتە: خوایەگیان ئەم دەسەلآت و بون و دەوڵەمەندی و قەدر و حورمەت و جێبەجێ کردنی قسە و فەرمانم، هەر هەمووی فەزڵ و ڕێزی تۆیە، تاقیم دەکەیتەوە بۆئەوەی دەربکەوێت ئایا سوپاسگوزارم، یان سوپاس ناپەرێز و سپڵەم و خۆم لێگۆڕاوە، جائەوەی سوپاسگوزاربێت، ئەوە سودی سوپاسگوزاریەکەی بۆ خۆی دەگەڕێتەوە، ئەوەش کە سپڵە و پێ نەزان بێت و شوکری خوا نەکات، ئەوە هەر خۆی زەرەر دەکات. چونکە پەروەردگارم زاتێکی بێ نیازە و هەر خۆی ڕێزدار و بەڕێز و شکۆمەندە..

بەڵێ دەبوایە خاوەنی ئەم کارگە گەورە شیرینیە، ئاوا یادی پەروەردگاری بەخشەری بکردایە، بەلآم مرۆڤ کە لە خوا غافڵ بوو، زوو لە خۆی دەگۆڕێ، ڕابردووی لە یاد دەچێ کە چۆن بە مەلۆتکەیی هاتە سەر دونیا و خاوەنی هیچ نەبوو، چاوەڕێی قومێ شیری دایکی بوو، کە پێش ئەوەی لە دایك ببێ، خوای پەروەردگار ئەویشی لە مەمکی دایکیدا بۆ ئامادە کردبوو، ئای مرۆڤ کە بیر لە کاتی لە دایکبوونی خۆی بکاتەوە کە چەند بێ دەسەلآت و دەستەوەستان بووە، تەنانەت بەچکەی هەموو زیندەوەرێك لە مرۆڤ چالاکترە لە کاتی لە دایکبوونیدا، مامۆستا هەژار، لە بە کوردی

کردنێکی شعرێکی (د. عەلی شەریعەتی)دا، باسی ئەم دیمەنەمان بۆ دەکات و دەفەرمووێ:

ڕاکشێ، داکشێ، بیرکەوە بیر پێشتر چی بووی منالّی پیر.
ژن و پیاگێ پێك گەیشتن بەچاو بە دڵ تێك گەیشتن.
دڵۆپێك لەو، تنۆكێك لەم لەناو پزدانێك کران جەم.
تێکەڵاوبوون بۆ تەواو بوون گۆڕا ئێسقان و گۆشت و هوون.
نۆ مانگ، نۆ ڕۆژ و نۆ سەعات چاوە چاو بوی تا نۆرەت هات.
ئەتۆش وەکو جوجیلەی مەل مایتەوە تا هەڵکەوت هەل.
تۆکڵت شکاند، پەردەت دڕاند بەرەو ژین لەمپەرت پەڕاند.
تۆ لە جوجك بێ هێزتر بووی بێ دەرەتان و پێزتر بووی.
ئەو دێتە دەر بە جوکە جوك بۆ دان ئەکوتێ پەل و دەندوك.
بەڵام تۆ پلە گۆشتێ شل نەپەل، نە مل، نە گوڕ، نەتل.
چاونەپشکوتوو گوێ نەبیس تەوەزەل،نەگریس، سیس و پیس.
لەناو بێشکە قەتیس و گیر ملّچەی لێوت دەهات بۆ شیر.
زیقەت دەهات، شیرت دەویست دەگریای، دەبنە خۆت دەمیست.
ئێستا چی لەپاش سەد ساڵی چوویتەوە دەقی مندالّی.
چاو نابینێ گوێ ناژنەوێ دانت نەما، شیرت دەوێ.
یەخسیری لەناو جێگادا مۆرەغەت زەوی بەرنادا.
لەوە ڕەزیان ئاغڵەب خەوتووی بێ هێز و پێز لەکارکەوتووی.

هەرسیٚ کارت ماوە لە ژیان خواردن و ڕینەوە و گریان.

(یەك لە پەنای خاڵ و سیفری بیٚ بڕانەوە، و: هەژار).

بەڵیٚ ئەمە مرۆڤە سەرەتای لەدایك بوون و پاشان لە کۆتایی دا پیربونی، تەنها چەند ساڵێکی کەمی گەنجی کە بخوا بەری ڕەنجی، ئیتر بۆچی لە خوا غافڵ دەبیٚ و خۆی ناناسیٚ؟!

ئەم سەرمایەدارە، خاوەن کارە، ڕۆژێکیان بۆ بەسەرکردنەوەی کارگەکەی چووە ناو کارگە و دەستی لە شیرینیەك دا و سەیری دەستی کرێکارێکی دەکرد، تەماشای کرد هەویرەکە وەکو پێویست هەڵنەهاتووە و وەکو ڕۆژان هەمیشە بەرهەمەکەی جوان نیە بێگومان کاری مرۆڤ وایە. هەمیشە و بەردەوام لەسەر جۆرێك نامێنێتەوە و جاروباریٚ، کەم و کورتی تێدەکەویٚ. بەلاٚم ئەم لەخۆگۆڕاوە، بیری ئەمانەی نەکردەوە، هەر یەکسەر ئەو هەویرەی لەبەر دەستی ئەو کرێکارەدا بوو، هێنای خستیە سەر زەویەکە و بەقاچ چوە سەری و بە پێلاٚوەوە ژێر قاچی دا و هەندیٚ قسەی ناشرینی کرد و وتی: ئێستا فێرتان دەکەم هەویر چۆن دەشێلدریٚ!!

یەکیٚ لە کرێکارەکان کە کەسێکی دیندار و خواناس بوو، نرخی نان و کاری دەزانی، پێی وت: قوربان، بەڕێزم، ئاگاداربە، ئەوە تۆ چی دەکەی، تۆ پێلاٚوەکانت، قۆنەرەکانت لە پێدایە، چۆن ئەو

هەویرە کە سەرچاوەی ژیانە، هەموومان ئەوە دەخۆین، خوا ڕێزی لێگرتووە، چۆن جەنابت بە قۆنەرەوە دەچیتە سەری، تکایە وا مەکە؟!

کابرای خاوەن کارگە وەڵامی دایەوە، بەڵام چ وەڵامێك؟! وەڵامێك زۆر ناشیرین و نابەجێتر لەو ڕەفتارەی، وتی:

(عَلى النّاسِ اَنْ يَأْكُلوُا مِنْ تَحْتِ قَدَمَيَّ!!) لەسەر ئەو خەڵکە پێویستە نانی ژێر پێڵاوەکانی من بخوات!!

خۆت نابینی چەند کەس نانی ژێر پێڵاوەکانی من دەخوات؟!

تۆ یەکێکی لەو هەزاران کرێکار و خەڵکەی کە نانی ژێر پێڵاوەکانی من دەخۆن!! بۆیە من بۆم هەیە بەپێڵاوەوە بچمە سەر نان و هەویر!!

بەڵێ مرۆڤ ئەگەر لە خوا غافڵ بوو، وادەزانێ خەڵکی نانی ژێر پێی ئەو دەخوات! نەك ئەویش یەکێکە لە نان خۆرەکان و ئەم دەسەلآت و توانا و هەبونیە، تاقیکردنەوەی خوایە بۆی.

کرێکارەکان زۆر دڵتەنگ و خەمبار بوون، هەویرەکەیان هەڵگرتەوە و وتیان: خوایە بە کرداری ئەو ناشکورە، لە خۆباییە، غەزەب لە ئێمەش نەگری و لە ڕزق و ڕۆزی بێ بەشمان نەکەی.

بەڵام هەر کەس ناشکوری بکات و لە سنوری خۆی دەرچێ، دەبێ پەروەردگار بیهێنێتەوە جێگای خۆی.

هەر بۆیە ئەم پیاوە کەچووە ماڵەوە، هەستی بە ئازارێکی زۆر قورس و بەئێش دەکرد لە قاچەکانیدا، داوای لە ژن و منداڵ و خزمەتکاری دەکرد کە بێنە سەر قاچەکانی و بۆی بشێلن!! بەڵام نەخێر.. سوودی نەبوو!

پەنای برد بۆ دکتۆر و پشکنینیان بۆکرد، دەرکەوت کە توشی نەخۆشیەکی سامناك بوە و پێویستە قاچی ببڕدرێتەوە!! سەرەنجام لەدوای دوومانگ لەو ناشکوری و بەدکرداریەی کە کردی هەردوو قاچی بڕدرایەوە، ئیتر لە ڕووی نەدەهات بەبێ قاچ بڕواتەوە ناو کارگەکەی و چاوی بە چاوی ئەو کرێکارانە بکەوێتەوە، کەلەبەرچاوی ئەوان بەو قاچانەی چووە سەر هەویرەکە و دەیگوت دەبێ خەڵکی نانی ژێر قاچی من بخۆن. بۆیە بڕیاری دا وڵاتی لوبنان بەجێبهێڵێ و ئێستا لە (بەریتانیا) نیشتەجێیە.

بەڵێ ئەی مرۆڤ چی دەکەی بیکە: **(إِعْمَلْ ما شِئْتَ، وَاعْلَمْ أَنَّ حِسابَ اللهِ فِي الدُّنيا حِسابٌ تَرْبَوِي، أَمّا حِسابُهُ تَعالى فِي الآخِرَةِ فَهُوَ حِسابٌ جَزائِي)**. چی دەکەی بیکە، بەڵام باش بزانە لێپرسینەوەی خوای گەورە لە دنیادا لەبەدکاران لێپرسینەوەیەکی پەروەردەکردنە و بە ئاگاهێنانەوەیە تائەو مرۆڤە، لەسەر ئەو خراپە و تاوانەی بەردەوام نەبێ. بەڵام لێپرسینەوەی قیامەتی لێپرسینەوەی پاداشت و سزایە.

(موسوعَة أسماءُ الله الحُسْنَى، د. محمد راتب النابلُسي ج٢ ص٢١٥).

لەبەرئەوە ئەی مرۆڤ هەرگیز لە خوا غافڵ مەبە، هەمیشە یاد و زیکری پەروەردگارت بکە..

ئەگەر خوای گەورە بە لوتفی خۆی شتێکی پێ بەخشی، تۆ خاوەن کار بووی، تۆ لێپرسراو بووی، تۆ فەرمانت دەردەکرد، تۆ خاوەنی کارگەیەك بووی، بازاڕێك بووی، ئوتومبێلی کرێت هەبوو، شۆفێر بە کرێ ئیشی پێ دەکرد، خاوەنی کێڵگە و کشتوکاڵ بووی و خەڵکی کاریان بۆ دەکردی. خاوەنی ئاژەڵ بووی و خەڵکی شوانکاری تۆ بوون، ئەو کاتە زیاتر ئاگاداربە و زیاتر یادی خوا بکە و زمانت ڕابێنە لەسەر حەمد و سەنای خوای گەورە، بڵێ خوایە گیان سوپاس بۆ تۆ ئەو سفرەی کاروکەسابەتە تۆ ڕاتخستوە و بەهۆی منیشەوە کە کارەکەت داوەتە دەستی من..

سوپاس بۆ خوا چوار کەسی تریش سودمەند دەبێت، هەموومان هەر نانەخۆری سەر سفرەی ڕەحمەتی تۆین ئەی پەروەردگارمان..
ئاگاداربە لە سنوری خۆت دەرنەچی و لەخوا غافڵ مەبە. چونکە ئەوە سەرەنجامی غافڵ بوونە لەخوا.

﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةً وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾. **اللّهُمَّ آمين.**



# وانەی چواردەیەم

## بابەت: لە کاتی خۆشی و دەسەلاتدا، سوپاسگوزاری خودابە..

### - بەشی دووەم -

۞ قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى: ﴿وَٱذۡكُر رَّبَّكَ فِي نَفۡسِكَ تَضَرُّعٗا وَخِيفَةٗ وَدُونَ ٱلۡجَهۡرِ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ بِٱلۡغُدُوِّ وَٱلۡأٓصَالِ وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلۡغَٰفِلِينَ ﴿٢٠٥﴾﴾ الأعراف.

۞ قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (مَثَلُ الَّذي يَذْكُرُ رَبَّهُ وَ الَّذي لا يَذْكُرُ رَبَّهُ مَثَلُ الحَيِّ وَ المَيِّتِ). رَواهُ البُخاريُّ: (٦٤٠٧) وَ مُسْلِم: (٧٧٩).

سەرچاوەکان:

١) تەفسیری ڕامان، م. ئەحمەد کاکە محمود.

٢) تەفسیری ڕۆشن، م. بورهان محمد أمین، پێداچوونەوەی: د. سید أحمد عبدالوهّاب.

٣) ریاضُ الصّالحین بە کوردی، وەرگێڕانی، م. نوری فارس حمەخان ب٣، ل١٧، ل٢٠٠.

٤) مَوْسوعَة غَرائِبِ القِصَص، د. أحمد بن سالم بادويلان.
٥) شَرح رياض الصّالحين، الشَّيخ محمد بن صالح العُثَيمين.
٦) بەرەو ئیسلام، ئاینێکی جیهانی، ئەندازیار عثمان ل٥٤.
٧) خود پەسەندی، فاتح مەلا رسول شارەستێنی، ل٢٧.
٨) الجامِع في الدُّعاءِ النّافِع، صالح بن طه عبدالواحِد، ص٤٨٨.
٩) موسوعَة نَظْرَة النَّعيم، ج٥ ص١٩٩٧.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحَمْدُ للهِ رَبِّ العالَمين، و الصَّلاةُ وَ السَّلامُ عَلى سَيِّدِنا محمد وَ علَى آلهِ وَ صَحبهِ أجْمَعينَ:

ژیانی دونیا شوێنی تاقیکردنەوەی مرۆڤەکانە، ڕۆژی قیامەتیش، کاتی وەرگرتنەوەی پاداشتی کردەوەکانە، وەکو لە قورئاندا بە ﴿يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾ ڕۆژی پاداشت و سزا ناوی هاتووە. جا خوای بەبەزەیی و میهرەبان، لە ڕێگەی پێغەمبەران و کتێبە ئاسمانیەکانی خۆیەوە، هەمیشە و بەردەوام مرۆڤایەتی ئاگادارکردۆتەوە کە لەم هۆڵی تاقیکردنەوەی ژیانی دونیادا چی بکەن، سەرفراز دەبن وە بەچی گوفتار و ڕەفتارێك سەرگەردان دەبن.

دەتوانین بڵێین پوختەی پەیامی پێغەمبەران. سەلامی خوا لە هەموویان بێ. وە لەوەدا کۆبۆتەوە کە ئەم مرۆڤە لە خوای خالیقی خۆی غافڵ نەبێ. بۆئەوەش کە لە خوا غافڵ نەبێ، پێویستی بەوە هەیە کە هەمیشە یاد و زیکری پەروەردگار بکات. وەکو خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرمووێ: ﴿وَٱذۡكُر رَّبَّكَ فِي نَفۡسِكَ تَضَرُّعٗا وَخِيفَةٗ وَدُونَ ٱلۡجَهۡرِ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ بِٱلۡغُدُوِّ وَٱلۡأٓصَالِ وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلۡغَٰفِلِينَ ﴿٢٠٥﴾﴾ الأعراف.

واتە: ئەی پێغەمبەری خۆشەویستم، وە ئەی هەموو ئیمانداران بە گشتی، هەمیشە لە دڵ و دەرونی خۆتا، بە خۆشەویستی و سۆزەوە و بە نهێنی یادی پەروەردگارت بکە، لە بەرەبەیانەکان و دەمەو ئێوارانداا، هەوڵبدە لەو کاتانەدا بە تایبەت و لە هەموو کاتێکدا لە غافڵ و بێ ئاگایان مەبە، ئەوانەی دڵیان غافڵە و دنیا مەست و حەیرانی کردون..

بەڵێ، لە قورئاندا خوای گەورە حیکمەت لە ناردنی پێغەمبەران و کتێبە ئاسمانیەکان بۆ مرۆڤایەتی، لەوەدا کورت دەکاتەوە، کە ئەم خەڵکە لە خوا غافڵ نەبن. چونکە خوای گەورە هێندە دادپەروەرە تاوەکو پێغەمبەر بۆ گەل و نەتەوەیەك نەنێرێ و خوایان پێ نەناسێنێ. ڕاستەوخۆ سزایان نادات. بەڵکو سزادانیان بەهۆی ئەوەوەیە کە لەدوای ناسینی خوا لێی غافڵ بن. وەکو دەفەرمووێ: ﴿ذَٰلِكَ أَن لَّمْ يَكُن رَّبُّكَ مُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا غَٰفِلُونَ ﴿١٣١﴾﴾ الأنعام.

واتە: حیکمەت لە ناردنی ئەو پێغەمبەر و فروستادانە لەبەئەوەیە چونکە پەروەردگاری تۆ نەیکردووە بە عادەت کە لەناوبەری شار و دێهاتەکان بێت بە ناحەق، لە کاتێکا خەڵکەکەیان غافڵ و بێ ئاگابن و پەیامی خوایان پێ ڕانەگەیەندرابێت.

خوای گەورە لە قورئاندا باسی هۆکاری چونە دۆزەخمان بۆ دەکات. کە خاڵی سەرەکی بریتیە لەخوا غافڵ بوون. وەکو دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا وَرَضُوا۟ بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَٱطْمَأَنُّوا۟ بِهَا وَٱلَّذِينَ هُمْ عَنْ ءَايَـٰتِنَا غَـٰفِلُونَ ﴿٧﴾ أُو۟لَـٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٨﴾﴾ يونس.

واتە: ئەوانەی کە بەتەمای ئامادەبوون نین لە بەردەم دادگای تەواو دادی ئێمەدا و لە لێپرسینەوەی ئێمە ناترسن و هەر بە ژیانی دونیا ڕازین و دڵیان پێوەی خۆش و بەندە، ئەوانەی کە بە چاوی دڵ ناڕوانن بۆ ئایەتەکانی ئێمە لە بونەوەردا و بە دڵ گوێبیستی قورئانەکەی ئێمە نابن و خۆیانی لێ گێل دەکەن. ئائەوانە شوێنی حەسانەوەیان ئاگری دۆزەخە، لە دەرەنجامی ئەو کار و کردەوە و کەسابەتەیاندا کە لە دنیادا ئەنجامیان دەدا..(تەفسیری ڕۆشن).

## پێغەمبەری دڵسۆز و پێشەوامان ﷺ هەموو ژیانی یادی خوا بوو:

وەك خۆی بۆ ئێمەش، بۆ هەموو هەنگاو و هەڵوێستێکمان، زیکر و پاڕانەوەیەکی دیاری کردووە، کە خۆی لە ژیانیدا هەمیشە خوێندویەتی. یەکێ لەو زیکرانە ئەوەیە کەکاتێ سەفەرت کرد و ماڵ و خێزانت بەجێهێشت، ئەم زیکرە بکە و ئاوا لە خوا بپاڕێوە کە

پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوا لە خوای گەورە دەپاڕایەوە و دەیفەرموو: **(اللّهُمَّ إنّا نَسْأَلُكَ فِي سَفَرِنا هذا البِّرِ وَ التَّقْوى، وَمِنَ العَمَلِ ما تَرْضَى، اللّهُمَّ هَوِّنْ عَلَيْنا سَفَرَنا هذا وَ اطْوِ عَنّا بُعْدَهُ، اللّهُمَّ أَنْتَ الصّاحِبُ فِي السَّفَرِ وَ الخَلِيفَةُ فِي الأَهْلِ . اللّهُمَّ إنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ وَعْثاءِ السَّفَرِ وَ كَآبَةِ المَنْظَرِ، وَسُوءِ المُنْقَلَبِ فِي المالِ و الأَهْلِ وَ الوَلَدِ)**. رَواهُ مُسْلِم: (٣٢٧٥) وَ أَحْمَد: (٦٣٧٤).

واتە: خوایە گیان داوات لێدەکەین لەم سەفەرەماندا خێر و چاکە و تەقوا و لە خوادا ترسانمان بە نصیب بفەرموو، هەروەها کارێکیش کە جێگەی ڕەزامەندی تۆ بێ، خوایە گیان ئەم سەفەرەمان بۆ ئاسان بفەرموو، وە ڕێگەی دورمان بۆ نزیك بکەرەوە، خوایە هاوڕێی تەواو لە سەفەردا هەر خۆتی، خۆتیش چاودێری کەس و کارمانی، پەروەردگارم پەنات پێ دەگرم، لە ڕەنج و مەینەتی ڕێگە و بان و سەفەر، وە لە چوونەوە بەسەر دیمەنی خراپ و حاڵی ناخۆشی ماڵ و منداڵ و خێزاندا، وە بمانپارێزی لەوەش کە بەپەستی و دڵتەنگی لەم سەفەرەم بگەڕێمەوە.

بەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ کە لە ماڵ دەردەچوو دەڕۆیشیت بۆ سەفەر، ئەم زیکر و دوعایەی دەکرد، کاتێکیش دەگەڕایەوە لەسەفەرەکەی و دەگەیشتە ماڵەوە، هەمان زیکری دەکردەوە وئەمەشی لێ زیاد دەکرد: **(آيِبُونَ تائِبُونَ عابِدُونَ لِرَبِّنا**

حامِدوُنَ). ئەوا بە پشت بەستن بە خوا دەگەڕێینەوە بۆ ماڵەوەمان، وە لە گوناهەکانمان پەشیمانین، هەمیشە بەندەیی ساغ بۆ خودای پەروەردگارمان دەکەین و لە سوپاس و ستایشی درێغی ناکەین. (ریاض الصّالحین، بە کوردی. ب٣، ل١٧، م. نوری فارس).

باشە سەفەر و چوونە دەرەوە لە ماڵ ئەم زیکر و دوعایەی دەوێ؟! بەڵێ بەبێ گومان چونکە تۆ چەندە پارەداربی و ئوتومبێلت باش بێ و لەسەفەردا لە هیچت کەم نەبێ. ئەگەر خوا ڕەحمت پێ نەکات. ئایا دەتوانی ماڵ و منداڵت بپارێزی؟!

ئایا ئەگەر خوا بە ڕەحمی خۆی نەتپارێزێ کێ هەیە بتپارێزێ لەوەی کە لەسەفەر گەڕایتەوە بەسەر دیمەنی خراپ و حاڵی ناخۆشی ماڵ و منداڵتا نەیەیتەوە؟! لەبەرئەوەی دەیان و سەدان کەس پێش تۆ سەفەریان کردووە و کە گەڕانەوە بەسەر خەم و خەفەت و لە دەستدانی ئازیزان و وێران بوونی ماڵیاندا هاتنەوە، دەی لەخوا غافڵ مەبە و بە دڵی پڕ لە کوڵ و بەرزکردنەوەی دەستی نزا بۆلای خوای گەورە، ئاوا لە خوا بپاڕێوە.



## دوای سەفەرێك منداڵ و ژنەکەی لەدەستدا!!

بەسەرهات

ژن و پیاوێك ژیانێکی خۆش و باشیان هەبوو، هێشتا ساڵانێکی زۆر بەسەر هاوسەرگیریاندا تێنەپەڕی بوو. چونکە منداڵی یەکەمیان، کە هەر ئەو منداڵەیان هەبوو، تەمەنی لە دەوری (دووساڵ و نیودا)بوو، منداڵێکی زۆر عەجول و بزۆز بوو، ڕۆژێکیان پیاوەکە هاتەوە ماڵەوە و بە ژنەکەی وت: هەر ئێستا پێیان ڕاگەیاندم کە دەبێ بڕۆم بۆ سەفەرێك کە پەیوەندی دارە بە کارەکەمەوە، وە ماوەی چوار ڕۆژ یان زیاترم پێدەچێ، لەبەرئەوە تۆش خۆت حازربکە با لەگەڵ منداڵەکەماندا بت گەیەنمە ماڵی باوکت و ئەم ماوەیە خۆتان لەوێ بن، با لە ماڵەوە هەست بە بێ تاقەتی نەکەن و منیش دڵم ئاسودەتر بێ..

بەڵام ژنەکە ماڵ و حاڵی تەڕ کردبوو، بە تەمای شۆردنی ماڵ بوو، وە کۆمەڵێ جل و بەرگی دانابوو بۆ شتن، بۆیە بە مێردەکەی وت: لەبەرئەوەی تۆ زۆرت پەلەیە و منیش ناتوانم وا بەزوویی حازر و ئامادەبیم و ئەم جل و بەرگ و ماڵە ئاوا بە تەڕی بەجێبهێڵم، تۆ بڕۆ با دوانەکەوی و دوایی من خۆم تەکسیەك دەگرم، یان تەلەفۆن بۆ برایەکم دەکەم بێت بە شوێنماندا، مێردەکەی ڕەزامەندی نواند و خواحافیزی کرد و ڕۆشت بەرەو سەفەرەکەی.. ژنەکەش چووە حەمامەکەوە و دەستی کرد بە جل شۆرین.

ئالەم کاتەدا منداڵەکەی لەدەورروبەری دەهات و دەچوو یاری دەرکرد. بەڵام دەزانن چی ڕوویدا؟!

ئەوەی چاوەڕوان نەدەکرا ئەوە ڕوویدا، منداڵەکە دەرگای حەمامەکەی لەدایکی پێوەدا و کلیلەکەی لەدەرەوە بە دەرگاکەوە بوو، دەگاکەی داخست!!

بەم شێوەیە دایکەکە لەناو حەمامەکەدا گیری خوارد. هیچ مۆبایل و ئامێرێکی پەیوەندی کردنی پێ نەبوو، تا پەیوەندی بە کەس و کاریەوە بکات و بێن دەرگای لێ بکەنەوە، ماڵی باوکی ئەم ئافرەتەش ئاگاداری سەفەری زاواکەیان نەبوون، چونکە پێشتر بەرنامەی سەفەری نەبوو، منداڵی بەستەزمانیش توانای کردنەوەی دەگاکەی نەبوو، کلیلەکەی بۆ با نەدەدرا!!

ئەم دایکە نەیدەزانی چی بکات. چەندە هەوڵی دا دەرگاکەی بۆ نەکرایەوە، منداڵەکەش لەم دیوەوە دەگریا.. شەو بەسەردا هات. دایکەکە لە تاوان هاواری دەکرد و لە پەنجەرەی حەمامەکەوە داوای هاوکاری دەکرد. بەڵام ئەوەی کارەساتەکەی قورسترکردبوو ئەوەبوو کە ماڵەکەیان هیچ دراوسێیەکی نزیکی وای لێنەبوو، کە دەنگی ئەمی پێبگات. چونکە ئەو گەڕەکە تازە دروست کرابوو، ماڵی ئەمان هێشتا دەورروبەری چۆڵ بوو!!

ئەزانن موصیبەتێکی تری ئەم گیرخواردنە چی بوو؟! گلۆپی حەمامەکە و ڕاڕەوەکە کوژابۆوە چونکە بە ڕۆژ دەیانکوژاندەوە وە

سویچ پلاکەکەش لەدەرەوەبوو، دایکەکە دەستی پێ نەدەگەیشت و منداڵەکەش نەیدەزانی چۆن هەڵی بکات و ئەوە چیە ! !

بۆیە تەواوی شوێنەکە سام و هەیبەتێکی قورسی لێ نیشتبوو، دایکەکە لە ژوورەوە لەو تاریکیەدا هاواری دەکرد و منداڵەکەشی لەبەر هاواری دایکی و تاریکی جێگاکە و برسیەتی و تینویەتی دەگریا و دەلالایەوە ! !

خۆی بە دەرگاکەوە نوساندبوو، تا دەنگی نوسا هەر هاواری دەکرد. دایە، دایە، دایە! دایکی بێ چارەش هەر دەیگوت: ڕۆڵەکەم. ڕۆڵەکەم. ڕۆڵە جوانەکەم..

ماوەی سێ شەو و ڕۆژ بەم شێوەیە مانەوە، منداڵەکە وردە وردە لە جوڵە و دەنگ کەوت و لە ڕۆژی چوارەمدا لە ترسان و لە برسان و تینوان مرد و گیانی لەدەست داو لەبەردەم دەرگاکەدا ئەو جەستە ناسك و جوانە بێگیان کەوت! !

دایکی جەرگ بە برین و دڵ سوتاو بۆ کۆرپەکەی هەر لە خۆی دەدا و هاواری دەکرد، بەڵێ ئەمجا کابرا لەسەفەر گەڕایەوە کلیلی مەدخەلی پێبوو دەرگاکەی کردەوە و چووە ژوورەوە، ژنەکەی کە زانی دەرگا کرایەوە هاوارێکی کرد. کابرا سەری سوڕما، ئەمە کێیە لە ماڵەکەماندا، خۆ ژن و منداڵەکەم چوون بۆ ماڵی خەزوورم! !
بۆیە بەپەلە بەرەو دەنگەکە ڕۆیشت. بەلام چی بینی!

خوایە گیان ئەمە ڕاستە دەیبینم؟! تۆ بڵێی ئەمە خەون نەبێ! یانی چی ئەوە كوڕە تاقانەكەمە، ئەوە جگەرگۆشەكەمە، وا لەوناوە كەوتووە و گیانی تیا نەماوە، ئەمە بەچی وای لێهاتووە؟! خێرا دەرگای حەمامەكەی كردەوە كە بە كلیل داخرابوو.. چی بینی، دیمەنێكی زۆر سامناك. ئای ئەوە ژنەكەیەتی. ئەوە هاوسەر و هاوژینەكەیەتی. ئەوە خانمیماڵەكەیەتی كە نمونەی جوانی بوو، ئای خۆ ئەوە تەواوی موی سەری سپی بووە، ئەوە هەموو پێستی دەم و چاوی خۆی داڕنیوە، خۆئەوە شێت بووە!!

بەڵێ منداڵەكەی لەدەست دا و ژنەكەشی برایە خانەی سەرپەرشتی نەخۆشی دەروونی و شێتەكان!!

بەڵێ ئەمە ئەو (سُوْ المُنْقَلَبِ فِي المالِ و الأَهْلِ وَ الوَلَدِ) كە پێغەمبەری خوا ﷺ فێری كردین پەنا بگرین بە خوای گەورە لەم حاڵەتانەدا كاتێ كە ڕۆشتین بۆ سەفەر، هەروەكو ئەم پیاوە كە هاتەوە، نە ژن ما، نە منداڵ ما، نە ماڵی جارانی پڕ لە خۆشی و خەندە ما. هەمووی تەواو بوو.

( مَوْسوعَة غَرائِبِ القِصَص، د. أحمد بن سالم بادويلان).



## پەنابگرن بەخودا لەم چوار بەڵایە:

پێغەمبەری خوا ﷺ، صەحابەکان و هەموو ئوممەتەکەی ئامۆژگاری کرد، کە پەنا بگرن بە خوای گەورە لەوەی توشی ئەم چوار بەلایە ببن.. فەرمووی: (**تَعَوَّذُوا بِاللهِ مِنْ جَهْدِ البَلاءِ، وَدَرَكِ الشَّقاءِ، وَسُوءِ القَضاءِ، وَشَماتَةِ الأعْداءِ**). متفق عليه: بُخاري: (٦٦١٦) وَ مُسْلِم: (٦٨٧٧).واتە: پەنا بگرن بە خوای گەورە لەمانە و بلێین:

١) (**جَهد البلاء**) خوایە پەنات پێدەگرین بمانپارێزی لە بەلای برس بڕ و توانا پڕوکێن. (شيَخ إِبن عُثيمِين) لە شەرحی ئەم فەرموودەیەدا فەرموویەتی: بەلا و ناڕەحەتی سێ جۆرە:

یەکەم: بەلای جەستە وەکو نەخۆشی و پەککەوتنی یەکێ لە ئەندامانی جەستە یان زیاتر.

دووەم: بەلای مەعنەوی، وەکو توشبونی مرۆڤ بە کەسێك کە هەمیشە چاودێری کاروکردەوەکانی بکات. وەکو ڕەفیقی خراپ، دراوسێ دوکانی خراپ، دراوسێ ماڵی خراپ، هاوپیشەی خراپ. کە هەمیشە بتخاتە ژێر چاودێریەوە بۆئەوەی ئەگەر خراپەیەك. هەڵەیەکت لێ ڕودا، بە هەموو دونیای بگەیەنێ و بیکاتە باس و بابەتی هەموو کۆڕ و دانیشتنێك. خۆئەگەر دەیان چاکەشی لێ بینی بیشارێتەوە.

سێهەم: بەڵای دین و ئیمان، ئەویش بەوەی مرۆڤ دڵ و دەرونی وای لێبێ ئەگەر تووش خێر و خۆشی و چاکە بوو، ئەوە زۆر پێی شادمان و دڵ ئارام بێ. بەڵام ئەگەر توشی زەرەر و شکست و نارەحەتیەك بوو دەست بکات بە ناشکوری و -پەنا بەخوا- کوفرکردن و دەست هەڵگرتن لە نوێژ و ڕەخنەگرتن بە زمان و بە دڵ لە کاری خوای گەورە ـ **نَعُوذُ باللهِ** ـ کە بۆچی خوای گەورە ئەمەی توش کردووە.

هەروەکو خوای گەورە لە قورئاندا باسی ئەو جۆرە کەسانە دەکات و دەفەرمووێ: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعۡبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرۡفٖۖ فَإِنۡ أَصَابَهُۥ خَيۡرٌ ٱطۡمَأَنَّ بِهِۦۖ وَإِنۡ أَصَابَتۡهُ فِتۡنَةٌ ٱنقَلَبَ عَلَىٰ وَجۡهِهِۦ خَسِرَ ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةَۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡخُسۡرَانُ ٱلۡمُبِينُ ﴿١١﴾﴾ الحج.

واتە: هەندێ لە خەڵکی هەیە کە تەنها لەیەك حاڵەتدا خواپەرستی دەکات. ئەویش ئەو کاتەی کە دونیا بەدڵی ئەو بێت. ئەگەر توشی خێر و خۆشی بوو، دڵی پێی خۆشە، ئەگەر ئەو ساڵە مەڕ و ماڵات و دەغڵ و دانەوێڵەکەی بە ئارەزووی ئەو بوو، ئەوا بە خوا پشت ئەستور و دڵنیا دەبێ و دەڵێ: ئاینی ئیسلام ئاینێکی زۆر بە پیت و پیرۆزە. خۆ ئەگەر گرفتار بوو، توشی تاقیکردنەوەیەك هات، بەڵایەکی توشبوو. سواری سەری خۆی دەبێت و هەڵدەگەڕێتەوە و ئەڕواتەوە سەر باری خراپی پێشووی

خۆی و سەنگەری خەبات دەگوازێتەوە، ئابەو هەڵوێستەی دنیا و قیامەت لە دەست خۆی دەدات و زەرەرمەندە لە هەردوو جیهاندا. بێگومان ئائەوە خەسارەتمەندییەکی ڕوون و ئاشکرایە.

بەڵێ لەبەرچاوگرتنی زیان و قازانج بۆ ماڵ و سامان و بازرگانی دەست دەدات، بەڵام بۆ عەقیدە و ئایدیالۆژی و خواپەرستی هەرگیز دەست نادات و ناگونجێت، نابێ لەسەر حیسابی قازانج و زیان عەقیدە وەربگیرێ و خواپەرستی بکرێ..

بەڵێ دەبێ موسڵمان هەمیشە پەنا بگرێ بە خوای گەورە کە بیپارێزێ لەو بەلا و ناڕەحەتیانەی کە لە توانادانین و تاقەت پڕوکێنن لە هەمووان گەورەتر بەڵای ئەوەی کە مرۆڤ دیندارییەکەی شلۆق بێ!.

٢) وَدَرَكَ الشَّقَاءِ: خوایە پەنات پێدەگرم بمپارێزی لە توشبوونی نەگبەتی و لە یەخەگرتنی چارە ڕەشی.. بێگومان چارەڕەشی پێچەوانەی بەختەوەری و خۆشبەختیە، بەختیاریش سەرچاوەکەی کاروکردەوەی چاکە. هەروەکو نەگبەتی و چارەڕەشیش سەرچاوەکەی کاروکردەوەی بەد و خراپە، کەواتە: ئەگەر پەنات گرت بە خوا لە بەدبەختی و چارەڕەشی یانی خوایە بمپارێزی لە کاروکردەوەی چارەڕەشان و نەگبەت و خراپەکاران، بۆئەوەی لار و لەوێر و بەدبەخت نەبم.

٣) وَ سُوءِ القَضاءِ: خوایە پەنات پێدەگرم بمپارێزی لە چارەنوسی خراپ. ئەمەش دوو مانا هەڵدەگرێ:

یەکەم: مرۆڤ هەندێ جار بە هەوا و ئارەزووی خۆی کاردەکات و ناگەڕێتەوە بۆ شەرع و کاری بەپەلە دەکات و ئارامی نیە و هەڵبەز و دابەزی زۆرە و بەم شێوەیە توشی دادگا و لێپرسینەوە دەبێ و سەرەنجام بەهۆی ڕەفتارە ناپەسەند و نایاساییەکانی یەوە دادگا لە دژی حوکم دەدا و چارەنوسی خراپ چاوەڕێی دەکات. لێرەدا مرۆڤ لە خوا دەپاڕێتەوە کە بیپارێزێ لەکاروکردەوەیەك کە لەبەردەم دادگا و لێپرسینەوەدا، حوکمی یاسا و داگا لە دژی بێ و لێی ڕزگار نەبێ. هەر بۆ نمونە:

جاری واهەیە کەسێك ڕقی لە کەسێك هەڵدەستێ هەر خێرا مۆبایلەکەی هەڵدەگرێ و کۆمەڵێ قسەی ناشیرین و هەڕەشەی لێدان و کوشتنی لێ دەکات، لەناکاو ئەم هەڕەشە لێکراوە دەکوژرێت، دادگا بەڵگەی قسەکانی ئەمی لە مۆبایلەکەی وەرگرتووە، کە هەڕەشەی کوشتنی کردووە، هەرچەندە ئەمیش ئاگای لێ نەبێ و دەستی لەم کوشتنەدا نەبێ. بەڵام بەهۆی ئەم حاڵەتە هەڵچوون و لەدەستدانی شێوازی قسەکردنە، دادگا ئەم بە تاوانبار دەناسێنێ و لە دژی ئەو حوکم دەدات و چارەنوسی ڕەش و خراپ چاوەڕێی دەکات.

دووەم: یان داوا لە خوای پەروەردگار دەکەی کە لەو بڕیارەی کە خوای گەورە لەلایەن خۆیەوە بۆ چارەنوسی مرۆڤی نوسیوە و ئەمی پێ توشی خەم و خەفەت و ئازار و ناڕەحەتی دەبێ، داوا لە خوا دەکەی کە خوایە گیان لەو چارەنوسە خراپە بمپارێزە و بۆم بگێڕەوە بە خێر و خۆشی، وە هەموو کارێ بۆ خوا ئاسانە.

٤) **وَ شَمَاتَةِ الأَعْدَاءِ**: خوایە پەنات پێدەگرم بمپارێزی لەوەی توشی شتێ ببم کە دوژمنم پێم خۆشحاڵ و شادەکام بێ..

جا دوژمن هەر ئەو کەسە نیە کە چەکی دژت هەڵگرتووە و بە تەمایە بتکوژێ و لە هەل و دەرفەت دەگەڕێ. بەڵکو هەر کەسێ بە خۆشبەختی و خۆشی و سەرکەوتن و سود و قازانجی تۆ، خەمبار و دڵتەنگ بوو. وە بە پێچەوانەوە، بە نەخۆشی و ناخۆشی و هەژاری و قەرزداری و دەست تەنگی و داماوی و گرفتاری تۆ خۆشحاڵ بوو، ئەوە دوژمنتە، با لەلای خۆشت خۆی بە دۆست نیشان بدات و بەدەم و زمان بڵێ: هاوبەشی خەمتم.. بەڵام لە دڵەوە، ئۆخەی خۆزگە خراپتری لێ بقەومایە، دوعای خراپی بێ بۆت!! جا پەنا بگرە بە خوای گەورە لە هەرشتێ کە دوژمنت پێ خۆش بێ.

ئەمە چوار شت بوو کە پێغەمبەری پێشەوا و دڵسۆزمان ئاماژەی پێکرد، کە پەنابگرین بە خوای گەورە کە بمانپارێزێ لێیان. دە با لەخوا بپاڕێینەوە بە ئومێدی خوا دەمانپارێزێ. لەبەرئەوەی ئێمە

ئەگەر خوای گەورە پارێزگاریمان لێنەکات و بە ڕەحمی خۆی و بە پەنای خۆی پەنامان نەدات هەمیشە لە مەترسیداین کە لەم جۆرە بەڵایانە یەخەمان پێ بگرێ.

## دوعایەك پێغەمبەرﷺ وازی لێنەهێناوە:

عبدالله ی کوڕی عومەر (ڕەزای خوا لە خۆی و باوکی بەڕێزی بێ) دەفەرمووێ: پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ کات وازی لە خوێندنەوەی ئەم دوعا و پاڕانەوەیە نەدەهێنا، لە کاتی ئێواران و بەیانیاندا دەیخوێندن و دەیفەرموو:

**(اللّهُمَّ إنّي أسْأَلُكَ العَفْوَ وَ العافِيَةَ في الدُّنيا وَ الْآخِرَة اللّهُمّ إنّي أسْأَلُكَ العَفْوَ وَ العافِيَةَ في ديني وَ دُنياي وَ أهلي وَمالي، اللّهُمَّ اسْتُرْ عَوْراتي وَ آمِنْ رَوْعاتي، واحفظني مِنْ بَيْنِ يَدَي وَمِنْ خَلْفي وَعَنْ يَميني وَعَنْ شمالي وَمِنْ فَوْقي، وَ أعوذُ بِكَ أنْ أغتال مِنْ تَحْتي)** حَديثٌ صَحيح، صَحيح سُنَن ابي داود: (٤٢٣٩) وَ صَحيح سُنَن إبن ماجَة: (٣١٢١).

واتە: خوای گەورە و میهرەبان یا الله لێت دەپاڕێمەوە و داوات لێدەکەم، کە هەرچی خێر و خۆشی و سەلامەتی و بێوەیی دونیا و قیامەتە پێم ببەخشی.. خوایە دین و دونیام سەلامەتی و خۆشی و سەرفرازی بێ، خوایە داوات لێدەکەم ماڵ و منداڵ و خێزان و نەوە و باوانم ساغ و سەلامەت بکەی و لە بەڵا و ناخۆشی و نەخۆشی خراپ بیانپارێزی.. خوایەگیان، یا الله داوات لێدەکەم کە ماڵ و

سامانم بەرەکەتدار بکەی و توشی خێریم و لە شکست و زەرەر بمپارێزی.. خوایە حەیا و حورمەتم داپۆشی و کەم و کورپیم بۆ پەردەپۆش بکەی و ئابڕوو کەرامەتم سەلامەت بکەی.. خوایە هەموو ترسەکانم لێ بە دوور بگری و ئەمین و بێوەیم بکەی.. خوایە بمپارێزی لە بەردەمم و لە دواوەم و لەلای ڕاست و لەلای چەپم و لەسەرومەوە، پەنات پێدەگرم لەوەی کە زەوی لە ژێر قاچمدا ڕۆبچێ..

سەرنجێك: پێغەمبەری خۆشەویستمان لە دوعاکەیدا فەرمووی: (وَ آمِنْ رَوْعاتي) خوایە ترسەکانم لەسەر لابەری، ترسی نەخۆشی، ترسی هەژاری، ترسی موحتاجی دەستی خەڵکی، ترسی بەڵای لابەلا، ترسی منداڵی خراپ، ترسی هاوسەری خراپ، ترسی دراوسێی خراپ، ترسی هاوڕێی بێ وەفا، ترسی بازاڕی پڕ غەش و تەزویر، ترسی سیاسیە درۆزنەکان.. ترسی ئەو نەخۆشیانەی کت و پڕ توشی مرۆڤ دەبن و پێشتر ناویشیان نەبیستراوە.

بەسەرهاتێك: کابرایەك توشی نەخۆشی چاو بوو، کە موو لە چاوی دەهات، چاوێکی کوێربوو!! بۆئەوەی چاوەکەی تریشی لەدەست نەدات، بەردەوام سەردانی ئەڵمانیای دەکرد بۆ عیلاج، ئەم جۆرە نەخۆشییەی ئەم پیاوە، لە پێنج ملیۆن کەسدا، یەك

کەس توشی دەبێت!. (بەرەو ئیسلام، ئاینێکی جیهانی، ئەندازیار عثمان ل ٥٤ — ٥٥).

بەڵێ نەخۆشی واهەیە زۆر دەگمەنە و خەڵکانێك دەبینین توشی بووە، ئەوە فەزڵی خوایە ئێمەی پاراستوە. بەندە (نوسەری ئەم کتێبە). لە تەکسیدا بووم، لە شارۆچکەی پیرەمەگرونەوە دەچوم بۆ سلێمانی، مانگی یەکی ساڵی (٢٠١٣) بوو، ڕۆژێکی زۆر سارد و سەرما بوو، گەنجێك بەو سەرمایە ناو بەناو جامی ئوتومبێلەکەی دێنایە خوارەوە و دەستی دەبردە دەرەوە، لێمان پرسی: بۆچی بەم سەرمایە وادەکەی؟!

وتی: سەیری دەستم بکەن بەم سەرمایە چۆن عەرەقی پێدا دێتە خوارەوە، شۆفێرەکە کلێنسی زۆری دایە دەستی پێ بسڕێ. بەڵام هەر فریای نەدەکەوت. دەیگوت: ڕۆژی چەند جارێ ئەم عەرەقە لە دەستم دێتە دەرەوە و عەرەقێکی زۆر ساردە، هەتا دەستم بە ئاو نەشۆم، عەرەقەکە ناوەستێ. زۆر پێوەی ناڕەحەت بوو، دەیگوت: ژیانم لێ تاڵ بووە، هەروەها وتی: دایکیشم وەکو من ئاوا عەرەق لە دەستی دێتە خوارەوە!!

<u>**زانیاریەك:**</u> سُبْحانَ الله هەموو جەستە عەرەق دەردەدات تەنهائەم شوێنانە نەبێ:

١) گۆی مەمکی ئافرەت: بۆئەوەی منداڵی شیرەخۆرە، ئەو سوێری و عەرەقەی سەر گۆی مەمکی دایکی نەمژێ.

٢) پێستی برژانگ لە چاودا، بۆنەوەی عەرەق نەچێتە چاوەوە.

٣) هەردوو لێو، ئەینا دەبوایە هەمیشە لێومان بسڕیایە، تا بە عەرەقە سپی نەبێ!.

٤) ئەندامی زاوزێی نێر و مێ. عەرەق ناکەنەوە.

٥) زمان. ئەگەر زمان عەرەقی بکردایەتەوە. هەمیشە تامی سوێری لە دەمماندا دەبوو، وە دەممان بۆنی ناخۆشی لێدەهات.

بۆیە هەمیشە یادی خوا بکە و سوپاسی بکە و لە خوا غافڵ مەبە.

پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوعاکانیدا بەم شێوەیە لەخوای گەورە دەپاڕایەوە و ئێمەی ئوممەتیشی فێرکرد کە ئاوا لە خوای خۆمان بپاڕێینەوە، دەیفەرموو: (**اللّهُمَّ لا تَكِلْني إلى نَفْسي طَرْفَةَ عَيْنٍ، وَلا أَقَلَّ مِنْ ذلِكَ**). خوایەگیان بۆ چاوتروکانێك و کەمتر لە چاوتروکانێك نەمسپێری بەخۆم. چونکە لەو ماوەهەرە کەمەشدا ناتوانم بە کەڵکی خۆم بێم و فریاری خۆم بکەوم، بەڵێ زۆر جوان و ڕاستت فەرموو ئەی پێغەمبەری خۆشەویستمان، بەڕاستی ئەگەر بۆ کەمتر لە چاوتروکانێك لوتف و ڕەحمەت و چاودێری خوای پەروەردگارمان لەگەڵ نەبێ تیادەچین و سەرگەردان دەبین.. ژیانمان دەبێت بە ژان و تیاچوون و لەناوچوون.

## چالاکی زیاتری ئەندامێکی لەشی.. بوە هۆی مردنی!

بەسەرهات

با گوێ بگرین بۆ مامۆستای زانکۆ و بانگخوازی بەناوبانگی سوری (د. محمد راتب نابلوسی) کە لە کتێبە ناوازەکەیدا (موسوعة أسْماء الله الحُسْنَى ج١ ص١٧٣)دا، ئەم بەسەرهاتەمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێ:

گەنجێك، لاوێکی خۆش پێکەوتووی، بالآبەرزی، ڕێك و پێکی زیرەك، کە خوێندکاری قۆناغی چواری کۆلێژی پزیشکی بوو، لە زیرەکترین خوێندکارانی بەشەکەی بوو، لە هەمووشیان جەستەی ساغ و تەندروستتربوو، لە هەموویان نەرم و نیانتر و لەسەرخۆتر بوو، ڕۆژێکیان کتوپڕ لەناکاو لەناو پۆلدا هەستی کرد جەستەی گەرم داهات و بێ هێزی و بێ تاقەتی ڕووی تێکرد، بەرە بەرە لەشی بێ هێز و بێ توانا دەبوو، دەم و چاوی زەرد هەلگەڕا.. ئیتر چوو بۆلای پزیشك و دەستی کرد بە پشکنینی خوێن و چەوری و فشاری خوێن و ئەمانە..

دکتۆری یەکەم پێی وت: بە پێی شیکاری نەخۆشیەکەت بێ، توشی کەم خوێنی بویت، بەڵێ بەوە قەناعەتی نەکرد، ئاخر گەنجێك لە هەرەتی لاویەتی و چوست و چالاکی دا و، لە خێزانێکی دەوڵەمەند و خۆشخۆر و خۆشحاڵ بەچی تووشی کەم خوێنی دەبێ؟! بۆیە چووە لای پزیشکی دووەم و ئەویش کۆمەڵێ

پشکنینی بۆ نوسی و، سەرەنجام گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە لە سپڵیدا چالاکی زیاد لە پێویست هەیە و بۆتە هۆی ئەم بیٚ هێزی و لاوازیەی! !

بەڵیٚ سپڵ وەکو کارگەیەکی یەدەگی (إحتیاط) وایە لە لەشدا بۆ دروست کردنی خڕۆکەی خوێن، وە هەروەها گۆڕستانێکیشە بۆ ئەو خڕۆکانەی کە دەمرن چونکە لە تەنها یەك چرکەدا لەناو جەستەی مرۆڤدا (دوو ملیۆن و نیوو) خڕۆکەی خوێن دەمرێت! ! جا ئەم خڕۆکانە کە دەمرن، دەگوازرێنەوە بۆ گۆڕستانی سپڵ، ئەمجا لەناو سپڵدا و بە ڕێگایەکی ئابوریانە ئەم خڕۆکە مردوانە دەشکێن و دەڕوخێن و دەگەڕێنەوە بۆ ئەصڵی پێکهاتنی سەرەتایان! !

(چۆن مرۆڤ لە خاك دروست بووە و کە مرد دەبێتەوە بەخاك و خۆڵ). ئەو خڕۆکانەی خوێنیش لە قەبرەستانی سپڵدا، ئاوا دەبنەوە بە ئەو پێکهاتەی کە یەکەم جار لێی دروست بوون. کە بریتیە لە: (ئاسن و هیمۆگلۆبین) ئاسنەکە یەکسەر دەچێتەوە بۆ کارگەی خڕۆکە سورەکانی خوێن کە لەناو مۆخی ئێسقاندایە، بۆئەوەی جارێکی تر ببێتەوە بە خڕۆکەی سوری خوێن، هەروەها هیمۆگلۆبینەکەش دەچێتەوە بۆ جگەر بۆئەوەی زەرداوی زراوی لیٚ دروست ببێتەوە!

( بۆ زانیاری: ئەگەر مرۆڤێك (٧٠) ساڵ بژی، مۆخی ناو ئێسقانەكانی لاشەی ئەو ئادەمیزادە هێندەی قورسایی (٦٥٠) كلغم خڕۆكەی سور و (١٠٠٠)كلغم (یەك تەن) خڕۆكەی سپی دروست دەكەن!! ئەمە لەكاتێكدا كێشی هەموو مۆخی ناو ئێسقانەكانی ناو لاشەی مرۆڤ یەكسانە بە (٢٦٠٠)غرام!! وە بزانن! هەموو خڕۆكەیەكی سوری ناو خوێنی ئادەمیزاد (دوو سەد و حەفتا ملیۆن) وردیلەی هیمۆگلۆبینی تێدایە)..

بەڵێ دەچینەوە لای باسەكەمان و داهاتووی ئەم كوڕە گەنجە، پارچەیەك لە سپڵی ئەم گەنجەیان بۆ پشكنین نارد بۆ یەكێ لە وڵاتە پێشكەوتوەكانی خۆرئاوا، دوای پشكنینی زۆر ورد، ئەمە ئەنجامی ڕاپۆرتی پزیشكی بوو:

(ئەم سپڵە سیستمی كاری تێكچووە و زیاد لەوەی بۆی دانراوە كار دەكات و ئەو خڕۆكە سورانەی كە مردوون وەریان دەگرێ و شیان دەكاتەوە بۆ پێكهاتە سەرەتاییەكانی خۆیان كە ئەمە ئیشی خۆیەتی و زۆر باشە، بەڵام ئەم سپڵە ئەوەندە چالاك كار دەكات كە: خڕۆكە سورەكانی خوێن كە تازە دروست دەبن، ئەوانیش بۆلای خۆی ڕادەكێشێ و دەیانمرێنێ و شیان دەكاتەوە!! ئیتر بەهۆی ئەم كارەی سپڵەوە كە ئیشی ئەو نیە و بە زیادە چالاكی خۆی دەیكات، ناهێڵێ خڕۆكە سورەكە سوڕی ژیانی تەواو بكات و بمرێ و بە مردوویی بێ بۆ سپڵ، سپڵەكە خۆی دەیمرێنێ و شی

دەکاتەوە، ئەمەش دەبێتە هۆکاری ئەوەی کە هەمیشە ئەم کوڕە گەنجە خوێنی کەم بێ و توشی کەم خوێنی ببێ!!)

بەڵێ هەرچی دەرمان و چارەسەرهەبوو کردیان، بەلاّم نەیانتوانی ئەم سپڵە بخەنەوە دۆخی ئاسایی خۆی و سەرەنجام دوای ماوەیەك پێی مرد!!

ئایا غەیری ـ الله ـ سُبْحانَهُ وَتَعالى ـ کێ هەیە بتوانێ بۆ کەمتر لە چاوتروکانێ ئاگاداری سپڵت بێ و نەهێڵێ لەو کارەی بۆی دیاریکراوە زیاتر کار بکات؟! هیچ کەس! دەی کە ئاوا بەهێز و بەگوڕی، گەنجی، زیرەکی، بەتوانای، لاشەت بەهێزە، هی خۆتە، یاهی لوتف و کەرەمی خوایە؟ بێگومان هی خوایە، بۆیە هەمیشە زیکر و یادی خوا بکە و هەرگیز لە خوا غافڵ مەبە.

پێغەمبەری خوا ﷺ: کاتێ لە نوێژ سەلامی دەدایەوە دەیفەرموو (**لا إِله إِلاّ اللّهُ وَحْدَهُ لاشَرِيكَ لَهُ، لَهُ المُلْكُ وَلَهُ الحَمْدُ وَهُوَ عَلى كُلِّ شَئٍ قَدير**) هیچ شتێ نیە و هیچ پەرستراوێ نیە شایەنی پەرستن بێ، تەنها زاتی ـ الله ـ نەبێ، خودای ڕاست و دروست تەنها ـ الله ـ یە، خوایەکی تاك و تەنها و بێ شەریکە، موڵك و دارایی و دەسەلاّت و پاشایی و سوپاس و ستایش هەمووی هەر بۆئەوە، وە ئەو خوایەکی ئەو تۆیە کە دەستی دەڕوات بەسەر هەموو شتێکا و توانای هەموو شتێکی هەیە. ئەمجا دەیفەرموو:

(اللّهُمَّ لا مانِعَ لِما أَعْطَيْتَ وَلا مُعْطِيَ لِما مَنَعْتَ وَلا يَنْفَعُ ذَا الجَدِّ مِنْكَ الجَدُّ). ئەی پەروەردگارم، (یا الله) هەرچی تۆ بیدەیت بە کەسی تر نابڕدرێت، هەرچیش تۆ نەیدەیت بە کەسی تر نادرێت. دارایی و دارا و دەستداری دەستدار، هیچ دادێکیان نادا لەلای تۆ، ئەوەی بە دادیان دەخوا چاودێری تۆیە و کاری باشی خۆیان. (متفق عليه: بُخاري: (٨٤٤) وَ مُسْلِم: (٥٩٣).



کۆتایی ئەم باسەمان بە شیعرێکی شاعیری گەورەی کورد (پیرەمێرد) دێنین کە دەفەرمووێ:

خوایە ئەم دڵە هێزێکی بەرێ
کە غەم لەناو خۆی بکاتە دەرێ.

من خۆم نازانم چی بۆمن چاکە
تۆ بە مەیلی خۆت دڵم ئاواکە.

پایەی تۆ ناسین ئەگەر دەرکەوێ
ئیتر کێ دونیا و دیناری دەوێ.

من کە دێوانەی تۆبم بە تەنیا
شەقێك هەڵئەدەم لە هەردوو دونیا.

دڵم هەمیشە یادی تۆ دەکا
گیان لە ڕێی تۆدا جست و جۆئەکا.

لەم خۆشیانەدا ئەگەر بێ و بمرم
بۆنی تۆی لێ دێ گیاکەی سەر قەبرم.

بەهەشت مەدح ئەکەن بەناو و داوێ
من لیقای خوام بێ بەهەشتم ناوێ.

عاشق کە بە ڕاست دەستی لە گیان شت
پەکی سەیران و گەڕانی خۆی خست.

دیارە کە یاری ئەو وەفایەی دی
کامی ویساڵی بۆ دێنێتە دی.

خوایە ئەیزانی کە من تۆم دەوێ
مەعشوق چ ڕایەی بە تۆ ئەکەوێ.

خوایە نامەوێ تاعەتم زۆربێ
نەوەکا نەفسم بەوە مەغرور بێ.

خۆم بە گوناهکار ئەدەمە قەڵەم
تۆ خۆت فەرموتە حەز لە عەفووەکەم.



# وانەی پانزەیەم

## بابەت: لە خوا غافڵ مەبە و سوپاسی خەلاتی عەقڵ و ژیریت بکە و بەسۆزبە بەرامبەر شێتەکان

❁ **قالَ اللهُ سُبْحانَهُ وتَعالى:** ﴿وَمَثَلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ كَمَثَلِ ٱلَّذِى يَنْعِقُ بِمَا لَا يَسْمَعُ إِلَّا دُعَآءً وَنِدَآءً ۚ صُمٌّۢ بُكْمٌ عُمْىٌ فَهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿١٧١﴾﴾ البقرة.

❁ **قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (رُفِعَ القَلَمُ عَنْ ثَلاثَةٍ، عَنِ النّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ، وَعَنِ الصَبِيِّ حَتَّى يَحْتَلِمَ، وَعَنِ المَجْنُونِ حَتَّى يَعْقِلَ).** رَواهُ الترمذي: (١٤٢٣) وقالَ عَنْهُ: حَديثٌ حَسَنٌ غَريبٌ.

## سەرچاوەکان:

١) گۆڤاری پزیشك و خێزان، ژمارە: ٢، ل٣.
٢) بەختەوەر بژی، د. محمد العریفی، و: هێمن محمد علی، ل٢٣٥.
٣) ڕۆژنامەی (باسك) ژمارە: ٥٠٩، ل٤.
٤) ئاو و ئاور، هێمن خورشید، ل٢١٥.

٥) بەرەو بەهەشت، ئەندازیار عثمان، ل٩٩.
٦) ناڵەی دەرون، شێخ محمدی خاڵ، ل١٥٠.
٧) پایزە برا، مەلا ئەحمەدی شەریعە، ب١، ل٣١.
٨) رَقائق العریفی، د. محمد عبدالرحّمن العریفی، ص١٣.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحَمْدُ لِلّهِ رَبِّ العالَمين. وَ الصَّلاةُ وَ السَّلامُ عَلى سَيِّدِنا محمد وَ عَلى آلِهِ وَ صَحْبِهِ أجْمَعينَ:

یەکێك لە خەڵاتە هەرە گەورەکان کە خوای پەروەردگارمان پێی بەخشیوین، بریتیە لە خەڵاتی عەقڵ و ژیری، بەم عەقڵ و هۆشە، بەم فکرە ساغ و سەلیمە، ئێمە چاکە و خراپە، ڕێگای ڕاست و چەوت، شەو و ڕۆژ، پاك و خاوێنی لەگەڵ پیسی و چەپەڵی لەیەکتر جیادەکەینەوە، ئینسان کاتێ قەدر و نرخی ئەم خەڵاتە گەورە و گرانبەهایە دەزانێ، کاتێك کە شێتێك دەبینێ، کە خەڵکی پێیان دەڵێن ئەمە شێتە و عەقڵی لەدەست داوە..

ئەگەر مرۆڤی مسوڵمان لە حاڵی ئەو شێتە ورد بێتەوە، لە جیاتی گاڵتە بەو شێتە بکات، یان بیەوێ کاتی پێ بەسەر بەرێ، دەبێ بە خۆیدا بچێتەوە بڵێ: خوایەگیان سوپاسی تۆ دەکەم، ئای چ خەڵاتێکی گەورەت بە من بەخشیوە، کە خاوەنی عەقڵ و هۆشی تەواوم.. کەسی واهەیە شێت نیە، تەنها کەمێ عەقڵی نزمە و گێلۆکەیە، تەماشای دەکەی کۆمەڵێك شتی لێ دەشێوێ، ئەزانی ئەگەر یەك تۆز یادەوەری (زاکیرە)ت تێك بچێ، زۆربەی ڕابردووی ژیانت بیردەچێتەوە و وەکو منداڵی دوو سێ ساڵەت لێ دێتەوە! کە سەیری حاڵی ئەو کەسانە دەکەی، لەگەڵ دوعای خێر بۆیان و حورمەت و ڕێزگرتن و خزمەت و ڕێنمایی کردنیان، هەستیش بەوە

دەکەی کە پەروەردگار چ ڕەحمەتێکی لەگەڵ ئێمەدا نواندوە، کە ئەم عەقڵ و ژیریەی پێ بەخشیوین..

عەقڵ و ژیری چەندە بە نرخ و بەرزە، خوای گەورەش لەناو بەنرخترین و بەرزترین شوێنی جەستە و لاشەی مرۆڤدا دایناوە، کە مێشکە و لە کاسەی سەردایە، ئەم عەقڵ و ژیریە لە سوژدەدا، لە نوێژدا نزم دەکرێتەوە و دەخرێتە سەر زەوی، یەعنی خوایەگیان.. سوپاست دەکەم لەسەر خەڵاتی عەقڵ و ژیری و ئەوا سەری سوپاسگوزاریم بۆ تۆ خستە سەر زەوی.

هەروەها بەو سوورژدەیەشت ئەوە دەڵێی بە زمانی حاڵ. کە ئەی پەروەردگار ملکەچی شەریعەتەکەی تۆم و لێی لانادەم و عەقڵ و ژیریەکەم کە خەڵات و بەخششی تۆیە، نایخەمە پێش شەریعەت و بەرنامەکەتەوە و تەسلیم و ملکەچی ئەمر و فەرمانەکانی تۆم.

## ١٠ ڕاستی سەرنج ڕاکێش سەربارەت بە مێشکی مرۆڤ:

مێشکی مرۆڤ و زانینی ئاڵۆزیەکانی، کە ئاڵۆزیەکی تایبەتیان هەیە، بەردەوام جێگای سەرنجی مرۆڤ بووە و بەردەوام مرۆڤ نمونەیەکی بایەخدار بووە بۆ لێکۆڵینەوە و چەندین بابەت سەبارەت بە مرۆڤ بە شاراوەیی و نەزانراوی ماوەتەوە، لەم بابەتەدا باس لە (دە) ڕاستی سەرنج ڕاکێش سەبارەت بە مێشکی مرۆڤ دەکەین،

تاوەکو بتوانین تێڕوانینێکی باشترمان سەبارەت بە گرنگترین ئەندامی جەستەی خۆمان هەبێت. کە مێشکمانە.

ڕاستی یەکەم: بڕی زۆری کێش و قورسای مێشك لە ئاو پێك هاتووە و بەشە بەستوو (ڕەق)ەکەی بە گشتی لە چەورییە. زۆربەی خەڵکی پێیان وایە کە مێشك بە گشتی بەستووە، بەڵام ئەوانە هەڵەن، چونکە ڕێژەی (٧٥٪)ی مێشك ئاوە و بەشە بەستوەکەی کە لە جنسی چەوریە، نزیکەی (١٠٪ یان ١٢٪)یە و، ئەوەی کە دەمێنێتەوە لە جنسی پرۆتین، هایدرۆکاربۆن و خوێیە.

ڕاستی دووەم: ١٦٠ هەزار کلیۆمەتر دەماری خوێن لە مێشکدا هەیە، ئەمەش مانای وایە کەئەگەر هەموو دەمارە خوێنەکانی مێشك لە ڕێکی یەك دابنرێت ئەوا دەتوانین چوار جار بە دەوری گۆی زەویدا بیپێچین، یان هەسارەی مانگ لە ڕێگای دەماری خوێنی مێشکی دوو کەسەوە بە گۆی زەوی بگەیەنین!!

ڕاستی سێهەم: مێشکی مرۆڤ نزیکەی (١٠ بۆ ٢٣) وات کارەبا بەرهەم دەهێنێت، ئەم بڕە کارەبایە بۆ ڕووناك کردنەوەی دوو گڵۆپ بەسە و بەشێکی زۆری ئەم هێزە بەرهەم هاتووە بە کاردێت بۆ پەیوەندی مێشك لەگەڵ ئەندامەکانی تر!!

ڕاستی چوارەم: بەکارهێنان و خواردنی تەندروست هۆش و زیرەکی زیاد دەکات، بە پێی لێکۆڵینەوەیەك کە ڕێکخراوێك لە نیۆرك ئەنجامی داوە، ئەگەر لە ژەمی نانی نیوەڕۆ خواردنێك بخۆن کە هیچ ماددەیەکی پارێزەر (حافظة) لەو خۆراکەدا نەبێت ـ خواردنێکی تازەبێ و لە قتو نەنرابێ، ئەوا لە (١٤٪) لە تێستی زیرەکی (IQ) نمری باشتر دەهێنێت، ئەمە دۆزینەوەیەکی زۆر بەرچاوە و ئەوەشمان نیشان دەدات کە کارکردنی مێشك بە توندی پەیوەندی بە خواردن و خواردنەوەوە هەیە.

ڕاستی پێنجەم: بیر لە هەرشتێك بکەینەوە، یەك پەیوەندی (عَصَبي) ـ الخَلايا العَصَبِيَّة ـ لە مێشکدا دروست دەبێت. مێشك لەگەڵ تێپەڕبوونی کات دەگۆڕێت و ئەگەر بیر لە بابەتێکی نوێ بکەینەوە، دڵنیابن لە مێشکدا بەهەمان بڕ پەیوەندی عەصەبی نوێ دروست دەبێت.

ڕاستی شەشەم: کەسێکی ئاسایی ڕۆژانە(٧٠ هەزار) بیرکردنەوە ئەنجام دەدات، بۆیە مرۆڤ هەمیشە لە بیرکردنەوەدایە و بەگۆڕانکاری لەو بیرکردنەوانە دەتوانێ بە تەواوی مێشکی بگۆڕێ.

ڕاستی حەوتەم: پێکەنین پرۆسەیەکی ئاڵۆزە و پێنج بەشی مێشك بەکاردێنێت، پێکەنین بابەتێکی پێکەنیناوی نیە، چونکە بۆ ئەم پرۆسەیە چەند بەشێکی زۆری مێشك بەکار دەهێنرێت.

پێکەنین بۆ چالاك کردنی مێشك زۆر کاریگەرە و لەکاتی پێکەنیندا ماددەی کیمیایی بەهێزکەر لە لەشدا ئازاد دەبێت. لێکۆڵینەوەکان دەری دەخەن کە پێکەنین بۆ ماوەی چەند دەقەیەك لە هەر ڕۆژێکدا دەبێتە هۆی باشبونی دۆخی دەرونی، زیادبوونی هەستکردن بە خۆشبەختی و زیاد بوونی داهێنانی مێشك دەبێت.

ڕاستی هەشتەم: کاری ئاڵۆز دەبێتە هۆی گۆڕانکاری خێرا لە مێشکدا، فێربوون و ئەنجامدانی کاری نوێ و ئاڵۆز و قورس کاردانەوەی ئیجابی لەسەر مێشکی مرۆڤ هەیە و دەبێتە هۆی گەشەکردنی بەشێکی تایبەت لە مێشکدا.

ڕاستی نۆهەم: مێشك بە هیچ شێوەیەك توانای هەستکردن بە ئازاری نیە، مێشك توانای ئەوەی نیە ئازاری ناو مێشك هەست پێ بکات و تەنها دەتوانێت هەست بە ئازاری شوێنەکانی تری لەش بکات و پێی بکات. لە ڕاستیدا هیچ وەرگرێکی ئازار لە مێشکدا نیە!!

ڕاستی دەیەم: بەرزی مێشکی مرۆڤ (٣-٩) سانتیمەترە، مێشك لەوەی کە خەڵك بیری لێدەکەنەوە بچوکترە، ئەندازەی مێشك (١٦ سانتیمەتر ـ ١٤ سم ـ ٩/٣ سم) و کێشی (١/٣) کیلۆگرامە و هەر لەم (١/٣) کیلۆگرامە (دوو سەد) ملیۆن خانەی عصبی (نرۆن) بوونی هەیە. (گۆڤاری: پزیشك و خێزان، ژ: ٢، ل٣).

## جۆرەکانی نەخۆشی عەقڵ:

بەڵێ خوای گەورە هەندێك لە بەندەکانی تاقیدەکاتەوە و هەیە بۆ ماوەیەك ئەم عەقڵ و ژیریەی لێ وەردەگرێتەوە و پاشان چاك دەبێتەوە، هەیشە تامردن بەو شێوەیە دەمێنێتەوە. شێتی لای زانایانی پزیشکی دەرونی، هەروەکو نەخۆشی ئەندامەکانی تری لاشە وایە، بەڵام ئەم توشی خەلەل لە مێشکدا بووە..

**جۆری یەکەم:** ئەوەیە هەر کە لەدایك دەبێ ئەم خەلەلەی لە مێشکدا هەیە و ئیتر هەتا دەمرێ چاك نابێتەوە، وە هەموو کاتەکانی ژیانی وەکو یەکە و ماوەیەکی نیە کە بە ژیری تەواو قسە و ڕەفتار بنوێنێ. ئەمە لەلای شەرعزانان (**الفُقَهاء**) وا بڕیاردراوە، ئەگەر کەسێ بۆ ماوەی یەك مانگ لەسەر یەك هەموو قسە و گوفتارێکی نارێك بوو، وە شێتانە بوو، ئەوە بە شێتی ئەصڵ ناودەبرێ و شێتی بەردەوامە.

**جۆری دووەم:** شێتی ئەوەیە کە مرۆڤەکە بە عەقڵ و ژیریەکی تەواوە لەدایك بووە، بەڵام دوای ماوەیەك بە هۆی بارودۆخێکی تایبەتی ژیانەوە کە نارەحەتی زۆر و مەینەتی گەورەی تێدا بینیوە. وەکو: لەدەستدانی خۆشەویستانی لە کتوپڕ و ڕووداوی چاوەڕوان نەکراودا، یاخود توش بوون بە زەرەری ماڵی گەورە کە هەموو سەرمایەکەی لە دەست بدات.. لە ئەنجامی زۆر بیرکردنەوە

لەم کارەساتانە مرۆڤ هەندێ جار عەقڵی لە دەست دەدات و ڕەفتاری نەگونجاو ئەنجام دەدات. ئەم جۆرەیان مەرج نیە بە هەمیشەیی ئاوا بێ. بەڵکو هەندێ جار زۆر بارودۆخی تێك دەچێ و کارەکانی و قسەکانی دورن لە عەقڵ و ژیریەوە، هەندێ جاریش چاك دەبێ و پاش ماوەیەك دیسان دەست پێدەکاتەوە و، دەبێ زۆر بە وردی ئاگاداری ئەم کەسانە بکرێ کە لە کاتی تێکچوونی بارودۆخیان، توشی ئەنجام دانی کاری نەخوازرا و دڵتەزێن نەبن.

ئەم جۆرە کەسانە لە کوردستانی خۆماندا هەن. وەکو ئەوانەی کە بەلەدەستدانی باوك و دایك و بنەماڵەیان لە کارەساتی ئەنفالدا، تەنها خۆی ماوە و بە تەنها دەژی و ئازیزانی کتوپڕ بەو ستەمە گەورە کە فیرعەون نەیکردووە، لەناوبران و شەهیدکران و زیندەبەچاڵکران. یان ئەوانەی لە کارەساتی کیمیابارانی هەڵەبجە و ناوچەکانی تری کوردستاندا لە چەند چرکە و خولەکێکدا ئەو هەموو خۆشەویستەیان لەدەستدا.

یاخود خۆیان ئەو چەکە کیمیاویەیان هەڵمژیوە. بەڵام بەڕێژەیەکی کەم یان زوو چارەسەرکراون دوای ئەو هەموو ساڵە هێشتا لە بەهاراندا، وەختی هەڵمژینی کیمیاییەکە، بارودۆخی دەرونیان تێك دەچێ و پاش ماوەیەك چاك دەبنەوە. یاخود هەیە خوێندکاری زانکۆ بووە، بەڵام لە کارەساتی هەڵەبجەی شەهیدەوە بارودۆخی دەروونی تێکچووە و لەسەر شەقامەکان شەو و ڕۆژ

بەسەردەبات. هەندێ جاریش ڕووداوی دڵتەزێن لە دەستی ئەم کەسانەوە، کە خۆشیان قوربانین، ڕوودەدات.

بۆ نمونە: لەم چەند ساڵەی ڕابردوودا، دوای (٢٠١٠). لەگەڕەکی کێوە ڕەشی قەزای ڕانیە، دایکێك کە لەو کاتەدا بە تەنها لەگەڵ منداڵەکەی لە ماڵەوە بوو، دەستی ڕاستی منداڵە کچە دوو ساڵانەکەی بە چەقۆیەکی تیژ لە مەچەکەوە دەبڕێتەوە، ئەو منداڵە جوانکیلە کە ناوی (دەریا)یە لە نەخۆشخانە نەشتەرگەری بۆ دەکرێ و دەستی ڕاستی لەدەست دەدات و دوو بتڵ خوێنی تێ دەکرێ..

باوکی ئەم منداڵە کە دەستی بڕاوەتەوە وتوویەتی: هاوسەرەکەم کە ئەو کارە دڵتەزێنە چاوەڕوان نەکراوەی ئەنجام داوە، زۆربەی خانەوادەکەی ئەنفالکراون، هەر بەو هۆیەوە باری دەروونی تەواو نیە بۆیە بەرگری لێدەکەم و داوای یاسایی لەسەر تۆمار ناکەم، چونکە دەزانم باری دەروونی هاوسەرەکەم بەهۆی کارەساتی ئەنفالکردنی بنەماڵەکەی تێکچووە و بە عەمدی نەیکردووە. (ڕۆژنامەی ئاسۆ، ژ: ١٤١٩).



## شێتەکان کێن؟!

شێتەکان ئەو کەسانەن کە جیاواز لە خەڵکی ئاسایی دنیایەکی تایبەت بە خۆیان هەیە، هەرچەندە بە جەستە لەناو خەڵکی دەژین، بەڵام بێ باکن بەرامبەر هەموو جەنجاڵیەکانی ژیان، بەرانبەر بەرپرسیاریەتیەکان، بەرامبەر هەموو ئەو خەونانەی خەڵکی بە ئاواتیەوە دەژین.

لە خوا غافڵ مەبە، ئەگەر ڕەحمی خوا نەبێ، لە هەر ئاستێکی بەرزی زانستی و ئابوری و کۆمەڵایەتیدا بیت، بۆی هەیە خەلەلی عەقڵی ڕوت تێبکات و شێت ببی، چونکە شێتەکان هەر کەسانی هەژار و نەخوێندەوار و نەناسراو و بێ کەس و کار نین. سەرنجی ئەم بابەتە بدە:

بانگخواز و مامۆستای زانکۆ (د. محمد عبدالرحمن العریفی) دەفەرمووێ: لە گەشتێکمدا بۆ یەکێك لە وڵاتەکان، بۆئەوەی چەند وتار و ئامۆژگاریەك پێشکەش بکەم، ئەو وڵاتەش بەناوبانگ بوو بەوەی کە نەخۆشخانەی زۆر گەورەی تێدایە بۆ نەخۆشیە دەروونیەکان. ئەو نەخۆشیانەی کە خەڵکی بە شێتی ناوی دەبەن، بەیانیەکەی دوو وتارم پێشکەش کرد و هێشتا کاتژمێرێکی مابوو بۆ نوێژی نیوەڕۆ، یەکێك لە بانگخوازە بەناوبانگ و دیارەکانیشم

لەگەڵ بوو، کاتێك لە ئۆتومبێلدا بووین، لام کردەوە بەلایدا و وتم: مادام کاتمان بەدەستەوەیە، حەزدەکەم بچم بۆ شوێنێك..

وتی: بۆ کوێ؟ وتم: نەخۆشخانەی نەخۆشیە دەرونیەکان. پێکەنی و وتی: بۆچی؟! دەتەوێت لە عەقڵ و ژیریت دڵنیابیت!! وتم: نا، بەڵکو سودی دەبێت بۆمان و پەند و ئامۆژگاری لێوەردەگرین. زیاتر خەڵاتەکانی خوای گەورە و پەروەردگارمان بۆ دەردەکەوێت..

هاوڕێکەم بێدەنگ بوو، بیری لە حاڵی ئەو نەخۆشانە کردەوە، هەستم کرد زۆر غەمبار بوو. چونکە کەسێکی زۆر نەرم و نیان و بەسۆز بوو، زیاد لە پێویست کەسێکی سۆزدار بوو..

چوین بۆ ئەوێ و ڕوومان کردە بینایەك، کە وەکو ئەشکەوت وابوو، بە درەخت چواردەوری گیرابوو، وەکو شێوەی تارمایی و شەبەحێك دەردەکەوت، یەکێك لە پزیشکەکان پێشوازی لێکردین، بەخێرهاتنی کردین و پاشان بە نەخۆشخانەکەدا گێڕاینی..

پزیشکەکە دەربارەی ناڕەحەتی و ناخۆشی نەخۆشەکان دەستی بە قسەکردن کرد و وتی: ئەوەی من بۆتانی باس دەکەم، وەك ئەوە نیە کە بەچاوی خۆتان ببینن، پاشان بردمانی بۆ یەکێ لە ڕاڕەوەکان.. لێرەوە گوێ بیستی چەندان هاوار و دەنگە دەنگ بووین، ژووری نەخۆشەکان بەمبەر و بەوبەری ڕاڕەوەکەدا دابەشکرابوو.. لەلای ڕاستدا بەلای ژوورێکدا ڕۆشتین سەیری

ژوورەکەم کرد و بینیم زیاتر لە دە جێگەی چۆڵی تێدایە.. تەنها جێگەیەك نەبێت کە پیاوێکی لەسەر ڕاکشابوو، پیاوەکە دەست و قاچی دەجولاند، ڕوومکردە پزیشکەکە و لێم پرسی: ئەمە چیە؟!

وتی: شێتە.. توشی پەرکەمیش دێت.. لەماوەی پێنج یان شەش کاتژمێرێکدا پەرکەم لێی دەدات!

وتم: (لا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إِلاّ بِاللّه) لەکەیەوە وایە و بەم شێوەیەیە؟!

وتی: دە ساڵ زیاترە.. هەست و سۆزم لە دەروونمدا شاردەوە و بە بێدەنگی هەنگاوم نا و ڕۆشتم..

لەدوای چەند هەنگاوێك، بەلای ژورێکی تردا ڕۆشتین، کە دەرگاکەی داخرابوو، لە دەرگای ژوورەکەدا کرانەوەیەك، یان پەنجەرەیەکی بچوك هەبوو، پیاوێك لە ژوورەوە دیار بوو، هەندێك ئاماژەی بۆ کردین، بەڵام لێی تێنەگەیشتین، چاوم بە ژوورەکەدا گێڕا.. زەوی و دیوارەکانی ڕەنگێکی کاڵیان هەبوو، پرسیارم کرد ئەمەیان چیە؟!

وتی: شێتە، وتم: دەزانم شێتە، ئەگەر شێت نەبوایە لێرە نەمان دەبینی، چیرۆك و بەسەرهاتی ئەمەیان چیە؟!

وتی: ئەم پیاوە کاتێ دیوار دەبینێ، تورە دەبێت و بە دەست و قاچی لە دیوارەکان دەدا و جاری واش هەیە سەری بە دیوارەکاندا دەکێشێ، ڕۆژێك پەنجەکانی دەشکێت، ڕۆژێك قاچی، ڕۆژێك

سەری.. ڕۆژێك.. و.. ئەمان توانی چاری بکەین، هەربۆیە هەروەك دەبینی لەم ژوورەدا بەندمان کردووە.. زەوی و دیوارەکانیشمان بە ئیسفەنج داپۆشیوە، چۆن دەیەوێت با بە دیوارەکاندا بکێشێت..
پاشان پزیشکەکە بە بێدەنگی لە پێشمانەوە ڕۆشت، من و هاوڕێکەشم وەستابووین و لەبەرخۆمانەوە قسەمان دەکرد و دەمان وت: (الحَمْدُ لِلّهِ الّذي عافانا مِمّا إبْتَلاكَ بِهِ)..

پاشان ڕۆشتین، هەتا گەیشتینە ژورێك کە زیاتر لە سی پیاوی تێدابوو، هەریەکە بە شێوازێك، هەیانبوو بانگی دەدا، هەیان بوو گۆرانی دەوت، ئەوی تریان سەمای دەکرد، ئەوی تر هەر ئاوڕی دەدایەوە.. لە نێوانیاندا سێ کەس هەبوون، کەلەسەر کورسی دایان نیشاندبوون و دەست و قاچیان بەستبونەوە و سەیری ئەملا و ئەولایان دەکرد و هەوڵی کردنەوەی خۆیان دەدا و نەیان دەتوانی.. سەرم سوڕما و لە پزیشکەکەم پرسی: ئەمانە چین؟! بۆچی بەتەنها ئەم سیانە بەستراونەتەوە؟!

وتی: ئەمانە هەر شتێك لە پێشیانەوە بێت لێی دەدەن، پەنجەرە و دەرگا دەشکێنن، هەر لەبەرئەوە لە بەیانیەوە هەتا ئێوارە بەم شێوەیە دەیان بەستینەوە..

وتم: ماوەی چەنێکە بەم شێوەیەن؟! وتی: ئەوەیان دەساڵە، ئەوی تر حەوت ساڵە، ئەوی تریان تازەیە پێنج ساڵە.

هەر بیرم دەکردەوە، سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ئێمەی پاراستووە لەوەی کە ئەوان توشی بوون، پرسیارم کرد و وتم: دەرگای چوونە دەرەوەی نەخۆشخانە لە کوێوەیە؟ وتی: ژوورێك ماوە، پەند و ئامۆژگاری زۆری تێدایە، وەرە..

دەستی گرتم و بردمی، سەرەتا ئەوەی بینیم هاوشێوەی ژوورەکانی تر بوون، چەند نەخۆشێك هەر یەکەی بە شێوازێك، بەڵام ئەوەی جێگەی سەرسوڕمان بوو پیاوێك بوو، تەمەنی زیاتر لە پەنجاساڵ دەبوو، سەری سپی بوو بوو، بە چیچکانەوە لەسەر زەوی دانیشتبوو، خۆی کوڕ کردبۆوە، بە تیلەی چاو سەیری دەکردین، بەترس و لەرزەوە ئاوڕی دەدایەوە..

ئەمانە هەمووی ئاسایی بوون، بەڵام ئەوەی ترساندمی و بە تەواوەتی وروژاندمی و بەلامەوە نامۆ بوو، ئەوە بوو کە پیاوەکە ڕوت و قوت بوو! هیچ جلوبەرگێکی لەبەردا نەبوو، تەنانەت عەورەتیشی بەدەرەوەبوو! ڕەنگم گۆڕا و یەکسەر لام کردەوە بەلای پزیشکەکەدا، کاتێك بینیمی چاوم سور هەڵگەڕاوە، پێی وتم: ئارامبە.. بۆت باس دەکەم بۆچی وایە!

ئەم پیاوە هەر کاتێك جلوبەرگمان لەبەردەکرد، بە ددانەکانی دەیدڕاند و دەیویست قوتیان بدات، ڕۆژانە زیاتر لە (دە) دەست جلوبەرگمان لەبەردەکرد، بەڵام دەیدڕاند و بەم شێوەیە دەمایەوە کە دەیبینی ئێمەش بە هاوین و زستان بەم شێوازە وازمان

لێهێناوە.. ئەو کەسانەش بە دەوریەوەن شێتن و عەقڵیان پێ ناشکێت کە بۆچی ئاوایە!!

هاتمە دەرەوە، نەمتوانی زیاتر ئارام بگرم، بە پزیشکەکەم وت: دەرگاکەم پیشان بدە بۆئەوەی بچمە دەرەوە، وتی: هەندێك بەشی تر ماوە، وتم: ئەوەی بینیمان بەسە. پزیشکەکە ڕۆشت و منیش لە تەنیشتیەوە، بەبێ دەنگی دەڕۆشتین، لە پڕ لای کردەوە بەلامدا وەکو ئەوەی بیری شتێکی بکەوێتەوە، کە بیری چوبێت و وتی: یا شێخ لێرە پیاوێك هەیە، بازرگانێکی گەورەیە، سەدان ملیۆن پارەی هەیە، توشی نەخۆشیەکی عەقڵی بووە، ماوەی دوو ساڵە منداڵەکانی هێناویانە بۆ ئێرە!! پیاوێکی تری لێیە ئەندازیارە لە کۆمپانیای (..)، کەسێکی تری لێیە کە..

پزیشکەکە بەدەم ڕێگەوە هەر قسەی بۆ دەکردین، دەربارەی هەندێك کەس بۆمان دەدوا کە زەلیل بوون، لەدوای ئەوەی خاوەن پلە و پایە بوون.. هەندێکی تر لەدوای دەوڵەمەندی هەژار کەوتبوون..

دەڕۆشتم و هەر بیرم دەکردەوە بەوەی کە بیەوێت دەبەخشێت، یان لێی دەگرێتەوە و پێی نابەخشێت. هەندێك جار خوای گەورە ماڵ و سەروەت و سامان و پلە و پایە و ناوبانگ بە کەسێك دەبەخشێت، بەلام ژیری و عەقڵی لێوەردەگرێتەوە، دەبینیت لە

زۆربەی کەس دەولّەمەندترە، لە زۆربەی کەس جەستەی بەهێزترە، بەلاَم لە نەخۆشخانەی دەروونی، یان لە شێتخانە بەند کراوە ! !

کەسی واش هەیە پلە و پایەی بەرزی هەیە، مالّ و سامانی زۆر، عەقلّ و ژیریەکی گەورە.. بەلاَم لەشی ساغ نیە و نەخۆشە، کەسانێك دەبینی بیست یان سی سالّە لەسەر جێگە کەوتوون، بەبێ ئەوەی مالّ و سامان و پلە و پایە، هیچ سودێکیان پێ بگەیەنن، ﴿وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ وَيَخْتَارُ ۗ مَا كَانَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ ۚ سُبْحَـٰنَ ٱللَّهِ وَتَعَـٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٨﴾﴾ القصص.

واتە: هەر پەروەردگاری تۆیە، هەرچیەکی بوێت دروستی دەکات و هەڵی دەبژێرێت خەڵکی ئەو دەسەلاَتەیان نیە و سەرپشك نەکراون، پاکی و بێگەردی و بڵندی بۆ خودایە، لە بەرامبەر ئەو شتانەدا کە نەفامان دەیکەن بە شەریك و هاوەڵ.

هەربۆیە ئەو کەسانەی کە توشی تاقیکردنەوە و بەلاَیەك هاتوون، زۆر بە خێرایی پێویستە بزانن، کە لەلایەن پەروەردگارەوە دیارییەکیان پێ بەخشراوە، ئەگەر مالّ و سامانی زۆری پێ نەبەخشیوی، بە دڵنیاییەوە ژیری پێ بەخشیوی.. لە هەموو بەخشش و خەلاَتەکانیش گەورەتر ئەوەیە: کە باوەڕ و ئیمانی پێ بەخشیوی، دەی پیرۆزت بێت و خۆشی بۆ خۆت کە لە ژێر سایەی ئیسلامدا دەژیت و لە ژێر سایەی ئیسلامیشدا دەمریت، دەی لە

ناخی دڵەوە و بە زمانیش بڵێ: سوپاس بۆ خودا، سوپاس بۆ خودا. (بەختەوەر بژی، ل٢٣٥).

## قسەی بەجێ و نەستەق و خۆشی شێتەکان

شێتەکان لەگەڵ ئەوەی کردار و گوفتاریان ئاسایی نیە، بەڵام ناو بەناو قسەی زۆر بەهێز و مەنتیقی و بەجێ دەکەن کە ژیرەکان پەی پێ نابەن، وە چونکە ئەو جۆرە قسە جوان و نایابانە لەو جۆرە کەسانە چاوەڕێ ناکرێن، زۆر بە تام و چێژن و لەبیرناچنەوە. ئەمەش هەندێ لەو جۆرە قسە خۆش و واقیعی و بەجێیانە:

**یەکەم:** دەڵێن شێتێك لە بازاڕی شارێکدا هاواری دەکرد و دەیگوت: ئەی خەڵکینە ئێستە لەم شارەدا هەر من شێتم، قەسەم بەخوا بڵێن زەوی دەدرێت بە شێتەکان هەتا شەش مانگی تر من نۆبەم بەرناکەوێت!! واتە هەموو خەڵکەکە خۆیان دەکەن بە شێت و ناونوسی خۆیان بۆ وەرگرتنی زەوی دەکەن! (ڕۆژنامەی باسك، ژ: ٥٠٩، ل٤).

**دووەم:** ڕۆژێك لەبەردەم نەخۆشخانەیەکی دەروونیدا، کەسێك تایەیەکی ئوتومبێلەکەی پەنچەر بوو، دابەزی تایە پەنچەرەکەی کردەوە و سپێرەکەی داگرت، لە کاتێکدا سەرقاڵی جەگ و تایە بوو، یەکێك لەوێوە تێپەڕی، هەرچوار بورغوە کراوەکەی کە لەولاوە دانرابوون، برد و ڕۆشت..

وەختێ بە ئاگاهاتەوە کار لە کار ترازابوو، جگەرەیەکی داگیرساند و پاڵی دا بە ئوتومبێلەکەیەوە، لەپڕ شێتێ لە پەنجەرەی نەخۆشخانەکەی بەرامبەریەوە سەری دەرهێنا و هاواری لێکرد: هۆی کابرا، ئەوە بۆ ئاوها دەست لە ئەژنۆ دانیشتوی؟

ئەمیش پێکەنی و وتی: چیبکەم، هەر چوار بورغوی تایەکەمیان دزی، بەبێ بورغو کارێکم پێ ناکرێت..

شێتەکە قاقا پێکەنی و وتی: بەخوا سەیری! ئەی سێ تایەی ترت نیە؟ کابرا بە سەرسوڕمانەوە وتی: بەڵێ، بەس ئەوە چ پەیوەندیەکی بە قسەکەی ئێمەوە هەیە؟

شێتەکە دووبارە قاقایەکی بۆ کرد: ئەی چۆن پەیوەندی نیە، هەر یەکێك لەو سێ تایەی تر چوار بورغویان نیە؟! لەهەر یەکێکیان برغویەك بکەرەوە و لەمی ببەستە، ئەمیش دەبێتە سێ برغو کارەکەت سەر دەگرێت و دەڕۆی!! کابرا هێندەی تر سەری لەو شێتە سوڕما، خۆی نەگرت و هاواری لێکرد: باشە تۆ کە هێندە عاقڵی، لە شێتخانە چی دەکەی؟!

شێتەکە ئەمجارەیان بە ئارامی وتی: ئاخر من شێتم، بەس گەمژە نیم!!

بەڵێ هەندێك جار، ئەوەی بە عەقڵی شێتێکدا دێت، مەرج نیە ئاقڵێك بیر بۆ بچێت، هەندێ لەوانەیە پێیان دەوترێ شێت، هەم

خۆشەویستن و هەمیش لە هەندێ بواردا بیریان زۆر وورد دەڕوات. (ئاو و ئاور، ل٢١٥).

سێهەم: مامۆستا ئیبراهیم ڕێشاوی - بەڕەحمەت بێت - گێڕاویەتیەوە کە: شێتێك شەبقەیەك دەکاتە سەری و خەڵکیش گاڵتەی پێدەکەن و دەڵێن: بووی بە ئینگلیز، ئەویش وەڵامیان دەداتەوە و دەڵێت: بەڕاستی بێ عەقڵن، بۆئەو شەبقەیە من بکات بە ئینگلیز، باشە بۆ من ناتوانم ئەو بکەم بە موسڵمان؟!. (بەرەو بەهەشت، ل٩٩).

چوارەم: زانای گەورە و کەم وێنەی کورد، قازی شێخ محمدی خالێ، ئەدیب و نوسەر و موفەسیری قورئان، لە کتێبە بە نرخەکەیدا (ناڵەی دەروون) لە ژێر سەر دێڕی: (ژیری شێتان و شێتی ژیران) دەفەرمووێ: (مەردوم ئەگەر بە چاوێکی وردبونەوە تەماشا بکات ئەبینێ کە زۆر شێتەکان ژیر و زۆر لە ژیرەکان شێتن.. شێتێك بوو لە سلێمانی شەبقەی لەسەر دەکرد، ڕۆژێك ژیرێك پێی وت: تۆ کە موسڵمانیت، چۆن شەبقەی گاوری لەسەر دەکەی؟ نازانیت بەم شەبقەیە بێ بڕوا - کافر - دەبیت؟! شێتەکەش وتی: منێکی خوێندەواری جیهان دیدەی موسڵمانی خاوەن بیروباوەڕ، بۆچ نەتوانم بە نوێژێك شەپقەکەم موسڵمان بکەم، ئەو پارچە پەڕۆیە بۆچ بتوانێ من بێ بڕوا بکات؟!

ژیرێکی تر هەر لە شاری سلێمانی لە شێتێکی چاوخێل ئەپرسێ ئەڵێ: تو خوا فیسار کەس ئەوە ڕاستە ئەڵێن: خێل یەك بە دوو ئەبینێ. شێتەکەش کتوپڕ ئەڵێ: بەڵێ ڕاستە، چونکە من هەرچەند تۆ دەبینم، بە چوار پێ ئەتبینم!!

شێتێکی تر بوو لە سلێمانی خاوەنی کۆشێك خێزان و ماڵ و منداڵ بوو، ئینجا ئەگەر ڕۆژێك نەبونی زۆری بۆ بهێنایە، داوای شتێکی لە دەوڵەمەندێ بکردایە و ئەویش هیچی نەدایەتێ، هەر لەبەردەمی دوکانی دەوڵەمەندەکە دائەنیشت تا هەژارێك تێ ئەپەڕی بەبەردەمیا، ئەمجا بۆئەوەی پلارێك بگرێتە دەوڵەمەندەکە، وە جنێوێکی پێ بگەیەنێ خۆی چی پێ بوایە لە پارە ئەیدا بەو سواڵکەرەی کە لەو ساتەدا تێ ئەپەڕی لەوێوە!!

هەر ئەم شێتە جارێك پێی ئەڵێن: تۆ بۆ ناچیتە لای فیسار بەگ تا هەندێ گەنم و جۆت بداتێ، ئەمیش ئەڵێ: من بۆلای کێ بچم؟! ئەو تانجیەکانی خۆی کەڕاویان پێ ئەکات و گۆشتیان پێ پەیدا ئەکات، لەبرساندا سەر بە تەندوری گەرمی نانەواکاندا ئەکەن و کولێرە ئەفڕێنن، ئێستا بەگ هیچ ناکات گەنم و جۆ بە من ئەدات. ئەم بەگە کە ئێوە دەڵێن، ئەگەر وەختی خۆی کوێخای بەهەشت بوایە، بۆچی ئادەمی باپیری سی و دوو ددانەی دەربهاتایە ئەیهێشت مێلاکی ئەو دەنکە گەنمەی بکردایە کە خواردی و لەسەری دەرکرا؟!.

## زیرەکی شێتەکان! ‹ بەسەرهات

- مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە کە ڕۆژێ هارونە ڕەشید لە قەراخ شاری بەغدا بەدوو شێت ئەگات یەکێکیان باڵوڵ و ئەوی تریان شێتێکی هاوڕێی باڵوڵ ئەبێ، هارونە ڕەشید بە باڵوڵ دەڵێ: تۆ بۆچی ناونرایت بە باڵوڵ؟ ئەمیش ئەڵێ ئەی تۆ بۆ ناونرایت بە هاڕوون؟ لەمە هاڕونە ڕەشید تووڕە ئەبێ، دەست ئەکات بە جنێودان بە باڵوڵ. باڵوڵ ڕووئەکاتە هاوڕێکەی خۆی و ئەڵێ: ئێمە کە لە بەغدا دەرچووین دوان بووین، کەچی وابوین بە سێ (واتە: دوو شێت بوین کەچی وابووین بە سێ شێت، چونکە هارونە ڕەشیدیش وەك ئێمە شێتە)..

- جارێکیان پیاوێکی گەورەی دەمڕاستی بە دەسەڵات ئەچێتە تیمارخانەیەك بۆ سەیری ئەو شێتانەی کە لەوێدان، لەناو هەمویاندا کە ئەیاندوێنێ، یەکێکیان زۆر بە ژیر و لەسەرخۆ و قسەخۆش دێتە بەرچاو، ئەمیش ئەو یەکە دەرئەهێنێ لە تیمارخانەکە، وەلەگەڵ خۆی ئەیباتەوە بۆ ماڵی خۆیان، ئێوارێ مێز و مەزە و خواردن و خواردنەوەیان بۆ دائەنێن، کابرا لەگەڵ شێتەکەدا دێتە سەر مێز، وە خاوەن ماڵ دەست ئەکات بە خواردنەوە، تەماشا ئەکا شێتەکە ناخواتەوە، پێی ئەڵێ: بۆ ناخۆیتەوە؟

ئەڵێ تۆ ئەخۆیتەوە بۆ ئەوەی وەك منت لێ بێ، ئەی من بخۆمەوە بۆ ئەوەی وەك كێم لێ بێ؟! كابرای ژیر لەسەر ئەم قسەیە دەست لە خواردنەوە هەڵدەگرێ.

- ژیری شێتان هەموو ئێسكیان سووك و گیانیان پاك و دڵیان ڕووناكە و زمانیان شیرین و قسەیان خۆشە، لەبەرئەوەی كە كەس هیوای ئەم جۆرە قسانەیان لێ ناكەن، بۆیە وا ئێجگار قسەكانیان خۆشە لە گوێچكەدا، بەڵام ژیرەكان چونكە هەمیشە چاوەڕوانی قسەی ژیرانەیان لێ ئەكرێ، ئەگەر قسەكەیان زۆر بەرز و بەنرخ نەبێ، بە شتێكی هیچ و پوچ وەرئەگیرێ..

**پەند و وانەكان لەم بابەتەدا:**

**یەكەم:** قەدر و نرخی عەقڵت بزانە و لەخوا غافڵ مەبە، ئەو عەقڵەی پەروەردگار پێی بەخشیوی لە چاكە و چاكەكاری و ڕزگاركردنی خۆت و كەسانی دەوروبەرت و مرۆڤایەتی بە گشتی لە گێروگرفت و نەهامەتی و پەشیمانی بەكاربهێنە، چونكە كەسانێك هەن عەقڵ و ژیریەكەیان بۆ خەڵەتاندنی خەڵكە بەكاردەهێنن، لەبەرئەوە سوپاسی خوا بكە لەسەر خەڵاتی عەقڵ و لە چاكەدا نەبێ بەكاری مەهێنە. زانایان فەرموویانە: **(العاقِلُ إذا سَكَتَ فَكَرَ، وَ إذا نَطَقَ ذكَرَ، وَ إذا نَظَرَ اعْتَبَرَ)**. مرۆڤی ژیر، ئەو كاتەی كە بێدەنگە بیر دەكاتەوە، ئەو ئەگەر قسەی كرد یادی خوا دەكات و

قسەی سوود بەخش دەکات، وەئەگەر ڕوانیە شتێك، دیمەنێك، ڕووداوێك بیردەکاتەوە و دەرس و عیبرەت و ئامۆژگاری لێ وەردەگرێ.

دووەم: لە کەسی عاقڵ و ژیر نزیکبە لە قسە و گوفتاری و ڕەفتاری سودمەندبە، وتراوە: (خَيْرُ العاقِلِ مَرْجُوٌّ عَلى كُلِّ حالٍ، وَ شَرُّ الجاهِلِ مَخُوف عَلى كُلِّ حالٍ) واتە: خێر و چاکەی کەسی ژیر و عاقڵ لە هەموو کاتێکدا چاوەڕێ کراوە، شەڕ و خراپەی کەسی نەفام و نەزانیش مەترسی هەیە لە هەموو کات و شوێنێکدا، کە بەهۆیەوە خراپەیەك ڕوویدات.

سێهەم: گاڵتە بە هیچ شتێك مەکە، بەداخەوە مامەڵە و هەڵسوکەوتی کۆمەڵگا لەگەڵ شێتەکان باش نیە، گاڵتەیان پێدەکەن، هەندێ کەس بەڵێنیان پێ دەدەن و نایبەنە سەر، هەندێ کەس بۆ کات بەسەربردن شێتەکانیان دەوێت، باشە کێ دەڵێت شێتەکان بەڕاستی نازین و ژیانی شێتەکان لە هی ژیرەکان خۆشتر و ساناتر نیە؟!

بەداخەوە کەسانێك هەن لێناگەڕێن شێتەکان بۆخۆیان چۆنیان پێ خۆشە ئاوا بژین و ئازاری زۆریان دەدەن، شێتەکان لە ژیان تێدەگەن وەك خۆی، وەك خۆشی وەلامی دەدەنەوە.. بەلام ژیرەکان کە هۆشیاریان لەسەر شتێك هەبوو دەیخەنە تەرازووی

بەرژەوەندی خۆیانەوە، ئینجا بیری لێ دەکەنەوە. بەڵێ جاران شێتەکان دەستیان لە خەڵك دەوەشاند، ئێستا بەهۆی پێشکەوتنی تەندروستیەوە ئەو حاڵەتانە نەماون و کۆمەڵگا دەست لەوان دەوەشێنێت، جاران خەڵکی لە دەستی شێتەکان ڕایان دەکرد، ئەمڕۆ بە پێچەوانەی دوێنێوە، شێتەکان لە دەستی کۆمەڵگا هەڵدێن و ئازادیەکانی ئەوانیش پرسیاری زۆری خراوەتە سەر..

**چوارەم:** کە خوا دەرگایەکی داخست، چەندە دەرگای تر دەکاتەوە، شێتەکان خوای گەورە دڵی کەسانێکی بۆ نەرم کردون کە زۆر بە دڵسۆزی خزمەتیان دەکەن و لێیان بێزارنین. وەکو دایك و باوکیان، یان برا و خوشکیان، یاخود لە بازاڕەکاندا هەندێ بازرگان و دوکاندار و کاسپی بۆ دڵ نەرم کردوون کە خواردن و جلوبەرگیان پێشکەش دەکەن و ناهێڵن خەڵکی ئازاریان بدات. ئەمە هەمووی بەخوای گەورە دەکرێت.

## شێتێکی پەککەوتە و دایکێکی دڵسۆز ⟨بەسەرهات⟩

لە گوندێکی ناوچەی جافایەتی، ئافرەتێك کوڕێکی شێتی هەبوو، دوو بە دوو ژیانیان بەسەردەبرد، کوڕەکە کەنەفت و داماوبوو، هەموو کات (فاطمە) خانی دایکی دوعای دەکرد و لەخوا دەپاڕایەوە و دەیگوت: خوایە ئەگەر من مردم، لەدوای من عوسمانی کوڕیشم بمرێ و زەلیل نەبێ، کەس بۆی بەخێوناکرێ..

کوڕە شێتەکەشی بەردەوام دوعای دەکرد و دەیگوت: خوایە دوعاکەی دایکم گیرا بکەی، ئەگەر ئەو مرد، یەکسەر منیش لەدوای ئەو بمرم، دایکم ڕاست دەکات، بەخوا کەس منی پێ بەخێو ناکرێ!!

خوای پەروەردگار دەستی بەڕووی ئەو دایك و کوڕەوە نەنا، تەنها یەك شەو عوسمان لەدوای دایکی ژیا و یەکسەر مرد، فاتمە خان شەو سەعات نۆ مرد و خواحافیزی لە عوسمانی کوڕی کرد، بۆ سبەینێ دوای نوێژی شێوان بەبێ هیچ نەخۆشی و ئازارێك، هەر بە ساغی عوسمانی کوڕی بەلاداهات و مرد.. هەردووکیان نزایان گیرابوو بەئاواتی خۆیان گەشتن. (پایزەبرا ب١، ل٣١).



**پێنجەم:** شێتی ڕاستەقینە، ئەو کەسە نیە کە خەلەلێك لە عەقڵیدا پەیدابووە و جۆرێك لە نەخۆشی عەقڵی هەیە، بەڵکو ئەو کەسە شێتی ڕاستەقینەیە کە لە خوا غافڵە و قیامەتی خۆی سوتاندوە و سورە لەسەر ئەنجامدانی گوناهو بێ شەرعی و شانازی پێوە دەکات و تەوبەناکات و فرمێسکی پەشیمانی هەڵناوەرێنێ لەسەر گوناهەکانی و پێش مردن پەشیمان نابێتەوە و ڕوو لە چاکە ناکات، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانەی بەشێت داناوە کە سورن و بەردەوامن لەسەر بێ شەرعی و گوناه.

(عَنْ أَنَس بن مالِك، قالَ: بَيْنَما رَسُولُ اللهِ ﷺ في أَصْحابِهِ إِذْ مَرَّ بِهِ رَجُلٌ، فَقالَ بَعْضُ القَوْمِ: هذا مَجْنُونٌ، فَقالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ هذا رَجُلٌ مُصابٌ، إِنَّما المَجْنُون المُقيمُ عَلى مَعْصِيَةِ اللهِ - عَزَّ وَجَلَّ -).

واتە: لەو کاتەدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ کۆمەڵێ لە یارانی دانیشتبوو، لەو کاتەدا پیاوێك بەلای پێغەمبەری خوادا ﷺ تێپەڕی، هەندێ لە دانیشتوان وتیان: ئەوە پیاوە شێتەکەیە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەم پیاوە بۆی ڕێکەوتووە، توشی کارەساتێك بوە و بەوهۆیەوە توشی ناتەواوی عەقڵی بووە، بەلاّم شێتی ڕاستەقینە ئەو کەسەیە کەلەسەر گوناهو بێ شەرعی و بێ فەرمانی خوای گەورە بەردەوامە. (رَقائق العريفي، ص١٣).



## دوو فەرموودەی دڵخۆشکەر و موژدەدەری خۆشەویستمان لەسەر ئەم بابەتە:

یەکەم: ئیمامی عەلی - رَضِی اللهُ عَنْهُ - فەرموویەتی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (**رُفِعَ القَلَمُ عَنْ ثَلاثَةٍ، عَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ، وَعَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يَحْتَلِمَ، وَعَنِ المَجْنُونِ حَتَّى يَعْقِلَ**). رَواهُ الترمذي: (١٤٢٣) وقالَ عَنْهُ: حَديثٌ حَسَنٌ غَريبٌ. وَقالَ الألْباني في صَحيح سُنَن ابي داود: (٨٣٣/٣) صَحيحٌ.

واتە: قەڵەم هەڵگیراوە لەسەر سێ کەس (هیچ گوناهیان لەسەر نانوسرێ بۆ قیامەت):

١) نوستوو هەتا بەخەبەر دێ.

٢) منداڵ تا بلوغ دەبێ.

٣) شێت هەتا عەقڵی دێتەوە لای خۆی و چاك دەبێتەوە.

دووەم: عەتای کوڕە ڕەباج، فەرمووی: ئیبنو عەبباس بانگی کردم و پێی وتم: ئایا ئافرەتێکت نیشان نەدەم کە بەهەشتی یە؟! منیش وتم: ئادەی بفەرموو: فەرمووی: ئەم ئافرەتە ڕەش پێستە کاتی خۆی هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و پێی گوت: (**إِنِّي أُصْرَعُ، وَإِنِّي أَتَكَشَّفُ فادْعُ اللهَ تَعالى لي**) عەرزی کرد، قوربان من فێم لێدێ و لەو کاتەدا کە فێیەکە دەمگرێ و ئاگام لەخۆم

نامێنێ جل و بەرگەکەم لەخۆم دەکەمەوە و جەستەم دەردەکەوێ. لەخوای گەورە بۆم بپاڕێوە کە چاکم بکاتەوە.

پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: **(إنْ شِئْتِ صَبَرْتِ وَلَكِ الجَنَّةُ، وَ إِنْ شِئْتِ دَعَوْتُ اللهَ تَعالى أَنْ يُعافيكِ)** فەرمووی: ئەگەر حەزدەکەی ئارام بگرە و بەهەشت جێگەت بێ، ئەگەر حەزیش دەکەی لەخوای گەورە بۆت دەپاڕێمەوە کە چاکت بکاتەوە، ئافرەتەکەش وتی: **(إِنِّي أَتَكَشَّفُ، فَادْعُ اللهَ أَنْ لا أَتَكَشَّفَ، فَدَعا لَها)**. واتە: باشە ئارام دەگرم، بەڵام لەخودا بۆم بپاڕێوە کە لەشم دەرنەکەوێ، پێغەمبەری خواش ﷺ بۆی پاڕایەوە کە ئیتر لە کاتی لێهاتنی فێیەکەدا جەستەی دەرنەکەوێ. (متفق عليه، رَواهُ البُخاريُّ: (٥٦٥٢) وَ مُسْلِم: (٦٥٧١) وَ أَحْمَد: (٣٢٤٠).)

لەم فەرموودەیەدا موژدە بۆ ئەو کەسانە هەیە، کە نەخۆشی فێ لێهاتنیان هەیە، کەبە ویستی خوا پاداشتی گەلێك گەورەیان لەلای خوای گەورە لە بەهەشتدا بۆ هەیە.

وە ئەو کەسانەی ئەم جۆرە کەسانەیان لەماڵدا هەیە (شێت، یان فێ لێهاتوو) دەبێ زۆر ئاگاداریان بن، حورمەتیان بگرن، دوعای خێریان بۆ بکەن. وەهەروەها لە ڕێگەی زانستی پزیشکی نوێ و دەرونزانیەوە و دکتۆری دەرونیەوە، هەوڵی چارەسەرکردنیان بدەن و کەمتەرخەمی نەکەن لە ئاستیاندا و وەکو هەر نەخۆشێکی تر تەماشایان بکەن.

**لەکۆتایدا:** لە خوا غافڵ مەبە و سوپاسی خوای گەورە بکە لەسەر خەڵاتی عەقڵ و ژیری، وە هەمیشە زیکر و یادی خوا بکە، بە تایبەتی زیکری بەیانیان و ئێواران، وە هەروەها **(آية الكُرْسي)** بخوێنە لە هەموو شەوێکدا، چونکە هەرکەسێ **(آية الكُرْسي)** بخوێنێ لەکاتی خەوتندا، ئەوا لەلایەن خواوە دەپارێزرێ و هیچ شەیاطینێك ناتوانێ لێی نزیك ببێتەوە هەتا بەیانی. وە هەموو بەیانی و ئێواران سورەتی **(الفلق، النّاس، الأخْلاص)** بخوێنە خوای گەورە دەتپارێزێ.

خوای گەورە پشت و پەنا و پارێزەری هەموو موسڵمانان بێت، آمین.

